# گیتی زیندەوەر

- گیانلە بەران
- دارو درەخت
- گژ و گیا
- بارساییەکان (ئەجرام)ی سروشتی و کانەکان (مەعادین)
- ئەستێرەکان

**قازانج و سوود و زیانی هەر یەک لەمانە**



دانانی:
مامۆستا عەلائەددین سەججادی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | گیتی زیندەوەر: کتێبیکە دنیایەکی سەربەخوی لەبارەی گیانلەبەران،.../ دانراوەی عەلائەددینی سەجادی. |
| مشخصات نشر | | سنندج : انتشارات کردستان ، ۱۳۹۷. |
| مشخصات ظاهری | | ۲۵۴ ص.؛ |
| شابک | | ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۳۲۵-۸: |
| وضعیت فهرست نویسی | | فیپا |
| یادداشت | | کردی. |
| موضوع | | گیاهان -- دایرەالمعارف‌ها |
| موضوع | : | Plants -- Encyclopedias |
| موضوع | : | حیوان‌ها -- دایرەالمعارف‌ها |
| موضوع | : | Animals -- Encyclopedias |
| رده بندی کنگره | : | QK۷/س۳گ۹ ۱۳۹۷ |
| رده بندی دیویی | : | ۵۸۰/۳ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۴۸۵۴۴۰۴ |

زانا دانایە، دانا توانایە

# گێتیی زیندەوەر

«کتێبێکە دنیایەکی سەربەخۆی گرتووە، لە بارەی گیانلەبەران، دار و درەخت، گژوگیا، ئەستێرە و با، کان و دەلیا، کوچك و نرخیا.
لە بارەی چاکە و زیانیانەوە، کەڵك و نرخیانەوە، هۆش و بیریانەوە، چۆنیەتی و ژینیانەوە.
ئەو شتانە تیایانا هەن، ئەو بەرهەمانە کە ئەیدەن، ئەو کارانە کە ئەیکەن،
ئەو سروشتانە کە هەر هەن»

دانراوی:
**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**

انتشارات کردستان
سنه

# گێتیی زیندەوەر


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | گێتیی زیندەوەر |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | ماموستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پیاچوونەوە (تصحیح): | رئوف محمودی ـ عبدالله فاتحی‌کرجو ـ ناصح فتاحی |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ۱۳۹۷ ـ ۲۰۱۸ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۵۰۰ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەرە و قەوارە (تعداد صفحات): | ۲۹٦ لاپەرە (صفحەی وزیری) |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابك: | ۸ ـ ۳۲۵ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ ـ ۹۷۸ |

✓ نرخ (قیمت): ۵،۰۰۰ دینار

سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزّتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن: ۰۸۷۳۳۱٦۵۳۸۲

سنە ـ پاسازی عیززەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون: ۳۳۱٦۵۳۸۲ ۸۷ ۹۸+

بەناوی خودا

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا عەلائەددین سەججادی «ئازدار سەججادی، دانش سەججادی»
ئیجازەمان داوەتە «ئینتیشاراتی کوردستان لە شاری سنە» هەموو بەرهەمەکانی باوکمان «مامۆستا
عەلائەددین سەججادی» چاپ و بڵاو بکەنەوە.
جگە لەوان هیچ‌کەس و لایەنێکی‌تر حەقی چاپکردنیان نییە!

ئازدار علاءالدین سجادی
8-12-2016

دانش علاءالدین سجادی
8-12-2016

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا علاءالدین
سجادی مافی لە چاپدانی سەرجەم بەرهەمی
باوکمان داوەتە ئینتشاراتی کوردستان
لە شاری سنە وە هیچ کەسی و لایەنێکی تر
بۆی نییە چاپیان بکات جگە لەم دەزگایە
وە مافی لە چاپدانەوەی
پارێزراوە بۆ بنەماڵەی
مامۆستا علاءالدین سجادی

دانش علاءالدین سجادی
٢٠١٦/١٢/٢٩

# پێرست

## ✓ دار و درەخت ١٧٣

# پێشەکی

ئاورێکی بە دڵ بەرەوە بۆ ڕۆژانی ڕابوردوو؛ نە وەك بۆ تەنها لاپەڕەی ڕۆژانی ڕابوردووی خۆت، وە یا هی باو و باپیرانی نزیکی خۆت، بەڵکوو بۆ ئەو ڕۆژە کە ئادەمیزادە کۆنەکان، وەیا بە گوزارشتێکیتر باو و باپیرە هەرە کۆن و پێشینەکانی خۆت و ئەو ئادەمیزادانە کە ئێستە هاوچەرخی خۆت و نزیکی ڕابوردوانی خۆتن کە چۆن ئا ئەو هەرە کۆنانە بە سادەیی ڕایان‌بواردووە؟ و چۆن نە لە ژێر دەواراو نە لە پەنای دیوارا ڕایانبواردووە، بەڵکوو شوێنی ستاریان لە گۆشەی مەغارو لە سێبەری دارا بووە!. بەرەبەرە ئا ئەو ژیانە ساویلکەیەیان گۆڕیوەتەوە بە ژیانێکی چکێ لەپێشتر لەو ژیانە. ئەم یاسای گۆڕانە، وە یا ئەم چەرخی دەورانە هیچ لە گێج نەوەستاوەتەوە، هەندێ جار بە تیژی و هەندێ جار بە نەرمی، وە یا بە توندی و بە سستی هاتووەو سووڕاوەتەوە تا سەرە گەیشتۆتە سەر ئێمەو سەر ڕووپەڕەی ئەم چەرخی ئێمە. لەم چەرخەدا بیری تیژی ئادەمیزاد بە خۆی و بە لەشەکەیەوە خەریکە ئەفرێ بۆ ئەو شوێنە دوورانەی مەڵبەندی باو و باپیری، بۆ ئەو شوێنانە کە لە پێشێکی زۆر پێشا ناوەکانی دۆزیوەتەوەو ئێستە ئەیەوێ بزانێ چ ناوکێك لەو ناوانەدا هەیە! ئەو شوێنەش بارساییە «بوێش - کەون»یەکانی مانگ و ئەناهید - زوهرە و بارام - مەریخ و تیر - عوتاردە!...

تۆ بڵێیت ئادەمیزاد لە پێش ئەم ڕۆژەدا لە ڕۆژانی ڕابوردوویا دیسان بووبێت بیری لە شتی وا و بیری لە چوونی بۆ شتی وا کردبێتەوە؟... دوور نییە بووبێت بەڵام بوونیەکی کۆن و بوێشێکی فرە دوورە، ئێمە لەبەر ئەوە کوڕی ئیمرڕۆژین لامان وایە ئەمانە تازەن، وا مەزانە تازەن، تازە لە کەونی چەرخی ئێمەدا نییە ئێمە هەموو شوێن پێ‌هەڵگرین، جا بڕوا ئەکەی یا نایکەی من بە تۆو تۆ بەخوا...

ئایا لە بەینی دوو لاپەڕەی ئەم ژیانە پان و فراوانەی بویشەدا چۆن ئادەمیزاد لە دەوری سەرەتاییەوە کەوتە ئەم دەورە کەوا بەم جۆرە پەنجە لە پەنجەی مانگ بدا؟... چۆن کەوتە سەر ئەوە کە سەربەرێتە ناو کۆڕی نهێنیەکانی پەرجۆ - موعجزەی کەونی و ئەم فەلسەفە شاراوانەی کە لە لەشی گیانلەبەرو هەست دارو بێ‌گیان و بێ‌هەستێکی کەونەکەدایە؟

هەمووی بە وردبوونەوە و بەتاقی‌کردنەوەی ئەو شتانە کە جاری یەکەم بە ناکاویی تووشی ئەبوو جاری دووەم بە تاقی‌کردنەوە. کە وابوو تاقی‌کردنەوەیە کە پایەی ئادەمیزادی لەباری نەزانینی ڕواڵەتیەوە گەیاندۆتە ئەو پایەیە کە پەنجە لە پەنجەی هەموو شتێکی گران و قورس بدا، تاقی‌کردنەوەیە کە نهێنیەکانی لەشی گیانلەبەر و دار و دەوەن بزانێ و لێی تێ‌بگا کە بەری ئەمانە چییەو چ فەلسەفەیەکە لەم گێتی پاژی و هاماویەدا هەیە..

جا ئەم تاقی‌کردنەوەیە کە هەموو ئادەمیزادی پێ گەیاند، بەرە بەرە ئادەمیزادەکەی خستە سەر باری نەتەوایەتی و نەتەوایەتیی تیا پەیدا بوو هەر نەتەوەیەك بە ئەندازەی دەسەڵاتداریی تێگەیشتووی خۆی پەلاماری دا. من لام وایە نەتەوەی کوردیش بێ‌بەش نەبووە لەو بەهرەیە، بەڵام نەخراوەتە سەر قاقەز. ئەوا ئەمجارە من بە ئەندازەی دەسەڵات کەوتمە سەر ئەو بیرە کە پەیڕەوی‌کردنی نەتەوەی کوردیش بۆ ئەو تاقی‌کردنەوەیە بکەم بە شتێکی دیاری و پیشانی خودی نەتەوەکەو نەتەوەکانی‌تری بدەم بۆ ئەوە تێ بگەین کە نەتەوەی کوردیش لەو مەیدانەدا بە چالاکانە توانیویەتی تا ئەندازەیەك هەنگاو باوێژێ و بکەوێتە ناو کۆڕی ئەو نەتەوانەوە کە ئەوانیش هەر لەم جۆرە مەیدانانەدا ئەسپی خۆیانیان تاو داوە، بەو بۆنەوە ئەم شتانەی کە لە بیری کوردی هەڵێنجراون... وەیا دوور نییە هەندێکی بیری نەتەوەیەکی‌تر بێت وەری گرتبێ من خستمە سەر لاپەڕەی کاغەزو پێشکەشم کرد.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم جۆرە شتانە وەکوو تیشکی ڕۆژ وانە، چۆن تیشکی ڕۆژ لە کەس ناگیرێ، ئەمانەش ڕێگایان لە کەس ناگیرێ و نەگیراوە، مەبەست ئەوەیە دوور نییە بوترێ هەندێ لەم شتانە خۆ لە نووسراوی نەتەوەکانی‌ترا هەیە کەواتە هی ئەوانە!...

من دان بەمەدا نانێم، هەر ئەوەندە دانی پیا ئەنێم کە نەتەوەکانی‌تر زۆرتر دەستیان

قەڵەمی گرتووە بۆ بووژاندنەوەی زمانەکەی خۆیان و زۆرتر و زووتر شتەکانی خۆیانیان کۆ کردۆتەوە، نەتەوەی کورد لەو ڕووەوە بەڵێ پاش ئەوان کەوتووە، بەڵام لە ئەسڵی بیرا پاش نەکەوتووە، بەڵکوو بیری لەگەڵ چەرخا شان بەشان هاتۆتە خوارەوەو لە هەر ڕۆژێکا پاشەڕۆکێکی هێشتۆتەوە، کە ئەمانە هەموو ئەبن بە بەڵگە بۆ ئێمەو بۆ نەتەوەی ئێمە...

ئەوا منیش لەسەر ئەو هەستە ئەو شتانە کە کورد بەتاقیکردنەوە دەمی بۆ بردووە ئەوی دەستم کەوت خستمە سەر کاغەز بۆ ئەوە لەو ڕەوڕەوەیە دوا نەکەوین. وە لە شێوەی دانانەکەشیا شێوەی پیتە ئەبجەدیەکانم گرتووە نە وەك چەشنی شتەکە، ئەمەش بۆ ئەوە ئەگەر یەکێ شتێکی بوێ زوو بۆی بدۆزرێتەوە... کەوا بوو پێش هەموو شتێك ئادەمیزاد.

**عەلائەددین سەجادی**

◈◈◈



## ئادەمیزاد

ئادەمیزاد دەستەگوڵێکی بچووکە لەم کەونە وەیا خۆی سەربەخۆ گێتیـە گەورەکەیەو بچـووك کراوەتەوە، جارێ جگە لەو شتانە کە تێیدایە خۆی شتێکە لە دوو ڕەگەزی نەفس و لەش و شێلراون بەسەر یەکا، وا دیارە لە هەموو گیانلەبەرێـك پایەبەرزتـر و پاکژی هەموو ئەم کەونەیە، چ لە سەروفەسالا، چ لە ڕۆح و گیانا، چ لەتەن و لەشا، بـە ئاشکراو بەنهێنی قسـەو ژیـری هەر تایبەتیـە بەووە.

لە ڕواڵەتا هەستـە ڕواڵەتییەکان جوانییەکی داوەتێ، بە هەستـە پۆشراوەکان دنیایەکی بەرزی بۆ خۆی گرتووە، بۆ نەفسە ناتقەکەی دەماغ و مێشکێك دانراوە کە بەهۆی فیکر و یادو لەبەرکردنی شت بووە بە پادشای هەموو گیانلەبەرێك، جەواهیرێکی عەقلی دراوەتێ بۆ ئەوە نەفسـە ناتقەکە لەو شـوێنەدا شـوێنی پادشاهی هەبێ لەقاڵبی لەشـەکەدا، ئەم پادشایە وەزیـرەکەی عەقڵ بێ، هێزەکان سـەربازی بن، هەستی موشتەرەك چەپەر بێ، ئەندامەکانی پێشـخزمەت بن، لەشـەکە بارەگای ئەو پادشـا بە دەسەڵاتە بێ. هەستەکان ئەکەونە گەڕان و ئەفڕن لە هەر کاتێکا کە بیانەوێ ئەڕۆن دەنگ و باسی چاك و خراپ وەرئەگرن و ئەیهێنن و پیشـانی هەستی موشتەرەکی ئەدەن، کە ئەو هەستە واسیتەیەکە لە بەینی نەفسە ناتقەکە و هەستەکانیترا و شوێنی هەستە موشترەکەکەش وەکوو لەبەر دەروازەی شـارەکەدابێ، ئەو پیشـانی پادشای عەقڵی ئەدا بۆ ئەوە چاکەکەی هەڵبگرێ و خراپەکەی بگێڕێتەوە. کەوا بوو لەم ڕووەوە ئادەمیزاد بوو بە گێتییەکی بچووك کە هەموو کاروباری فەرمانداری تێدا هەبوو!...

ئەمجا لـەو ڕووەوە کـە ئـەم ئادەمیـزادە شت ئەخـواو گەشـە ئـەکا بوو بـە ڕووەك، لەو ڕووەوە کە هەستی هەیەو ئەجووڵێ بوو بە گیانلەبەر، لەو ڕووەوە کە هەسـت بە ڕاسـتی و حەقیقەتـی شـت ئـەکا بـوو بـە فریشـتە. وە بـوو بە شـتێك کە ئـەم هەمـوو مەعانیانەی تیـادا کۆببێتـەوە، ئەگـەر ئـەم مەعانیانـەی لەچاکـەدا بـەکار هێنـا ئەبـێ بـە ئادەمیزادێك کـە دنیای بەچاکـەو فەزیلـە کـرد بـە شـەمامەیەك و گرتـی بە دەستەوەو بـە هەموو جۆر

هەڵیئەسووڕێنێ و بۆنی ئەکا، خۆ ئەگەر لە خراپەدا بەکاری هێنان و لە شوێنی خۆیانا دایانی نەنان ئەوە ئەبێ بە ترۆمی حەیوانەکانیتر یا تووڕەو بەدفەساڵ ئەبێ وەکوو درندەی لێ دێ، یا بخۆرو بێ ئامانج ئەبێ وەکوو گای لێ دێ، یا هیچ ئارەزوویەکی نییە غەیری خواردن نەبێ وەکوو بەرازی لێ دێت، یا کردەوەی هەر پاڕانەوەو لانگری ئەبێ وەکوو سەگی لێ دێت، یا قیناوی و شت لە دڵ دەرنەچوو ئەبێ وەکوو حوشتری لێ دێت. یا بە فیزو لووت بەرز ئەبێ وەکوو پڵنگی لێ دێت، یا فێڵبازو تەڵەکەباز ئەبێ وەکوو ڕێوی لێ دێت، یا ئەمانەی هەموو تیا کۆ ئەبێتەوە ئەوە ئەبێ بە شەیتانێك کە هەزار شەیتانی ڕاستەقینە ئەخاتە چاکی داوێنی!

ئەگەر خۆ ئەم ئادەمیزادە کردو کۆشەکەی هەموو خستە سەر کاروباری مەعنەوی و ڕۆحیات ئەوا ئەو وەختە لەپایەی فریشتەشی وەرگرت و ئیتر ڕازی نابێ بەم عالەمی مادەیە. کەوا بوو ڕاست بوو ئادەمیزاد کەونێکی بچووکە و هەموو شت بوو.

ئادەمیزاد بەم جۆرە بوو بە شاپەڕی عالەمی مادی و مەعنەوی ئەمجا بێجگە لەمانەش هەندێ شتیتر هەیە کە بە تەواوی تایبەتین بە ئادەمیزادەوەو لە گیانلەبەرێکیترا نین، وە ئێمە بە بێئەوە بیریشیان لێی بکەینەوە ئەیانبینین. وەکوو:

قسەکردن، کە ئەم قسەیە هەر تایبەتییە بە ئینسانەوە، ئەم قسەیە هێزێکە لە ئادەمیزادا هەیە، ئەم هێزەیە کە ئەکاتە کارێ یەکێکیتر لێ تێ ئەگا هەر لە هاوترۆمەکانی خۆی، ئەم هێزە ئەکاتە کارێ کە درکە و هێما پەیدا ئەکا، بەڵام خودی قسەکە لە هەموویان بەهێزترە.

یەکێکیتر ئەوەیە کە ئینسان مووی تەواو هەر لە سەری ئەڕوێت، بە پێچەوانەی گیانداریتر، لە گیاندارەکانیترا موو وە یا پەڕ بۆیان بووە بەوە کە لە هەموو لەشیانا ببێت و بیانپارێزێ لە گەرما و سەرما، بەڵام ئادەمیزاد ئەو هۆی پاراستنەی جیایە لە لەشەکەی، ئەو مووە کە هەیە هەر لەسەریەوەیە بۆ جوانی و دیمەنێك، ئەمەو دیسان ئەگەر لەشی ئادەمیزاد هەموو تووك بوایە نە ئەم جوانیەی ئەبوو کە ئێستە هەیەتی وە نە هێزی دەست لێدانی ئەبوو، واتە ئەگەر لەشی بکەوتایە لە شتێك نەیئەزانی ساردە یا گەرم، زبرە یا نەرم.

یەکێکیتر پیری و دەرکەوتنەکەی بە هۆی سپی بوونی مووەوە، ئەمە بەم جۆرە لە غەیری ئادەمیزادا نییە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەم لەچاو گیانلەبەرانیترا

گەرمایيەکەی کەمترەو ڕتووبەتەکەی زیاتر، سپی بوونی مووش لەبەر بەڵغەمێکی بۆگەن و کەمبوونەوەی هورمۆناتە، ئەمەش لەکاتێکا ئەبێ کە تەبێعەتەکە مەیل بکا بەلای ڕتووبەتەوە و گەرمایيەکە کەم ببێتەوەو تەوازنەکە نەمێنێ، لە دەمە دەمی پیریدا ئەم کردەوەیە ڕوو ئەدا موو ڕووەو سپیبوون ئەڕوا. گیانلەبەریتر وا نییە.

یەکێکیتر ئەوەیە لە کاتێکا شوێنێکی ئینسان ئازارێکی هەبوو، وەیا لێی درا وەیا شتێکی ژانهێنەری لێ کەوت ئەم بە بەرەلەپی شوێنەکە ئەگرێ خێرا هەست ئەکا ئازارەکەی کەم ئەبێتەوە، گیانداریتر وا نییە.

یەکێکیتر ئەوەیە کە هەندێ نەخۆشی هەیە لە ناو ئادەمیزادا زووتر تەشەنە ئەکاو لەمەوە ئەچێ بۆ ئەو، وەکوو ئەوە کە ئەڵێین ئەگەر یەکێ چاوی گڵی ئەکرد یەکێکیتر زۆر سەیری بکا چاوی ئەمیش دێتە گل وەیا ئەگەر یەکێ لەگەڵ گول وەیا بەڵەکیدار وەیا گەڕ هەڵسوکەوت بکا ئەمیش وەکوو ئەوانی لێ دێ...

یەکێکیتر ئەوەیە کە یەکێ بەڵەکی هەبوو بە پێی پێخاوس بەسەر ئەرزا بڕوا شوێنی پێی یەکەی گیای لێ ناڕوێ، بەپێچەوانەی گیانلەبەریتر کە ئەوان وانین.

یەکێکیتر ئەوەیە کە ئادەمیزاد ئەگەر خەسێنرا لەشی بێهێز ئەبێ بەپێچەوانەی حەیواناتیتر ئەوان بەهێز ئەبن. ئەم بۆندڕن پەیدا ئەکا، بیرو باوەڕی تێك ئەچێ، زۆر خۆر ئەبێ، ئێسقانەکانی درێژ ئەبن، پەنجەکانی ئەو ڕاستیەیان نامێنێ، ئارەزووی پەڕین زۆر ئەکا، زۆر شەیتانی ئەبێ، تەمەنی درێژ ئەبێ، مووی لەشی کەم ئەبێتەوە، دەنگی تیژو باریك ئەبێ، زوو تووڕەو زووش هێمن ئەبێتەوە، جیقڵدانەی تەنگ ئەبێتەوە هەر نهێنیەکی لا بوترێ خێرا ئاشکرای ئەکا، لەو وڵاتانەدا کە ئەوی تێدایە ئەگەر یاری شەترنج باوی هەبوو ئەو لە هەموو کەس زیاتر حەزی لێ ئەکا، چاوی تیژ ئەبێ...

یەکێکیتر ئەوەیە کە ئەگەر ئادەمیزادێك کوێر بوو زۆر حەز لە پەڕین ئەکاو زۆر شەهوانی ئەبێ، لەگەڵ خەسێنراوەکەدا جیاییان ئەوەیە ئەویش حەز ئەکا لە پەڕین، بەڵام پێی ناکرێ، ئەم وانییە، ئەو چاوی تیژە ئەم ڕووناکی چاوی نییە، بێ چاو ئەگەر هێزی پەڕینیشی تێدا نەبێ تێگەیشتن و زەینی شت لەبەرکردنی زۆر ئەبێ.

یەکێکیتر ئەوەیە کە لە ئادەمیزادا ئافرەت لەکاتی حەیزا ئەگەر دنیا هەور بوو ئەو ناوکی

دەرخاو پیشانی هەورەکەی بدا هەورەکە ئەڕەوێتەوە، هەر ئەم ئافرەتی حەیزدارە ئەگەر لە شوێنێکا زۆر سارد بوو، ساردێکی وا لەوانە بوو ئینسان سەرما ڕەقی کاتەوە ئەو ئەگەر لەو شوێنەدا بەسەر عەرزەکەدا ڕاکشێ سەرماکە کاری تێ ناکاو ڕەقی ناباتەوە، ئەگەر لەو کاتی حەیزەدا نزیکی باخ و بێستان بکەوێتەوە بەری ئەو باخ و بێستانە زیان دێنێ، ئەگەر بەناو بێستانی خەیارا تێ پەڕێ خەیارەکان هەموو تاڵ ئەبن، ئەگەر سەیری ئاوێنە بکا ئاوێنەکە لێڵ ئەبێ، ئەگەر پیاو لەو سەردەمەدا بچێتە لای پیاوەکە گێل گەوج ئەبێ لە جوانی و گورج و گۆڵی کەم ئەبێتەوە، وەیا ئەگەر یەکێ فێدار بوو ئەم دەستی پیا بهێنێ هۆشی دێتەوە بە بەرخۆیا، وەیا ئەگەر دەست بدا بە کاژی مارەوە ماری خاوەنی ئەو کاژە ئەتۆپێ، وەیا ئەگەر شوانی مەڕ بێ گورگ توخنی ئەو ڕانە ناکەوێ، بەڵکوو ئەگەر نزیکی بکەوێتەوە سکی دێتە ژان، وەیا ئەگەر پەڕوە بێنوێژەکەی بکرێ بە دوای کەشتیدا ئەو کەشتیە ئەمین ئەبێ لەبای پێچەوانە. جا ئەم شتانە لە ئادەمیزادا نەبێ لە گیانلەبەری‌ترا نییە، هەرچەند لەم بەشەیانا ڕەنگبێ تۆ زۆریان بە ئەفسانە بزانیت بەڵام تاقیکردنەوە گەورەترین بەڵگەیە.

یەکێکی‌تر ئەوەیە ئەگەر یەکێ سێبەرۆی هەبوو کراسی ئەو ئافرەتە کە ژان ئەیگرێ پێش ئەوە بشۆررێ لەبەری کا سێبەرۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

جا ئەم جۆرە شتانە تا ئەم شوێنە کە باسکران شتێکن بە تەواوی تایبەتین بە ئادەمیزادەوەو لە غەیری ئەوا نین بێجگە لە کاروباری ژیری و ڕۆحیەکە هەر بەم شتانە گێتیەکی‌تر لە گێتی ئادەمیزادا دروست بوو ئەمجا ماوەتەوە سەر ئەوە بزانین ئەم ئینسانە کە ئەم دنیایە بوو، وە ئەم ئینسانە کە مادەکەی برێتی بوو لەو گۆشت و خوێن و ئێسك و دەمارە پاژی ئەم عالەمی مادیەی ئایا کەڵکی تێدا هەیە یا نەء؟

بەو بۆنەوە قسە لەو وردە شتانەشەوە ئەکەین و بە ئەندازەی دەسەڵات چ چاکە و خراپە و قازانج و زیانێکیان تێدا هەن دەریان ئەبڕین و وەکوو تاقی‌کردنەوەو زانایان وتوویانەو ئەڵێین:

ئەو ئێسقانانەی کە لە لەشی ئینسانا هەن «٢١٤» ئێسکن، ئەمە بێجگە لەو ئێسکە کە لە دڵدایە وە بێجگە لەو ئێسقانانەش کە جومگەکانی پێ پڕ کراونەتەوە ئەوانە زۆرن.

هەر ئادەمیزادێك دوانزە کونی تێدایە، دوو چاو، دوو گوێ، دوو کونە لووت، دەم، دوو

گۆی مەمك، [کونی ناوك]، کونی بەرو دوا. ئەمە بێجگە لەو کونە هەرە وردانە کە پێیان ئەڵێن «مسام» ئەوانە لە ژمارە نایەن.

✓ ئەڵێین: ئەگەر ئافرەتێك سكی پڕ بوو وە منالەکەی بە زەحمەت لێ ئەبووەوە «موو»ی ئادەمیزاد بسووتێنن و لەگەڵ گوڵاودا تێکڵاوی کەن و لەسەر سەری دانێن زوو منالەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر «ئاو – مەنی»ی ئادەمیزاد لە ناو ماڵا دابنرێ هەچ کێچێ لەو ماڵەدا هەبێ لەو ئاوە کۆ ئەبێتەوە...

✓ ئەگەر یەکێ تووشی «بەڵەکی» بوو بە «ئاو - مەنی» ئادەمیزاد خۆی بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ تفی بەنیئادەم مار ئەکوژێ... ئەگەر یەکێ نەوشاتر بخاتە دەمی تا ئەتوێتەوە، ئەو تفەی کە بە نەوشاترەکەوەیە بیکاتە دەمی مار ئەیتۆپێنێ.

✓ ئەگەر هەر کاتێ بایەکی زۆر تیژی هات چرایەك لە ڕۆنی بەنیئادەم دابگیرسێنرێ بایەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر مووی ئافرەت بە درێژی بخرێتە ناو دەریاوە ئەبێ بەماری ئاوی.

✓ ئەگەر منالی شیرەخۆر چاوی شین و کاڵ بوو چل ڕۆژ شیری ئافرەتی ڕەش بخوا چاوی ڕەش ئەبێ.

✓ میزی منال لەگەڵ خۆڵەمێشی مێوەژڵ تێکڵاو بکرێ و بخرێتە سەر برین چاك ئەبێتەوە.

✓ زراوی ئادەمیزاد زەهرە.

✓ منال کە ناوکەکەی ئەخا، ئافرەتێ کە ژان لە دەستیا هەبێ ئەو ناوکە ببەستێ بە دەستییەوە چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی سپی هەڵگەڕابوو، ئەو کرمەی کە لە ئینسان دەرئەچێ بێنێ وشکی کاتەوەو بیهاڕێتەوەو بیهێنێ بە چاویا سپی بوونەکەی لائەچێ و چاك ئەبێتەوە.

✓ گووی ئادەمیزاد وشك بکرێتەوەو بهاڕێتەوە و لە کەتان بدرێ، پاشان لەگەڵ سرکەو هەنگوویندا بشێلرێ تا ئەبێ بە ماجوون، ئەمە بنرێ لە برینی خۆرە چاکی ئەکاتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ سەگ گرتی، مووی بەنیئادەم بکرێ بە سرکەدا و بنرێتە سەر جێگە دەمەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ پەڕۆی حەیزی ئافرەت به دوای کەشتیدا هەڵبواسرێ نەبا ئەچێتە ناو ئەو کەشتیە نە شەپۆلی ئاو.

✓ ئەو منالەی کە لەکاتی پەیدابوونیا گوو ئەکا، ئەو گووەی وشك بکرێتەوەو بهاڕڕێتەوە، ئەو کەسەی کە چاوی سپی بووە بیهێنێ بە چاویا چاك ئەبێتەوە.

✓ منالْ کە خەتەنە ئەکرێ ئەو زیادە گۆشتە کە لە کێری ئەکرێتەوە، وشك بکرێتەوە، لەگەڵ میسك و گوڵاودا تێکڵاو بکرێ، ئەو کەسەی بەڵەکی وەیا گولی هەیە بیخواتەوە نایەڵێ دەردەکەی زیاد بکا.

✓ پیسایی ئادەمیزاد هەر بەو گەرمیە لەگەڵ شەرابی کۆن‌دا تێکڵاو بکرێ بدرێ بە حەیوانی نەخۆش چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر چڵکی دەست و پێی ئادەمیزاد بە ئاو بشۆررێ و ئەو ئاوە بدرێ بەو کەسە کە خزمەتکارو دەست و پێوەندی هەیە، لەپاش ئەوە کە خواردیەوە دەست و پێوەندەکەی ئیتر زۆر خۆشیان ئەوێ.

✓ ئەگەر بتەوێ یەکێ زۆر خۆشتی بوێ، گیرفانی کراسەکەت بشۆ ئەو ئاوە بدە بەو کەسە بیخواتەوە بەڵام پێی نەزانێ ئیتر زۆر زۆر خۆشتی ئەوێ.

✓ ئەگەر بتەوێ ئافرەتێك غەیری تۆ کەسی‌تر نەچێتە لای و بە کەس ڕازی نەبێ، کاتێ ئەو ئافرەتە سەری شانە ئەکا مووی لێ ئەکەوێ، ئەو مووە کۆکەرەوەو بیسووتێنە، خۆڵەمیشەکەی بێنە، پێش ئەوە کە گانی لەگەڵ بکەی بیدە لە سەری کابراکەت و ئەمجا بچۆرە لای، پاش ئەوە ئیتر نە ئەو بە کەس ڕازی ئەبێ وە نەکەسیش ئیشی وا بە لەزەتی لەگەڵ ئەکا.

✓ چاوێ کە ئاوسابوو وەیا سوور بوو بوو میزی منالْ بکرێتە ناو شتێك و بخرێتە سەر ئاگر تا چاك گەرم ئەبێ، ئەمجا تۆزێ خوری بکرێ بەو میزەداو چاوەکەی پێ بماڵن چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەو کچەی کە یەکەم جار حەیزی پیا دێت، ئەو خوێنەی بدرێ لەسەر مەمکی هەر کچێك، ئەو مەمکانە ئیتر هەر قوت ئەبێ و ناشکێنەوە.

✓ ئەگەر ژنێ بیەوێ شیری زۆر بێت کاڵەکە مارانە بێنێ بیکوتێ و پاشان لەگەڵ

ڕۆنی زەیتووندا تێکڵاوی کا، ئەمجا تۆزێ خوری بێنێ بیکا بەسەر چیلکەیەکەوەو بیژەنی پیایاو بیدا لەسەر گۆی مەمکی ئیتر شیری زۆر ئەبێ.

✓ ئافرەت لەکاتی دروست بوون لەگەڵ مێردەکەیا سەیری وێنەیەکی جوان بکا، مناڵەکەی لەسەر ئەو وێنە جوانە دەر ئەچێ.

✓ ددانی مردوو هەڵبواسرێ بە یەکێکا کە دانی ژان بکا، ژانی دانەکەی ئەشکێ.

✓ تفی ئینسان بدرێ لە شوێن دەمی مێش و مێشوولەو ئەو جۆرە شتانە کە ئینسان ئەگەزن باشەو ژانی نامێنێ.

✓ ئینسان بەیانیان پێش ئەوەی کە هیچ بخوا، تفی ئەو وەختەی بدا لە بالووك ئەو بالووکە چاك ئەبێتەوە.

✓ کرمی ناو سکی ئینسان بەدەم ڕشانەوەوە لە دەمەوە دێتە دەرەوە، پێش ئەوە بکەوێتە سەر زەوی بیگرن و وشکی بکەنەوەو بیهاڕنەوە و پاشان بیپرژێنن بە تیراوییەوە چاکی ئەکاتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ بەرد لە میزڵدانیا هەبوو، شیری ئافرەت لەگەڵ هەنگوین تێکڵاو بکاو بیخوا بەردەکە لەناو ئەدا.

✓ یەکێ سەگی هار بیگرێ، میزی ئینسان بدرێ لەجێ دەمەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەو نینۆکەی کە ئینسان ئەیکا، ئەگەر بیسووتێنێ و بیدا بەهەر کەس زۆر زۆر خۆشی ئەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ مار وەیا دوو پشك وەیا خاوەن زەهرێکیتر پێوە بدا میزی ئینسان بخواتەوە زەهرەکە کاری تێ ناکا.

✓ شوێنێك کە برینداربوو خوێنەکەی هەر نەئەوەستایەوە، میزی ئینسانی پیا بکرێ خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.

✓ یەکی ئەگەر کرم وەیا هەزارپێ چووە گوێچکەیەوە، لیکی ئینسانی ڕۆژووەوانی تێ بکرێ کرمەکە دێتە دەرەوە.

✓ ئەگەر ئافرەت مووی ئینسان بسووتێنێ، و خۆی پیا بگرێ، بۆ هەر دەردێك کە لە مناڵدانیا بێت چاکە.

✓ ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژا، ناوی خۆی بەو خوێنە بنووسێ و لە بەرانبەر خۆیەوە داینێ و سەیری بکا خوێنەکە ئەوەستێتەوە.

✓ ئەگەر ژنێکی سك پڕ بیەوێ بزانێ منداڵەکەی سکی کوڕە یا کچ، بێنێ تۆزێ لە شیری خۆی بدۆشێتە ناو بەرە لەپی و ئەسپێیەکی تێخا، ئەگەر ئەسپێیەکە لەناو شیرەکە نەیتوانی دەرچێ ئەوە منداڵەکەی سکی کوڕە، ئەگەر دەرچوو کچە. هۆیەکەش ئەوەیە کە شیری کوڕ خەستە، هی کچ ڕوونە، کە خەست بوو ئەسپێکە لێ دەرناچێ.

## ژنی بێنوێژ ـ حەیزدار:

✓ ژنی بێنوێژ ئەگەر هەور بە ئاسمانەوە بوو، ئەو ناوکی دەرخا هەورەکە ئەڕەوێتەوە.

✓ ژنی بێنوێژ ئەگەر نزیکی دارو باخ و بێستان و شتە بکەوێتەوە میوەی ئەو باخ و بێستانە ئیتر بێکەڵك ئەبێ.

✓ ژنی حەیزدار ئەگەر بەناو بێستانی خەیارو ترۆزیدا بڕواو پێ بنێ بەبڕکێکا، خەیار وەیا ترۆزی ئەو بڕکە تاڵ ئەبێ.

✓ ژنی خوێن کەوتوو ئەگەر سەیری ئاوێنە بکا ئاوێنەکە لێڵ ئەبێت.

✓ ئەگەر ژنێ لە حەیزدا بوو، پیاو لەوکاتەدا بچێتە لای، کابرا گەوج و ناشیرین ئەبێ و لە گورج و گۆڵیشا زۆر کورت دێنێت.

✓ ژنی بێنوێژ ئەگەر دەست دابنێ لەسەر سەری یەکێك کەژانە سەری هەبوو ژانە سەرەکەی ئەشکێ.

✓ ژنی حەیزدار ئەگەر دەست بدا بە کاژی مارەوە مارەکە ئەتۆپێ.

✓ ژنی بێنوێژ ئەگەر ببێ بە شوانی مەڕێك گورگ ناچێ بە لای ئەو ڕانەدا. ئەگەر بیشچێت تووشی ژانە سك ئەبێ - واتە گورگەکە .

## ئاسك



ئاسك لە هەموو گیانلەبەرێك سرکترە، زۆر هەڕا ئەکا، جارجار ئەوەستێ و لا ئەکاتەوە ئەو لاکردنەوەیە زۆر جوانە، چاوی ئاسك لەکاتی تیل هاویشتنا بە ناوبانگە، کاتێ بیەوێ بچێتە کونەکەیەوە زۆر بەترسەوە ئەچێتە ناویەوە، تەنانەت پشتەوپشت ئەڕوا نەوەك یەکێ بیبینێ، کاتێ کە کاڵەکە مارانە ئەخوا وەکوو ئینسان حەڵوا بخوا چەن بەلەزەت ئەیخوا ئەویش ئاوایە.

✔ ئەگەر شاخی ئاسك بڕنن و ئەو ئاردەی کەلێی پەدا ئەبێ لەهەر شوێنێك بسووتێنرێ هەچ مار و مێروو مێشولەو شتەیەك لەو شوێنەدا هەبێ هەمووی ڕەو ئەکاو ئەڕوا.

✔ ژنێك ئەگەر زماندرێژ و بێ حەیا بوو، زمانی ئاسك بهێنرێ لە سێبەردا وشك بکرێتەوەو بدرێ بەو ژنە ئیتر ئەو زماندرێژییەی نامێنێ.

✔ ئەگەر یەکێك گوێچکەی ژان بکا زراوی ئاسکی تێ بتکێنن ژانەکەی ئەشکێ و چاك ئەبێتەوە.

✔ ئەگەر پشقڵی ئاسك لەگەڵ پێستەکەی پێکەوە بسووتێنرێ و بیهاڕنەوەو پاشان تێکڵاو بە خواردەمەنی بکرێ و بدرێ بە مناڵ ئەو مناڵە زیرەك و زمانپاراو و بە زەین ئەبێ.

## ئەسپ



ئەسپ وەیا ماین جوانتر گیانلەبەرێکە لە پاش ئادەمیزاد، لە هەموو گیانلەبەرێ بەتواناترە بۆ ڕاکردن و ماندوو نەبوون لە ڕاکردن، زۆر زیرەکە. لە هەموو حەیوانێك زیاتر تابع بەسوارو خاوەنەکەی ئەبێ هەڵسووڕانی، زۆر ئەسپ وەیا ماینی وا هەیە تا سواری لەسەر پشت بێ نەمیز ئەکا نەتەرس، زۆری وا هەیە

بە جۆری خاوەنەکەی خۆی ئەناسێ نایەڵێ کەسی‌تر سواری بێ، گەلێ ماینی وا هەیە ئەگەر جوانووی هەبوو وشکی کرد، هەر لە ڕەسەنی خۆی ماینی‌تر شیر ئەدەن بە جوانووەکەی. ئەسپ و ماین پێوە هاتنی بۆ هەیە، چاکتر ڕەنگ، ڕەنگی ماینی کوێتە.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی ئاوی ڕەشی هەبێ زراوی ئەسپ بێنێ سی ڕۆژ بیخاتە ناو ئاو، پاشان لەگەڵ هەنگوینێکا کە ئاوی لێ نەکەوتبێ پێکەوە بیانسوێتەوە، لە چواردە تا بیست و چوار ڕۆژ چاوی پێ بڕێژێ چاوەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ سکی ژان بکا ددانی ئەسپ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ژانە سکەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر پێستی ئەسپ لەناوەڕاستی گوندێکا بنرێتە چاڵ هیچ ئافەتێك تووشی ئەو گوندە نابێت.

✓ ئەگەر شوێنێك ئاوسا بوو ژانی ئەکرد پێستی ئەسپ بسووتێنرێ و بخرێتە سەری چاك ئەبێتەوە.

✓ ددانی ئەسپ هەڵبواسرێ بەسەر مناڵا ئەو مناڵە بەبێ ئازار، ددان دەر ئەکا.

✓ ئەگەر تاڵێك لەمووی کلکی ئەسپ (تامووسك) بەیانی ڕایەڵ بکرێ بەم لاو بەولای هەر دەرگایەکدا مێشوولە ناچێتە ئەو ژوورە.

✓ سمی پێی ئەسپی چەمووش لە هەر ماڵێکا بخرێتە چاڵ مشکی ئەو ماڵە هەموو ڕائەکەن.

✓ جووچك یەکەم جار کە ئاو ئەخواتەوە، ئەو ئاوەی لە ئاوی شوێن پێی ئەسپ بێ کۆلارەو شتە قەت نزیکی ئەو جووچکانە ناکەوێ.

✓ بە عەرەقی ئەسپ بنەنگڵ و بەری مناڵ بهەنوورێ ئەو شوێنانەی ئیتر موو دەر ناکا.

✓ ئافرەتێ کە مناڵەکەی بە زەحمەت ئەبێ تەرسی ئەسپی لەژێرا بسووتێنن بە ئاسانی مناڵەکەی ئەبێ.

✓ ئەمانەی کە بۆ ئەسپ وتران ماینیشی بەر ئەکەوێ.



## ئێستر

ئێستر گیانلەبەرێکی وەکوو بڵێیت چەمووش و ناکلۆکارە، تۆوەکەی لە بەینی ئەسپ و کەردایە، ئەگەر نێرەکە ئەسپ بێت ئێسترەکە زیاتر لە ئەسپ ئەچێ، ئەگەر کەر بێ لە کەر ئەچێ، ئەندامەکانیشی لە بەینی ئەندامی ئەسپ و کەردایە، ڕەوشتیشی هەروەها نەزیرەکی ئەسپی هەیە نەکەریەتی کەر، دەنگ و ڕێگا ڕوەیشتنیشی هەر لەبەینی ئەو دوانەدایە، بوردەباری کەرو هێزی ئەسپی هەیە، بۆ شاخ وداخ زۆر بەکارە، هەر ڕێگایەك زۆر تووش و سەخت بێ پیا ئەڕوا، کە جارێك پیایا ڕۆیشت ئیتر ونی ناکا، لەبەر ئەمانەیە بۆیە زۆرتر لە وڵاتە شاخاویەکانی وەکوو هەورامان زۆرتر ئێستر ڕائەگرن، وەکوو چۆن گەلێ جار وڵاخی سواری و کاروانی هەموو جۆرە پیاوێك بووە، ئێستری مێچکە لەبەر تەنگی زەهای نەزۆکە، ئەگەر ڕێ بکەوێ منداڵدانی تۆو بگرێ و بێتە بەرهەم، کەهاتە کاتی زاین ئەتۆپێ. لە کاتی ڕۆیشتنا پێی لە شوێنی دەستی دائەنێ، بەو بۆنەوە لە جێگای هەڵدێرو تووشا بە بێترس سواری ئەبن چونکە ئەگەر زانی شوێن دەستەکەی مەترسیەکی هەڵخلیسکانی تێدایە پێیەکەی لێی دانانێ.

✓ سمی ئێستر ئەگەر لەگەڵ ڕۆنی داری ئاسدا تێکڵاو بکرێ و بکوترێ پێکەوە، یەکێ کە سەری کەچەڵ بێ، وەیا شوێنێ کە مووی لێ نەیە لێ بنرێ مووی لێ دێ.

✓ سمی قاتری ڕەش وەیا خوێنەکەی لە ژێر ئاستانەی دەرگایماڵێکا دابنرێ مشك ناچێتە ئەو ماڵەوە.

✓ لە ماڵێکا سمی نێرە ئێستر بسووتێنرێ و بۆنەکەی لەو ماڵەدا بڵاو ببێتەوە نە مشك وە نە جرۆجانەوەریتر ڕوو ناکەنە ئەو ماڵە.

✓ ئەگەر ئافرەت بە ئەندازەی بیست و یەك مسقاڵ لە میزی ئێستر بخواتەوە قەت سکی پڕ نابێ.

✓ ئەگەر ئافرەت لۆکە بدا بە عەرەقی ئێسترەوەو هەڵیبگرێ قەت ئیتر سکی پڕ نابێ.

✓ دڵی ئێستر هەر ئافرەتێك بیخوا قەت سکی پڕ نابێ.

✓ گونی ئێستر بخرێتە ناو پارچەیەك و بكرێتە ملی هەر چوارپێیەكی‌تر ئەو چوارپێیە قەت لە ڕۆیشتن ماندوو نابێ.

✓ ئەگەر یەكێ هەلامەتی بێ بۆنی تەرسی ئێستر بكا تف بكا بەسەریا، هەر كەسێكی‌تر پێ نا بەو تەرسەدا هەلامەتەكە لەمەوە ئەچێ بۆ ئەو كەسە.

✓ ئەو خەرەنگەزەیە كە بەقنگی ئێسترەوە ئەنیشێ، ئەگەر یەكێ مایەسیری بێ، بیگرێ وشكی كاتەوەو پاشان بیسووتێنێ و خۆی بگرێ بە دووكەڵەكەیا مایەسیرییەكەی باش ئەبێتەوە.

## بەراز



بەراز حەیوانێكی ناشیرینە چاو هیچ حەز ناكا سەیری بكا، دوو كەڵبەی زلی هەیە لە شەڕا بە كاری دێنێ، سەری وەكوو سەری گامێش و سمی وەكوو گاو مەڕ وایە. بەراز كە بە كەڵ دێ یەكانەكە زۆر سوور ئەبێ لەسەری، لەسەردەمی كەڵی بەرازا یەكانەكە گەلێ جار دێنێ خۆی لە لیتە هەڵئەسووێ بۆ ئەوە كەڵبەی یەكانەی‌تر كاری تێ نەكا. نیشانەی ئەوە كە یەكانە سەردەمی پەڕینی هاتووە كە سەری شۆڕ ئەكاتەوەو دەنگی ئەگۆڕێ. كە پەڕییە سەر مالۆس وەكوو مێش بەسەریەوە ئەمێنێتەوە. بەراز لە هەموو حەیوانێ بە سك و زاترە، هەر جارە بیست بەچكەی ئەبێ، مێملی مارە، چاكی ئەخوا، كە شوێنی كەون هەڵدێت، كە گەیشتە گیانی ئەگەڕێتەوەو دەست ئەكا بە شەڕكردن، كە برسی بوو چەند ڕۆژێك لاواز ئەبێ، كە خواردنی خوارد بە دوو ڕۆژ زۆر چاك قەڵەو ئەبێتەوە، كە نەخۆش كەوت قرژاڵ ئەخوا چاك ئەبێتەوە، فیل لە دەنگی بەراز هەڵدێت. بەراز ئەگەر دایبەسن بەسەر كەرێكا بەجۆرێ كە هیچ چركە نەكا كاتێ كە كەرەكە میزی كرد ئەو ئەتۆپی، هەروەها كە چاوێكی هەڵبكەنی ئەتۆپێ، بەراز گۆشتیش ئەخواو گیاش ئەخوا. بەرازی یەكانە كە سواری مالۆسەكە ئەبێ ماوەیەك بەسەریەوە ئەمێنێتەوە، مالۆسەكە ڕێگا ئەكاو ئەویش بەسەریەوەیەتی تەنها هەر دوو پێ كەی ئەكەوێتە سەرزەوی، شوێنی دوو پێ كەی ئەوو چوار پێی مالۆسەكە

وەکوو ئەوە دیارە کە حەیوانێکی شەش پێ بێ!.

✓ یەکێ مار پێوە بدا جەرگ بەراز بخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ کەسێ ئیفلیج بووە وەیا کۆڵنج پەکی خستووە جەرگی بەراز وشك بکاتەوەو بیخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ مایەسیرییەکی قورسی هەبێ ئێسکی بەراز بسووتێنێ و بیهاڕێتەوەو بیخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ سێبەڕۆی هەبێ ئێسکی بەراز لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ بەرد لە میزڵدانیا هەبێ تەرسی بەراز بکاتە ناو ئاوو بیخواتەوە بەردەکە بە پارچە پارچەیی دەر ئەچێت.

✓ ئەگەر یەکێ ئاگرە لەسەریا بوو وەیا برینی کەچەڵی بوو تەرسی بەراز لەگەڵ سرکەدا تێکلاو بکرێ و لێی بدرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ ژان و پێچی هەبوو وەیا «مییە - معدە» و ڕیخۆڵەی بای تێدا بوو بێنێ ئەو شادەمارەی پشت قولەپێی بەرازە بسووتێنێ و بیهاڕێتەوە، پاشان لەگەڵ هەنگوینا تێکلاو بکرێ و بەئەندازەی سێ مسقاڵی لێ بخوات چاك ئەبێتەوە.

✓ کەڵبەی بەراز هەرکەسە لای بێ لەلای مەردمەوە بەڕێز ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ کەڵبەی لای چەپی بەرازی چاو پێ بکەوێ ئەو ڕۆژە خەم و خەفەتی تووش نابێ.

✓ لە لەشی ئینسانا هەر ئێسکێك بشکێ وەکوو ئەوە لەهی بەراز بخرێتە شوێنی یەك ئەگرێتەوەو جۆش ئەخواتەوە وەکوو خۆی. لەم ڕووەوە هیچ حەیوانێك نییە بەم جۆرە لەگەڵ ئینسانا ڕێ بکەوێ.

✓ ئێسکی بەراز بسووتێنرێ. خۆڵەمێشەکەی بکرێتە ناو پەڕۆیەك و لەڕێبازی ئاوی مەرەزەدا دابنرێ، ئەو مەرەزەیە باشی ئەهێنێ و بەرازیش توخنی ناکەوێ.

✓ ئێسکی بەراز بسووتێنرێ تا خۆڵەمێشەکەی سپی ئەبێتەوە، پاشان بیسوونەوەو بدرێ بەو کەسەی کۆڵنج وەیا ژانی کردووە چاك ئەبێتەوە.

✓ تەرسی بەراز بکرێ بە کووتی داری سێو، سێوەکەی سوور ئەبێ.



## بەران

✓ ئەگەر یەکێ میز بکاتە جێ خوو بگرێتە خواردنی گونی بەران بە برژاندن چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر ئافرەتێك بە زەحمەت منالّی لێ ئەبووەوە، پیوی بەران و پیوی گاو ئاوی کەوەر تێکڵاو بکاو بەشاف هەڵی بگرێ بەئاسانی منالّەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر ئافرەت بە زراوی بەران مەمکی خۆی بهەنوێ شیرەکەی وشك ئەکا.

✓ یەکێ ئەگەر تووشی «کەژۆك - عرق النسا» بوو دووگی بەران بێنێ بیتوێنێتەوەو بیکا بە سێ بەشەوە، بەشێکی بە ماوەی سێ ڕۆژ بخواتەوە دەردەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ جەرگی بەران ئەگەر هەر بە تەڕی بسووتێنرێ و خۆڵەکەی بهێنرێ بەداندا سپی ئەکاتەوە.

✓ شاخی بەران لە ژێر هەر دارێکی بە بەردا بشارێتەوە ئەو دارە بەری زۆر ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی ئاو بکا، زراوی بەران لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو بکاو بیهێنێ بە چاویا ئاوەکەی ئەوەستێتەوە.

✓ ئەو حاجەتەی کە هەنگوینی تێدابێ ئەگەر سەرەکەی بە خوری مەڕی سپی داپۆشرێ مێرووله ئیتر توخنی ناکەوێ.

✓ مێشکی مەڕ خورادنەکەی گەوجی ئەهێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ لەشی تێك شکابوو مەڕێك بگوورن و بەگەرمی پێستەکەی تێگرن چاك ئەبێتەوە.



## بزن

بزن حەیوانێکی چەتوونی هارو هاجە، لەگەڵ ئەوەشا زۆر گەوجە، تەنانەت باسی گەوجی یەکێك بکرێ پێی ئەڵێن حەچەیە، واتە ڕیشێکی زلی هەیەو عەقڵێکی کەم! بزن لە مەڕ شیری زۆرترە، پێستی لە

پێستی سەر ئەستوورترە، پیوی لە مەڕ زۆرترە وەکوو ئەوە وایە کە دووگی لە ناو زکیابێ. تاقی کراوەتەوە «کار»کە بەچکە شێری چاو پێ بکەوێ ئەبوورێتەوە، کە بەچکە شێرەکە لەبەر چاویا نەما وردە وردە هۆشی پیا دێتەوەو دێتەوە سەرخۆ. لە چەتوونی بزن ئەوەیە چ شوێنێك سەختە ئەچێتە ئەوێ، گەڕەکانیشیان لە سەرچاوە ئاو ئەخۆنەوە.

✓ خواردنی گۆشتی بزن خەفەت و کەم فیکری و بەڵغەم زیاد ئەکا.

✓ کەسێ کە زۆر دمەڵ دەرکا خواردنی گۆشتی بزن بۆ ئەو باشە.

✓ شاخی بزنی سپی بکوترێ و بکرێتە ناو پارچە پەڕۆیەکەوە، ئەمە لە ژێر سەری یەکێکی نووستوودا دابنرێ خەبەری نابێتەوە مەگەر لە ژێر سەریا لایبەن.

✓ زراوی تەگەو زراوی گا تێکلاو بکرێ، یەکێ ئەگەر گوێ گران بێ ئەو زراوانە فتیلەیەکیان پیا بێنێ و بیکاتە گوێچکەیەوە گوێ گرانیەکەی کەم ئەبێتەوە، هەروەها ئەمە نایەڵێ ئاویش بچێتە گوێچکەیەوە.

✓ ئەگەر یەکێ برژانگی زیادە لە چاوی دەرئەچوو، بێنێ برژانگەکە هەڵبکێشێ پاشان زراوی تەگە بهێنێ بە شوێنەکەیا ئیتر دەرناچێتەوە. خواردنی مێشکی بزن ئەبێتە هۆی شت لە بیر چوونەوە و هەم و غەم.

✓ ئەگەر ئافرەتێك هەر خوێنی نەئەوەستایەوە، پشقڵێکی بزن بپێچێنێ لە تۆزێ خورییەوەو هەڵیبگری مەنعی خوێنەکەی ئەکا.

✓ زراوی بزن بسووتێنرێ و خۆڵەمێشەکەی تێکلاو بکرێ بە ڕۆنی زەیتوونەوە، ئەمە بدرێ لە برۆ هەم مووی زیاد ئەکا هەم ڕەشی ئەکا.

✓ بە شیری بزن ئەگەر لەسەر کاغەز شتێك نووسرا خەتەکەی دیار نابێ، کە خرایە ناو ئاو نووسینەکە بە خەتێکی سپی دەرئەچێ و دیار ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێك موو لە شوێنێکی ئەهات و ئەیویست لێی نەیە، زراوی بزن بێنێ لەگەڵ نەوشادر وەیا لەگەڵ کەوەردا تێکلاوی بکا و مووەکە لە شوێنەکە هەڵکێشێ و پاشان بەو بیهەنوێ ئیتر مووی دەرناچێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ میزە چۆرتکێی هەبوو، ساقی بزن بێنێ پوخت بیشواو ئەو ئاوە بخواتەوە میزەچورتکەکەی نامێنێ.

✓ بە شیری بزن شتێك لەسەر کاغەز بنووسرێ ئەو نووسراوە دیار نییە بەڵام کە خۆڵەمێشی پیا پژێنرا خەتەکە دەرئەکەوێ.

✓ ڕیشی تەگە ببەسترێ بە یەکێکەوە کە سێبەڕۆی هەیە لە کۆڵی ئەکەوێ. هەروەها بۆ ژانە سەریش باشە.

✓ ئافرەت ئەگەر تۆزێ لە جەرگی بزن هەڵبگرێ وەکوو شاف ماوەیەکی زۆر شەهوەتی کەم ئەبێتەوە.

✓ ئەو کەسەی کە سپڵی هەیە بە دەستی خۆی هەندێ لە سپڵی بزن ببڕێ و لەو ژوورەدا کە خۆی تیا ئەنوێ هەڵیواسێ، کە وشك بووەو ئەمیش ژانی سپڵەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر یەکێك سپڵی هەبوو بزنێك بێنێ چل ڕۆژ لەناو کۆتکەیەکی داردا ئاوی بدا، پاشان سەری ببڕێ و سپڵەکەی بخوا، خۆی سپڵەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ دەرزی بکرێ بەخوێنی بزنداو گوێچکە یا شوێنێکیتری پێ کون بکرێ، ئەو شوێنە ئاخری هەر دێتەوە یەك.

✓ یەکی مار پێوە بدا، پێستی بزن کە سەر ئەبڕێ هەروا بەو گەرمییە بخرێتە سەر شوێنەکە بۆی چاکە.

✓ خواردنی شیری بزن لەگەڵ شەکردا ڕەنگ جوان ئەکا، هەروەها شیری بزن خواردن بۆ نەهێشتنی کەم فیکری و خەم و خەفەت و وەسوەسە باشە. وەکوو ئەمەی هەیە پووکیش بێهێز ئەکا و تاریکایی لەچاودا پەیدا ئەکا.

✓ میزی بزن بکوڵێنرێ هەتا بە تەواوی خەست ئەبێتەوە، ئەمجا بە ئەندازەی خۆی شەکری تێکڵاو کرێ. ئەو کەسەی گەڕی هەیە سێ جار لە حەمامدا بیدا لە لەشی گەڕیەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ شوێنێك لە لەشا کە سووتا پشقڵی وشکی بزنی لێ بدرێ بۆی باشە و چاکی ئەکاتەوە.

✓ ئەڵێن شاخی بزن سێ جار ئەم ئایەتەی بەسەرا بخوێنرێ:

﴿**يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُحْضَراً و مَا عَمِلَتْ مِنْ سُوءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَ بَيْنَهُ أَمَداً بَعِيداً**﴾. پاشان بخرێتە ژوور سەری ژنێکی نووستووەوە بەبێ ئەوە خۆی پێ بزانێ، پرسیاری هەر شتێکی لێ بکرێ کە بیزانێ جواب ئەداتەوە.



## بزنەکێوی

✓ ئەگەر منداڵێك زۆر گرینۆك بوو قشپلی بزنەکێوی لە ژوور سەری دابنرێ ئەو گریانەی کەم ئەبێتەوە.

✓ یەکێ کە گوێچکەی ژان بکا دڵی تەگەی کێوی توێ بکاتەوە، ئەو ڕتووبەتەی کە هەیەتی بیکاتە گوێچکەیەوە ژانەکەی ئەشکێ.

✓ ئەگەر یەکێ فێی هەبوو بە ئەندازەی مسقاڵێ لە ئاردە مشاری بزنەکێوی تێکەڵاو بە میسك بکاو بیکاتە ناو ئاوێکی ڕوونی پاکەوەو لە خورێنی بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

✓ شوێنی پێوەدانی دووپشك و زەردەواڵە بە گۆشتی بزنە کێوی بهەنوورێ ژانەکەی ئەشکێ.

✓ گونی تەگەی کێوی وشك بکرێتەوە و بکرێتە ناو ئاوو بخورێتەوە شەهوەت زۆر زۆر زیاد ئەکا.

✓ پێستی بزنە کێوی بکرێ بە سفرە مشك نزیکی ناکەوێ، هەروەها مارو حەشەراتی تریشی لێ دوور ئەکەوێتەوە.

✓ کلك و شاخی بزنە کێوی پێکەوە بسووتێنرێ، خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ ڕۆندا تێکەڵاو بکرێ، هەرکەس ژێر پێ خۆی بەوە بهەنوێ قەت لە ڕێگا ڕۆیشتنا ماندوو نابێ.

✓ پشقڵی بزنە کێوی بهاڕرێتەوەو بنرێ لە برین خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.



## بەوری بەیان

بەوری بەیان گیانلەبەرێکە زۆرتر لە هندا ئەبێ، لەگەڵ شێردا دوژمنی یەکن، ئەگەر بەوری بەیان و پڵنگ بوو بە شەڕیان شێر ئەداتە پاڵ پڵنگ، بەور لەشکڵدا لە شێرێکی گەورە ئەکا. بەورو دووپشك ئاشنایەتیان زۆر خۆشە، بەور کە نەخۆش کەوت سەگ ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە پیر بوو ئیتر توخنی ئینسان ناکەوێ،

کەمتیار فێرە بە خواردنی بێچوی بەور. بەوری بەیان جگە لەوە کە نێرەکە ئەپەڕێ لە مێیەکە، مێیەکە بە «با»یش زگی هەر پڕ ئەبێ، لەبەر ئەمەیە بۆیە وەکوو با ئەڕوا. بەوری بەیان ناگیرێ مەگەر بەفێڵ نەبێ، ئەویش ڕاوچی خۆی لێ دائەگرێ بێچووەکانی لێ ئەدزێ و هەریەکەی ئەخاتە ناو شووشەیەکەوەو سواری وڵاخێکی تیژڕەو ئەبێ و ئەڕوا، ئەگەر دایکەکە نەهات بە شوێنیا ئەوا ڕۆیشتووەو بێچووەکانی بردووە، ئەگەر خۆ تا ئەم لەشوێنی خەتەر دەرئەچێ دایکەکە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی و سەیری کرد بێچوی نەماوە بە بۆن شوێنیان هەڵئەگرێ و ئەچێ بەشوێن کابرادا ئەیگاتێ، کابرا کە زانی واهات یەکێ لە بێچووەکانی بە شووشەکەوە بۆ فڕێ ئەدا، دایکەکە ئەپلکی بە ڕزگارکردنی ئەو بێچووە لەناو شووشەکەداو ئەوانیتری لە بیر ئەچێتەوە، کابرا ئەمجا بۆ خۆی بە بێچووەکانی‌ترەوە هەڵدێت.

بەور لەگەڵ منالی ماڵدا زۆر باش ڕێ ئەکەوێ، داری کافووری زۆر خۆش لێ دێ. هەرکەس قولەپێی بەور ببەستی بەقاچ وەیا دەستیەوە قەت قەت لە ڕێگا ڕۆیشتن و ئیش‌کردنا ماندوو نابێ. هیچ حەیوانێك لە ڕۆیشتنا ناگاتە بەوری بەیان، ڕۆیشتنی وەکوو با وایە، تەمەنیشی درێژە بە چەپۆکان ئەڕوا.

## پشیلە



پشیلە حەیوانێکی دەستەمۆ و لەگەڵ هەموو کەسێکا هەڵئەکا، پاك و پوختی زۆر خۆش لێ دێ، هەموو جار بە لیکی دەمی دەموچاوی ئەشوا، ئەگەر لە لەشیا شوێنێکی پیس ببێ ئارام ناگرێ تا پاکی ئەکاتەوە، کە بە با ئەبێ ئەو مادەیە لەناو زەهایا زۆر ئەزیەتی ئەدا لەبەر ئەوە ئەکەوێتە هاوار هاوار تا پشیلەی نێری بۆ پەیدا ئەبێ‌و ڕزگاری ئەبێ، پشیلە کە بێچووەکەی بوو زۆر زۆر برسی ئەبێ لەوانەیە ئەگەر شتی دەست نەکەوێ بێچووەکەی خۆی ئەخوا، فیل هەر کە گوێ لە دەنگی پشیلە بوو موچڕکی پیا دێت و هەڵدێت، دوژمنایەتی پشیلە و مشك

هەموو کەس ئەیزانێ، ئەگەر مشکێك بەمیچێکەوە بێت پشیلەکە لە خوارەوە سەیری بکا بە دەستی ئیشارەی بۆ ئەکا مشکەکە ئەکەوێتە خوارەوە، پشیلە بۆیە گووی خۆی ئەشارێتەوەو خۆڵ ئەکا بەسەریاو هەر جارەش بۆنی ئەکا بۆ ئەوە بۆنی دەرنەچێ و مشك ئیتر نەیەت بەو دەورەدا. پشیلەساڵی دوو جار ئاوس ئەبێ بەڵام ئەوەی کە زۆر زۆرە لە ئاخری زستانا ماوەی سك پڕبوونەکەی پەنجا ڕۆژە پاش ئەوە بەچکەی ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ هەردوو چاوی پشیلە وشك بکاتەوە و پاشان بیسووتێنێ و خۆی بگرێ بە دووکەڵەکەیا هەر ئیشێکی هەبێت و بچێ بە شوێنیەوە بۆی جێ بەجێ ئەبێ.

✓ ئەگەر ژنێك هەر خوێنی نەئەوەستایەوە سپڵی پشیلەی ڕەش لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ تا ئەو سپڵەی پێ بێ ئیتر ئەو خوێنەی نایەت.

✓ ئەگەر یەکێ گۆشتی پشیلەی ڕەش بخوا جادوو کاری لێ ناکا.

✓ ئەگەر یەکێ کەڵبەی پشیلە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ بەشەو ناترسێ.

✓ ئەگەر یەکێ دڵی پشیلە بخاتە ناو هەندێ لە پێستەکەیەوەو لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ هیچ دوژمنێك پەی پێ نابا.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی بەزراوی پشیلە بڕێژێ بە شەویش وەکوو ڕۆژ ئەبینێ.

✓ گول ئەگەر خوێنی پشیلە بخواتەوە بۆی باشە. یەکێ خوێنی پشیلەی ڕەش بخواتەوە ژنان زۆر حەزی لێ ئەکەن.

✓ یەکێ دەعباکەی بەخوێنی پشیلە بهەنوێ و بچێتە لای ئافرەت ئەو ژنە ئیتر زۆر ئەوی خۆش ئەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ زراوی پشیلەی ڕەش و زراوی مریشکی ڕەش پێکەوە وشکیان بکاتەوەو بیانهاڕێتەوە، ئەمجا لەگەڵ کلدا تێکەڵاویان بکاو چاوی پێ بڕێژێ جنۆکە لەبەر چاوی ئاشکرا ئەبێ و خزمەتی ئەکەن.



## پڵنگ

پڵنگ حەیوانێکی زۆر تووڕەو تەبیعەت توندە، دوژمنی هەموو حەیوانێکە، زۆر بەگوڕە، لە بازدانا لە هەموو حەیوانێ لەپێشترە، شوێنی هەر لە زەرد و شوێنی سەختا ئەبێ، کۆ لە هیچ شتێك ناکاتەوە، ڕاوچی کە تفەنگی تێ ئەگرێ ئەگەر بەو یەکەم گوللەیە نەیەنگێوێ تازە ڕۆژی ئەو کابرایە کوڵاوە بە دەستیەوە، چونکە لەگەڵ تەقەکەدا ئەو حازرە لە سەری، ئەگەر پێکای ئەوا پێکای ئەگەر نەیپێکا ئیتر ئەو ئەم ئەگرێ، زۆر بەخۆی ئەنازێ، ڕەنگی پێستەکەی خەت خەت و جوانە، برسی بێ یا تێر بێ هەر پەلامار ئەدا، کە تێری خوارد سێ ڕۆژ ئەنوێ، بۆنی دەمی خۆشە، پراسووەکانی پشتی زۆر بەهێز نین هەر شتێکیان لێ کەوێ ئەشکێن، لەگەڵ مارو ئەژدەهادا بەینی خۆشە، کە بەچکەی ئەبێ مار ئەچێ خۆی ئەئاڵێنێ بە ملیا بۆ ئاگاداری‌کردنی، کە نەخۆش کەوت مشك ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە یەکێکی بریندار کرد خۆڵ ئەپژێنێ بەسەریا بۆ ئەوەی بمرێ.

✓ سەری پڵنگ لە هەر شوێنێك بنێژرێ مشکی زۆر لەو شوێنە کۆ ئەبێتەوە. دەست و چرنووکی پڵنگ لە هەر شوێنێك دفن بکرێ مشك ئیتر لەو شوێنەدا ناژی.

✓ هەرکەس بە ئەندازەی سێ مسقاڵ و نیو لە گۆشتی پڵنگ بخوا زەهری مارو شتە کاری تێ ناکا.

✓ کێری پڵنگ بکوڵێنرێ هەرکەس میزەچۆڕتکێ و ژانی میزڵدانی هەبێ لەو ئاوە بخواتەوە بۆی چاکەو باش ئەبێتەوە.

✓ یەکێ مایەسیری هەبێ بیکا بەعادەت لەسەر پێستی پڵنگ دانیشێ بەڵام هیچ لە بەینی ئەوو پێستەکەدا نەبێ بۆ مایەسیریەکەی باشە.

✓ ئەگەر یەکێ تۆزێ لە پێستی پڵنگ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ لەبەر چاوی خەڵك زۆر بە سام ئەبێ.

✓ پڵنگ ئەگەر یەکێکی بریندار کرد مشك زۆر خەریك ئەبێ کە میز بکا بەسەر

ئەو کەسەدا کە میزیشی کرد بەسەرا ئەمرێ، جا لەبەر ئەوە ئەبێ زۆر کۆشش بکرێ بۆ ئاگاداری ئەو کەسە لە مشك.

✓ ئەگەر یەکێ لەشی خۆی بە پیوی کەمتیار بهەنوێ ئەو کەسە بچێ بەسەر پڵنگا پڵنگەکە هەڵدێت.

✓ پیوی پڵنگ بتوێنرێتەوەو بهێنرێ بە برینی کۆن و تیراوێدا چاك ئەبێتەوە.

✓ زراوی پڵنگ یەکێ بیهێنێ بە چاویا چاوی زۆر تیژ ئەبێ.

✓ مێشکی پڵنگ کە بۆنی کرد هەرکەس بۆنی بکا ئەیکوژێ.

✓ مووی پڵنگ لە هەرماڵێکا بسووتێنرێ دوو پشك لەو ماڵەدا نامێنێ.



## چەقەڵ

چەقەڵ حەیوانێکی بێ‌فەڕو مێملی مێوو میوەیە، حەز بەناو دارو باخ ئەکا، بەشەو نزیکی ئاوەدانی ئەکەوێ، لە ناو باخەکانا ئەیکا بە عیوعیو، سەگەکانیش لە ئاوایی ئەیکەن بە وەڕە وەڕ، لە ئەنجاما فرسەت دێنێ و دێتە ئاواییەوە بە شوێن مریشکدا ئەگەڕێ، مریشك بە جۆرێ لێی ئەترسێ با لە سەردار وەیا دیواریش بێ هەرکە چاوی بە چەقەڵەکە کەوت بەبێ ئیختیار هەڵئەفڕێ و ئەچێتە بەردەستی ئەویش ئەیخوا. مریشك ئەگەر سەگ وەیا ڕێوی وەیا حەیوانێکی‌تر ـکە مریشك خۆر بێ ـ ببینێ لە شوێنی خۆی ناجووڵێ بەڵام ئەگەر چەقەڵی چاو پێ کەوت هەڕا ئەکاتە بەردەستی! چەقەڵ ئەگەر بیەوێ ڕاوی مەلی ئاوی بکا دێنێ دڕك و داڵ و شتە کۆ ئەکاتەوەو ئەیخاتە سەر ئاوەکەو خۆی شوێنی ئەکەوێ، مەلەکان ئەو پووش و پەڵاشەیان پێ خۆشە دێن لە سەری ئەنیشنەوە ئەمیش لە ناکاو پەلاماریان ئەدا ئەیانگرێ و ئەیانخوا!...

✓ زمانی چەقەڵ بخرێتە هەر ماڵێکەوە ئاژاوە ئەکەوێتە ناو ئەو ماڵە.

✓ چاوی ڕاستی چەقەڵ هەرکەسە پێی بێ چاو کاری تێ ناکا.

✔ دڵی چەقەڵ هەرکەسە لەلای بێ ئەمین ئەبێ لە هەموو دڕندەیەك.

✔ یەکێ سپڵی هەبێ بە ئەندازەی سێیەکە مسقاڵێك زراوی چەقەڵ لەگەڵ ئاوی گەرمدا تێکڵاوی کا، ئەمجا سێ ڕۆژ لە خورێنی بیخواتەوە بۆ سپڵەکەی باشە.

✔ خواردنی گۆشتی چەقەڵ بۆ ئەو شێتی و فێدارییەی کە لە ئاخری مانگەوە پەیدا ئەبێ باشە.

✔ خواردنی جەرگی چەقەڵ بە ئەندازەی مسقاڵێك بۆ فێدار باشە.

## حوشتر



حوشتر حەیوانێکی زۆر سەیرە، زۆر زلە لەگەڵ ئەو زلیەشدا منداڵێك ڕایئەکێشێ، بە بارێکی زۆر قورسەوە هەڵئەستێ و داش ئەنیشێ، بە دانیشتنەوە نەبێ بار ناکرێ، کەژاوەی لەسەر پشت دائەنرێ کە ئەم کەژاوەیە زەلام و نوێن و خواردەمەنی و ئاوی تێدا هەیە، بەمانەوە هەموو هەڵئەستێ و ئەڕوا، حوشتر لەوانەیە تا بیست ڕۆژ خۆی ڕابگرێ بۆ ئاو نەخواردنەوە ملی زۆر درێژە لەکاتی هەستانیا بە بارەوە هێزی خۆی ئەخاتە سەر مل و لەوسی. هەروەها لەبەر درێژی ملی دەمی ئەگاتەوە بە هەموو لەشی بۆ خوراندن، لەکاتێکا کە بەکەڵ ئەبێ سێ چوار ئەوەندەی جارانی بار هەڵئەگرێ، لەمانگی شوباتا دێتە کەڵ، لەو سەردەمەدا شتێك وەکوو «سی» لەدەمی دێتە دەرەوە، کە توورە بوو چار ناکرێ کە ڕقی لە یەکێ هەستا زۆر بە زەحمەت لە دەستی ڕزگاری ئەبێ، کە نەخۆش کەوت لەداری بەڕوو ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە مار پێوە بدا قرژاڵ ئەخوا ئیتر زەهرەکەی کاری تێ ناکا. حوشتر هەندێکیان دوو کۆپارە (سنام)یان هەیەو هەندێکیان یەکێك کە ئەستێرەی سیوەیلی دی ئەمرێ.

✔ گۆشتی حوشتر لە هەر شوێنێك دابنرێ مار لەو شوێنە هەڵدێت.

✔ یەکێ ئاو لەچاوی بێت خوو بگرێتە خواردنی جەرگی حوشتر ئاوی چاوەکەی ئەبڕێت.

✓ ئەو پارچە بەزەکە لەسەر پشتی حوشترەو پێ ئەڵێن کۆپارە یەکێ ئەگەر مایەسیری بوو ئەوە بتوێنێتەوەو بیهێنێ بە مایەسیریەکەیا ژانی نامێنێ و چاك ئەبێتەوە.

✓ لە ورگی حوشتردا لوویەك هەیە کە دەرهێنرا ڕەق ڕەق ئەبێ و وەکوو بەردی لێ دێ، ئەوە بیهاڕنەوەو لەگەڵ سرکەدا تێکلاوی کەن، ئەمە بۆ زەهرە کوشندەکان زۆر بەکەڵکە.

✓ یەکێ میزەچۆرتکێی هەبێ مووی حوشتر ببەستێ بەڕانی چەپیەوە میزەچۆرتکەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ. هەروەها مناڵێ میز بکاتە جێ مووی حوشتر ببەسترێ بەڕانیەوە چاك ئەبێتەوە.

✓ هەر برینێ کە لە خۆی پیستر نەبێ کە شیری حوشتری بەسەرا کرا بە کەڵکە بۆی بۆ ئەوە «تسمم» نەکا.

✓ یەکێ ددانی کرمێ بوو بەشیری حوشتر قوم قومە بکا بەکەڵکە بۆی و چاکی ئەکاتەوە.

✓ خوێنی شوێنێ کە نەوەستێتەوە کورکی حوشتر بسووتێنن و خۆڵەکەی بکرێ بەو شوێنەدا خوێنەکە ئەوەستێتەوە.

✓ گەنەی حوشتر ببەسترێ بە قۆڵی عاشقەوە عەشقەکەی نامێنێ.

✓ سەرخۆش میزی حوشتر بخواتەوە سەرخۆشییەکەی نامێنێ.

✓ ژنێ ئەگەر مناڵی نەئەبوو مۆخی لوولاقی حوشتر بێنێ لەپاش پاكبوونەوەی لە حەیز و پاش تێپەڕبوونی سێ ڕۆژیش بەسەر پاكبوونەوەکەدا بە لۆکە وەیا خوریەك هەڵیبگرێ وەکوو شاف، پاش ئەوە لەگەڵ مێردەکەیا جماع بکا مناڵ ئەکەوێتە زکیەوە.

✓ میزی حوشتر باشە بۆ ئاوسانی جگەر.

✓ حوشتر زراوی نییە.

✓ حوشتر نزگەرە ئەکا.

## دەڵەك



دەڵەك حەیوانێكی زۆر وەحشییە، دەڵەك غەیری فەنەكە، ئەم دەڵەكە وەكوو لە شێوەی پشیلەدایە، ئەوە نییە كە پێستەكەی بەناوبانگە بۆ نەرمی، مێملی كۆترە، كە ڕێوی گوێ لە دەنگی بێ هەڵدێت.

✔ ئەگەر یەكێ سێبەڕۆی بێ چاوی ڕاستی دەڵەك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ سێبەڕۆكەی لە كۆڵ ئەكەوێ، ئەگەر چاوی چەپی هەڵبگرێ بۆی دێتەوە.

✔ شوێنێ كە كۆتری زۆر بێ ئەگەر ئەو شوێنە بە پیوی دەڵەك قانگ بدرێ هەموو كۆترەكان هەڵدێن.

✔ فێدار ئەگەر تۆزێ لە خوێنی دەڵەك بتكێنرێتە لووتی فێكەی لە كۆڵ ئەكەوێ.

✔ یەكێ كۆڵنج وەیا مایەسیری هەبێ بیكا بە عادەت لەسەر پێستی دەڵەك دانیشێ لەكۆڵی ئەكەوێ.

✔ پیوی دەڵەك بسووتێنرێ مارو دووپشك لەبۆنەكەی هەڵدێن.

✔ گونی دەڵەك بسووتێنرێ مشك لەبۆنەكەی هەڵدێت.

## ڕێوی



ڕێوی حەیوانێكی فێڵبازو پێچەڵپڵووچە، لە ڕاكردنا ڕاست ئەڕوا، كە ڕاو نرا لەناكاو با ئەداتەوە ئەوی بە شوێنیەوەیە لەبەر گوڕی ڕاكردنەكەی هەر ڕاست ئەڕوا، تا خۆی ئەگرێتەوە ڕێویەكە خۆی دەرباز ئەكا. حەقایەت و قسە لەسەر ڕێوی زۆرە. ئەو كونەی كە ئەیكاو ناوی ئەنێتە ماڵی خۆی لە گەلێ لاوە كونی تێ ئەكا بۆ ئەوە ئەگەر یەكێكیانی لێ گیرا لەویترەوە دەرچێ، هەموو ساڵێ تووكێك ئەوەرێنێ، لەترسی گورگ پیازە خووگانە بە دەورو بەری كونەكەی خۆیا دائەنێ ئیتر گورگ ناوێرێ

بچێ بەلایا چونکە گورگ پێ نا بە پیازە خووگانەدا ئەمرێ ئیتر ئەویش لەکونەکەی خۆیا بە هێمنی ئەنوێ، کە برسی بوو دێتە دەرەوەو ئەچێ بۆ خۆی لەو دەشتەدا خۆی ئەکا بە مردوو، با ئەکاتە زگی خۆیەوە، ملی ڕائەکێشێ، چوار پەلی بە جۆرێ لێ ئەکا کە ئیتر هیچ گومان لەوەدا نەماوە ئەمە مردووە، تەیرو تیور وا ئەزانن مردووە لە سەری کۆ ئەبنەوە بۆ خواردنی ئەمجا لە ناکاو پەلاماریان ئەداو ئەیانگرێ و ئەیانخوا. کە نەخۆش کەوت پیاز ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە کێچ و ئەسپێ تێ دا پارچە خوریەك پەیدا ئەکاو ئەیگرێ بە دەمەوە وردە وردە ئەچێتە ناو ئاو، کێچ و شتە کە هەر سەرەو ژوور ئەبنەوە ئەویش هەر ئەچێتە ئاوەکەوە هەتا هەموو کێچ و ئەسپیەکە لە پارچە خوریەکە کۆ ئەبنەوە، ئەمجا خۆی ئەقوڵێنێ بە ئاوەکەداو پارچە خوریەکە بەرەڵا ئەکاو لەلایەکیترەوە بە پوختی دێتە دەرەوە، ڕێوی خۆی ئەزانێ پێستی بەنرخە خۆی نادا بەدەستەوە.

✓ ئەگەر سەری ڕێوی لە شوێنێکا دابنرێ کە شارگەی کۆتر بێ هەموو کۆترەکان هەڵدێن و ئیتر نایەنەوە بەو شوێنەدا.

✓ ئەگەر منالێك زۆر گرینۆك بوو کەڵبەی ڕێوی هەڵواسن بەسەریا گرینۆکییەکەی نامێنێ و باش خەوی لێ ئەکەوێ.

✓ یەکێ فێی هەبوو زراوی ڕێوی بپرژێنرێتە ناو لووتی فێکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر هێلکە گونی ڕێوی ببەسترێ بە منالەوە بەبێ عەزیەت دانەکانی دەر ئەکا.

✓ ئەگەر منالێ تووکە سەری نەهات بەخوێنی ڕێوی بیهەنوون تووك دەر ئەکا.

✓ یەکێ کلکی ڕێوی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ فێڵی هیچ فێڵبازێك کاری تێ ناکا. خوێنەکەشی هەروایە.

✓ فێدار ئەگەر کەڵبەی ڕێوی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ فێداریەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ سپڵی هەبوو ئازاری ئەدا سپڵی ڕێوی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ئازاری سپڵەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر گورچیلەی ڕێوی بخاتە ناو دەستیەوە و بڕوا بە ڕێگا نە لەسەگ ئەترسێ وە نە سەگیش پێی ئەوەڕێ.

✓ ئەگەر یەکێ ژانەسەری بوو کێری ڕێوی بکا بە سەریا ژانەسەرەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ سپڵی هەبوو بە ئەندازەی مسقاڵێ لە دڵی ڕێوی بخوا سپڵەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ پەنجەی دەست و پێی بەهەنوێ بە پیوی ڕێوی ئیتر سەرما دەست و پێی نابا.

✓ ئەگەر یەکێ گونی ڕێوی وشك بکاتەوەو بە ئەندازەی نیو مسقاڵی بکاتە ناو ئاوو بیخواتەوە زۆر ئەچێتە لای ژن.

✓ ئەگەر یەکێ دانی ژان بکا دانی ڕێوی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ژانی دانەکەی ئەشکێ، لای ڕاست بۆ لای ڕاست و لای چەپ بۆ لای چەپ.

✓ لقێکی داری هەنار بە پیوی ڕێوی بهەنوورێ لە هەر ماڵێکا دابنرێ هەچ کێچێك لەو ماڵەدا بێ لەو لقە کۆ ئەبێتەوە.



## سنجاب

سنجاب لە شکڵی مشکدایە بەڵام گەورەترە، مووی سنجاب زۆر زۆر نەرمە، پێستەکەی ئەکرێ بە فەروو پیاوانی زۆر دەوڵەمەند لە بەری ئەکەن، لەبەرکردنەکەشیان لە سەردەمی هاویندایە چونکە فێنکە بەپێچەوانەی پێستی هەموو حەیوانێکیتر.

✓ شێت گۆشتی سنجاب بخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ ئەگەر سەودای هەبوو گۆشتی سنجاب بخوا چاك ئەبێتەوە.



## سەگ

سەگ حەیوانێکی بەوەفاو فەرمانبەردارە، لە ئاوەدانیدایە، لە کوردەواریدا زۆرتر بۆ پاسکردن ڕایئەگرن، هەموو ڕانە مەڕێك سەگی لەگەڵدایە، قەت لە خاوەنی خۆی و ئەو کەسە بیناسێ توورە نابێ، مناڵی ماڵ پێ ئەنێ بەسەریا ئەو هەر کلکە سوتێی بۆ ئەکا،

هەندێ سەگی دڕ هەیە وەکوو سەگی هەوشار سوار لەسەر وڵاغ دێنێتە خوارەوە، ئەمانە بە ڕۆژ ئەبەسترێنەوەو بە شەو بەرەڵا ئەکرێن بۆ پاسکردن ئیتر قوش ناتوانێ توخنی ئەو شوێنە بکەوێ، شت فێربوونی لە بارا هەیە، لە هەندێ شوێنا جەرائمی پێ ئەبیننەوە، زیرەکییەکی تەواوی هەیە، لە زیرەکی سەگ ئەوەیە کاتێ کە ئەیبەن بۆ ڕاوی حەیوانە کێوی هەر لە دوورەوە بزن و تەگەی ئەو حەیوانانە لێك ئەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشا کە ناگا بە تەگە هەر شوێن تەگەکە ئەکەوێ، ئەزانێ لە ڕێگادا لەترسا میزی دێ و ناوێرێ بووەستێ بیکا. هەر ڕاکردنەکەی کەم ئەبێتەوەو لە ئەنجاما ئەیگرێ بەڵام بزنە مێنگەکە ئەتوانێ هەر بە ڕێگاوە میزەکەی بکاو لە هەڕاکردنەکەی کەم نەکاتەوە.

لە ڕۆژێکا کە بەفر هەموو ئەرزی داپۆشیوە لەگەڵ ڕاوچیدا دەرئەچێ بەبۆن و بە چۆنیەتی بەفرەکە شوێنی ڕاوو نێچیر ئەدۆزێتەوە ئەزانێ لە ژێر ئەم بەفرەوە لە کوێ هەناسەی گەرم دێت تێ ئەگا لەم شوێنەدا شتی لێیە، عادەتی وایە بە شەو پاس ئەکا لە دەمەو بەیانا خەوی دێت، گورگ و دز لەو وەختەدا فرسەتی لێ دێنن بۆ بردنی مەڕو بڕینی ماڵ، هەتا برسیتر بێ زیاتر پاس ئەکا، کە زستان بەفر ئەبارێ ئەو بەفرە زۆر عەزیەتی ئەداو سەرمای ئەبێ، کە مەڕ ئەبینێ دەست ئەکا بە وەڕین لای وایە ئەویش وەکوو ئەم تووشی ئەو ئازاری سەرمایە بووە!. بە هاوینیش بە گەرما زۆر پەرێشانە.

تانجی کاتێ کە ئاسکی چاو پێ کەوت دووربێ لێوە یا نزیك ئەو ڕەوەیە لێکیان ئەکاتەوە کە کامەیان هەڵدێن و کامەیان ڕووی تێ ئەکەن، هەروەها ئەزانێ کامەیان نێرەو کامەیان مێیە. جۆرە تانجیەك هەیە کە بۆنی بە یەکێکەوە کرد ئەزانێ زیندووە یا مردووە، ئەم جۆرەش ئەوەیانە کە بەلەش بچووکەو قاچ و قولی کورتە، دێڵە تانجی زووتر شت فێر ئەبێ تا گۆڵەکەی.

سەگ لە هاوینا لەبەر ئەوە کە تەبێعەتی خۆی گەرمە گەرمای هاوینەکە ئەوەندەی‌تر پەرێشانی ئەکا لەبەر ئەمە گەلێکیان هار ئەبن. ئەو سەگەی هار بێ تف و لیکی ئەبێ بە ژەهر، نیشانەی هاریەتی ئەوەیە کە لیك بە دەمیا دێتە خوارەوە، چاوی سوور ئەبێ، سەری شۆڕ ئەکاتەوە، ملی لار ئەبێ، پەردەیەك بەسەر چاویا ئەکشێ، گوێ شۆڕ ئەبێتەوە، زمانی بەر ئەبێتەوەو لیکی زۆر ئەبێ، ئاوی زۆر لە لووتی دێت، سەری شەك

و شۆك ئەكات، پشتی کووڕ ئەبێتەوە، بەم لاو بەو لادا لار ئەبێتەوە، کلکی بێ‌هێز ئەبێ و ئەچێتەوە بە ناو گەڵیا، بە ترسەوەو بە لابەلای ئەچێ بە ڕێگادا، عاجزو خەمبارە، لە هەر هەنگاوێکیا هەڵئەنگوێت، برسی ئەبێ شت ناخوا، تینوی ئەبێ ئاو ناخواتەوە، لە ئاو زۆر ئەترسێ، هەر شتێکی بەرچاو کەوت پەلاماری ئەدا بەبێ ئەوە لێی بوەڕێ، سەگانی‌تر کە پەلامار ئەدەن ئەوەڕن ئەم وا نییە، ئەم سەگی هارە کە وەڕی دەنگی وەڕینەکەی گڕە سەگی‌تر خۆی لێ ئەپارێزێ، ئەگەر کوتوپڕ سەگێکی‌تری تووش بوو سەگەکەی‌تر لە بەردەمیا دەست ئەکا بە کلکە سووتێ و نووزە نووزە و بۆی ئەکەوێ وەکوو لێی بپاڕێتەوە وایە بۆ ئەوە کەمەکێك لێی دوور کەوێتەوە و وازی لێ بێنێ بەڵکوو دەرفەتێکی دەست کەوێ و لێی هەڵبێت.

نەخۆشیی ئەم سەگی هارە چارکردنی زەحمەتە، هەر حەیوانێك بگرێ مەگەر ئادەمیزاد نەبێ ئەیکوژێ، وەیا ئەمیش هار ئەبێ با بەنی‌ئادەمیش بێ، یەکێ گەر سەگی هار گرتی میزی ئەپژێ وەکوو سەگ دروست بکا وایە، سەیری ئاو بکا شکڵی سەگ لەناو ئاوەکەدا ئەبینێ، لەبەر ئەوە ئاو ناخواتەوە با بەزۆریش بیدەنێ هەر نایخواتەوە تا لە ئەنجاما لە تینوانا ئەمرێ، ئەگەر ئەم دەردە لەو کەسەدا پیر بوو کە دائەنیشێ پیساییەکی لەوێنەی توولە سەگ دەرئەچێ، ئەم دەردە بەچاو حەیواناتەوە وەکوو گولی وایە بەچاو ئینسانەوە، ئەم دەردە لە حەیواناتا تووشی سەگ، گورگ، چەقەڵ، ڕێوی و مووشی خورما ئەبێ و ئەمانە تووش ئەبن.

✓ سەگ گۆشتی بەسەر پیویەوەیە وەکوو بەراز، کە نەخۆش کەوت گوڵی گەنم ئەخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر بەردێك فڕێ درا بۆ سەگێك و سەگەکە قەپی کرد بە بەردەکەدا و پاشان وازی لێ هێنا، ئەو بەردە بخەنە ناو شەراب و شەرابەکە هەرکەس لێ بخواتەوە هەراو هۆریایەکی زۆر ئەکا.

✓ سەگ بۆیە لەوەختی پەڕینیا لێك نابنەوە چونکە تۆوی گەماڵەکە وشکە وەکو سریش شت ئەگرێ، کۆمی با ئەکا بۆ ئەوە دەرنەچێ، ئەبێ هەموو تۆوەکەی لێ بێتەوە ئەو وەختە گەماڵەکە لە دێڵەکە ئەبێتەوە.

✓ سەگ کە پەلاماری یەکێکی دا ئەو کەسە کە دانیشێ ئیتر سەگەکە وازی لێ دێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ زمانی سەگی ڕەشی لە مستا بێ سەگ لێی ناوەڕێ.

✓ ئەگەر یەکێ کەڵبەی سەگی پێ بێ ئیتر سەگ پێ ناوەڕێ.

✓ هەردوو چاوی سەگی ڕەش ئەگەر یەکێ پێی بێ سەگ لێی ناوەڕێ.

✓ بە شەو یەکێ چرا لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ سەگ پەلاماری نادا.

✓ کەڵبەی سەگ بکرێتە ملی سەگی لانگر چاك ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ «گەنە»یەك لە گوێچکەی سەگ هەڵبگرێ لەگەڵ خۆیا هەرچی سەگە ئەکەونە ژێر فەرمانیەوە.

✓ کەڵبەی سەگ ئەگەر بکرێتە ملی منداڵ بەئاسانی دان دەر ئەکا.

✓ کەڵبەی سەگی هار، ئەو سەگە هارەی کە ئینسانێکی گرتووە بخرێتە ناو پارچە چەرمێك ببەسترێ بەقۆڵی ئەو کەسەوە کە سەگی هار گرتوویە چاك ئەبێتەوە.

✓ جەرگی سەگی ڕەش ببرژێنرێت بدرێ بەو کەسە کە سەگی هار گرتوویەتی چاك ئەبێتەوە.

✓ زمانی سەگی ڕەش هەرکەس پێی بێ ئیتر سەگ لێی ناوێرێ.

✓ پیوی سەگی تۆپیو بهێنرێ بە لوولك (خەنازیر)دا ئەیرەوێنێتەوە.

✓ مووی سەگ بکرێ بەو کەسەدا کە فێی هەیە چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ بالووکی هەبوو میزی سەگی پیا بێنن چاك ئەبێتەوە.

✓ ئافرەت کلکی سەگی ڕەشی پێ بێ دڵنیا ئەبێ لە منداڵ لەبارچوون.

✓ ئەگەر یەکێ تووشی زەردووی بوو کەڵبەی سەگ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ بێنێ گونی سەگ وشك بکاتەوەو بیبەستێ بە ڕانی خۆیەوە شەهوەتی زۆر بەهێز ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ «کەهەنگ =کۆڵنج» ئازاری زۆر ئەدا سەگێکی نووستوو لە شوێنی خۆی هەڵبستێنێ و میز بکاتە شوێنەکەی کەهەنگەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ و لەوانەیە سەگەکەش بتۆپێ.

✓ ئەگەر یەکێ بەدەم خەوەوە قسە بکا کەڵبەی سەگی پیا هەڵواسن ئیتر لە قسەکردن ئەکەوێ.

✓ مووی سەگی خوێڕی هەڵبواسرێ بە فێدارا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ زەهری خواردبووەوە، وەیا مەسمووم بوو بوو شیری دێڵە سەگ بخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

## شێر



شێر لە هەموو حەیوانێك بەهێزتر و بەدڵتر و بەسامتر و بەجەرگتر و نەترسترە، بە شای دڕندەکان بەناوبانگە، لەپێشەوە زۆر بەسامە، لەپاشەڵەوە پووچەڵە، لە هیچ حەیوانێك ناترسێ، تەنها لە دەنگی کەڵەشێری سپی و تەق و هۆڕی مس و تەنەکەو شتە هەڵدێت، نە پاشماوەی غەیری خۆی ئەخوا نەهی خۆی، کە شتێکی نێچیر کرد لەپێشا دەم ئەنێتە خوێنەکەی هەمووی هەڵئەمژێ پاشان دڵەکەی ئەخواو ئەویتری بەجێ دێڵێ. دەنگی دەف و گۆرانیی پێ خۆشە، بەشەو کە ڕووناکی ئاگری چاو پێ بکەوێ بۆی ئەکشێ و لە دوورەوە سەیری ئەکا و بۆی ڕائەوەستێ لەم کاتەدا ئیتر تووڕەییەکەی نامێنێ، بە هەموو دەم تای لێیە، بۆنی دەمی دێ، کە نەخۆش کەوت مەیموون ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە برینێکی پێوە بوو خوێنی لێ هات گورگ لێی کۆ ئەبنەوە تا نەیخۆن وازی لێ ناهێنن، کە ئەزریکێنێ هەرچی حەیواناتە هەڵدێ لەترسی دەنگەکەی تەنها کەر نەبێ ئەو لەترسا لە شوێنی خۆی ڕائەوەستێ و ورە بەرئەدا، لەکاتی برسێتیدا نازریکێنێ، شێر بە دەست مێرووڵەوە حاڵی شڕە، دێڵە شێرەکە ناچار لەکاتی بەچکە بوونیا ئەچێتە شوێنێکی نمناك نەوەك مێرووڵە بداتە بێچووەکانی، دێڵە شێر لە کاتی مناڵبوونا زۆر لاواز ئەبێ چونکە بێچووەکان مناڵدانی بریندار ئەکەن لەم کاتەدا نێرەکە ئەچێ جۆرە مارمێلکەیەك هەیە کە بە هەموو ڕەنگ ئەدرەوشێتەوە پێ ئەڵێن (حەرباء) بۆی دێنێ ئەیخوا چاك ئەبێتەوە، کە یەکێ تووشی شێر بوو سەری بۆ دانەوێنێ

و کرنووشی بۆ بەرێ ئیتر لاقەی ناکا، هەروەها توخنی ئافرەتی حەیزدار ناکەوێ.

✓ دانی شێر لای هەرکەس هەبێ قەت دانی نایەتە ژان، ئەگەر بکرێ بە سەری منالا بە ئاسانی دان دەر ئەکا.

✓ زراوی شێر هەرکە بیخواتەوە بەجەرگ و پاڵەوان و بە پەلامار ئەبێ، ئەگەر فێدار بێ، فێکەی نامێنێ، ئەگەر مووەرێزەی هەبێ ئەویش نامێنێ.

✓ بە پیوی شێر یەکێ خۆی بهەنوێ هیچ درِندەیەك نزیکی ناکەوێ.

✓ پیوی شێر لە هەرماڵێکا دابنرێ مشك و دووپشك لەوماڵەدا نامێنێ.

✓ پیوێك لە ناوچەوانی شێردایە هەرکەس ئەو پیوە بتوێنێتەوەو بیدا لەناوچەوانی خۆی ئەو کەسە هەرکەس چاوی پێ بکەوێ لێی ئەترسێ.

✓ ئەگەر لە پێستی شێر تەپڵ دروست بکرێ هەر ئەسپێ گوێی لە دەنگی ئەو تەپڵە بێ لێی ئەترسێ.

✓ پێستی شێر بکەوێتە ناو هەر دەستە پێستێکەوە مووەکورکی پێستەکانی هەڵئەوەرێن.

✓ دانیشتنی زۆر لەسەر پێستی شێر مایەسیری نایەڵێ.

✓ پێستی ناوچاوانی شێر ئەگەر یەکێ تۆزێکی لە ژێر کڵاوەکەیەوە دانێ ئەو کەسە زۆر بەسام و بەپایە ئەبێ لەلای پادشا و گەورەکان.

✓ مووی شێر لە هەر شوێنێك بسووتێنرێ هەچ درِندەیەك لەو دەورەدابێ هەڵدێت.

✓ گەر یەکێ بەسترا بوو لەژن، تۆزێ لەزراوی شێر بکاتە ناو هێلکەیەکەوە و لە سەری مانگدا بیخواتەوە رِزگاری ئەبێ و بەر ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ لە پێش باڵغبوونیا تووشی فێ هاتبوو تۆزێ لە پێستی شێر بە مووەکەیەوە پیا هەڵواسرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر تۆزێ لە پێستی شێر لەناو جلوبەرگدا دابنرێ هیچ مۆرانەو کرمێك رِوو ناکاتە ئەو جلوبەرگە.

✓ ئەگەر یەکێ تۆزێ لەپێستی شێر لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ دانی نایەتە ژان.

✓ ئەگەر یەکێ دەست و پێی بەپیوی شێر بهەنوێ سەرما نایبا، ئەگەر هەموو لەشی بهەنوێ قەت ئەسپێ رِووی تێ ناکا.

✔ یەکێ ئەگەر کلکی شێری پێ بێ هیچ فرو فێڵێك کاری تێ ناکا.
✔ ئەگەر یەکێ پیوی ناوچاوانی شێر لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا بتوێنێتەوەو بیدا لە ناوچاوانی خۆی هەرکەس چاوی پێ بکەوێ لێی ئەترسێ و ترس ئەنیشێتە دڵیەوە.
✔ ئەگەر یەکێ پیوی شێر لەگەڵ سیردا بکوتێ و بیدا لە لەشی هیچ دڕندەیەك نزیکی ناکەوێ.
✔ خواردنی گۆشتی شێر ئیفلیجی و شلەپەتەیی ناهێڵێ.
✔ بە خوێنی شێر برینی شێرپەنجە بهەنووری چاك ئەبێتەوە.
✔ هێلکەگونی شێر پیاو بیخوا تۆوی نامێنێ، ژن بیخوا زك ناکا.
✔ چرنووکی شێر بە هەرکەس ببێ هیچ دڕندەیەك نزیکی ناکەوێ.

## فیل



فیل حەیوانێکی جوان و تەبیعەت بەرزە، لە هەموو حەیوانێ زلترە، لەبەر ئەوە کە ملی کورتەو ناگا بە ئەرز لووتێکی نەرمی ناوبۆشی درێژی وەکوو مارپێچی هەیە بەوە ئاو و خواردن هەڵئەگرێ و ئەیبا بۆ دەمی، ئەگا بە هەموو لەشی، خۆی پێ ئەخورێنێ لەوانەیە پووشی لە زەوی پێ هەڵگرێ، ئەیپێچێنێ بەداری ئەستوورا لە ڕیشەی دێنێ، دوو گوێ زۆر گەورەی هەیە بەم لاو بەولای دەموچاویا شۆڕ بووەتەوە باوەشێنی دەموچاوی خۆی پێ ئەکا لەبەر ئەوە کە دائما دەمی کراوەتەوە مێشوولە پێی فێرە ئەگەر بە گوێچکەکانی مێشوولەکان دەرنەکا بەماوەیەکی کەم ئەیخۆن، جومگە لە لەشیا نییە تەنها لە قولەپێ و شان و ئەژنۆیا نەبێ، کە بەلادا کەوت ناتوانێ هەڵسێتەوە، لەم کاتەدا گەورەی فیلەکان لووتەکەی وەکوو نوێڵ ئەخاتە ژێری و بە یارمەتی فیلەکانی‌تر ڕاستی ئەکەنەوە، ڕێگا ڕۆیشتنی فیل زۆر نەرم و بێ‌هەستە، [دوو شنفرەی درێژی هەیە] بۆ شەڕکردن بەکاریان ئەهێنێ، سێسەد ددانی هەیە، تا چوارسەد ساڵ ئەژی، لە پێنج ساڵانا تۆوی نێرینەیی پەیدا ئەکا لە حەوساڵانا بەچکەی ئەبێ، زۆر شت فێر ئەبێ، کە ڕقی لەیەکێ هەڵگرت لەدڵی دەرناچێ، لەم ڕووەوە لە هەموو

گیاندارێك بەکینەترە. لەگەڵ ماردا زۆر ڕقیانە لەیەك، کە ماری چاو پێ کەوت پێی پیا ئەنێ ئەیکوژێ، ماریش ئەگەر بۆی ڕێکەوت دای بەمەوە ئەمرێ. کە نەخۆش کەوت ماری تۆپیو ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە ماندوو بوو هەر دوو شانی بە ڕۆن و ئاوی گەرم بەهنوون ماندوێتیەکەی دەر ئەچێ. زمانی فیل وەکوو هی ئینسان وایە بەڵام ئەو هەڵەو گەڕاوەیە ئەگەر وا نەبوایە قسەی ئەکرد. کە ئاو ئەخواتەوە ئەبێ ئاوەکەی بۆ لێڵ بکرێ بۆ ئەوە خۆی تیا نەبینێ چونکە ئەگەر خۆی لە ئاوەکەدا ببینێ لێی ئەترسێ و نایخواتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ چڵکی گوێی فیل بخوا حەو ڕۆژ لەسەر یەك ئەنوێ.

✓ یەکێ تووشی ئاوسانی دەوروبەری پەنجەکانی بوو لە ئاردەمشاری دانی فیلی لێ دا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەو کەسەی تووشی بەڵەکی بووبێ بە زراوی فیل خۆی بهەنوێ و سێ ڕۆژ بیهێڵێتەوە چاك ئەبێتەوە.

✓ دانی فیل بکرێ بە سەری مناڵا تووشی فێ نابێ. هەروەها ئەگەر بکرێتە ملی گا شێت نابێ.

✓ برینی پیس و تیراوێ ئاردەمشاری دانی فیلی پێوە بکرێ چاك ئەبێتەوە. هەروەها بکرێتە لووتی ئەو کەسەوە کە خوێنی لووتی پژاوە ئەویش ئەوەستێتەوە.

✓ ئەو کەسەی ئیفلیج بووە لەسەر پێستی فیل بنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئافرەتی نەزۆك میزی فیل بخواتەوەو پاشان لەگەڵ مێردەکەی بنوێ زگی پڕ ئەبێ.

✓ میزی فیل بکرێ بە هەر لایەکدا مشك لەو شوێنەدا نامێنێ.

✓ ئێسکی فیل لە ناو باخ و دارو گەنمدا بسووتێنرێ و دووکەڵ بکا کرم ئیتر ناچێ بەلای ئەوانەدا.

✓ ئافرەت بێنێ ئێسقانی فیل بە مشار ئاردی لێ هەڵوەرێنێ، ئەو ئاردە لەگەڵ هەنگوین و ئاودا تێکڵاو بکا حەو ڕۆژ هەر ڕۆژێ تۆزێکی لێ بخواتەوە، پاشان لەگەڵ مێردەکەیا بنوێ زگی پڕ ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ دەمارەکانی کرژ بوو بوو لەسەر پێستی فیل بنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ برژانگی هەڵوەریبوو بێنێ تەرسی فیل لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو

کاو بیدا لە پێڵووەکانی برژانگ دەر ئەکاتەوە.

✓ ئەو کەسەی مایەسیری هەیە تۆزێ لە پێستی فیل بسووتێنێ و خۆی بگرێ بە دووکەڵەکەیا چاك ئەبێتەوە.



## کەر

کەر حەیوانێکی بەستەزمانی گوێڕایەڵە، هەچەی لێ بکەی ئەڕوا، هۆشی لێ بکەی ئەوەستێ، زۆر بوردەبارە، هەموو لەشی وەکوو تەزی بێ وایە، زۆر ساردو لە سەرخۆیە، لە هێزی باتنیدا هەر ئەوەی هەیە بۆ ڕێگاوبان شتی لەبەر کردووەو حافزەی هەیە، ئەگەر جارێك بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتبێ لەبیری ناچێتەوە.

ئەگەر کاروانچی ڕێگا بزر کا کەرێك ئەخاتە پێش کاروانەکە، کەرەکە هەم ڕێگاکە ئەدۆزێتەوە هەم ئەزانێ چ شوێنێکی بەکەڵکی پیارۆیشتن دێت، ئەگەر شوێنێك بە کەڵکی پیارۆیشتن نەهات سەرو کلك و گوێچکەکانی ئەخاتە جووڵە جووڵ. ئەگەر گوێی بئاخنی نازەڕێنێ، ئەگەر بەرازی تینوو ببەستن بە پشتی کەرەوە کە کەرەکە ئاوی خواردەوە بەرازەکە ئەتۆپێ. لە کاتێکا کە کەر ئەزەڕێنێ سەگ دانی ئاڵ ئەبێتەوەو پشتی دێتە ژان.

✓ یەکێ مێشکی کەری بدرێتێ فیکرو هۆشی نامێنێ.

✓ یەکێ تووشی بێخەوی بوو دانی کەر بنێتە ژوور سەری خەوی لێ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ سێبەرۆی بوو جەرگی کەر وشك بکاتەوە و لەگەڵ خۆی بیکا بە شاف و هەڵیبگرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر ئافرەتێ شیری کەم بوو سپڵی کەر وشك بکاتەوەو بیسوێ بەگۆی مەمکیا شیری زۆر ئەبێ.

✓ ئەو کەسەی فێی لێیە سمی کەر ورد بکرێ و بیهاڕنەوەو چەند جارێك بیهێنن بەناو چاوانیا فێیەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ لوو و لوولك لەمل و لەشیا هەبوو سمی کەر بهاڕنەوە لەگەڵ ڕۆنی زەیتووندا تێکڵاوی بکەن و بینێن لە لووەکان بڵاویان ئەکاتەوە.

✓ کاتێ کە نێرەکەر ئەپەڕێ لە ماکەرەکە سێ تاڵ مووی کلکی یەکێ هەڵیبکەنێ و بیبەستێ بە قاچی خۆیەوە خێرا خێرا دەعباکەی ڕاست ئەبێتەوە.

✓ یەکێ گۆشتی کەر بخوا زەهرو شت ئەوەندە کاری تێ ناکا هەروەها گۆشتی کەر خواردنی بۆ گول کەڵکی هەیە.

✓ مایەسیریدار ئەگەر چەند جارێك بەخوێنی کەر مایەسیریەکەی بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ شیری کەر بۆ مناڵی زۆر گرینۆك پێی بدرێ باشە.

✓ مناڵێ کۆکەڕەشەی هەبوو شیری کەری بدرێتێ نایمێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ بەرد لە میزڵدانیا هەبوو تەرسی کەر بگوشێ و ئەو ئاوەی لێ پەیدا ئەبێ بیخواتەوە بەردەکە ورد ئەبێ و فڕێی ئەدا.

✓ بەردێك ببەسترێ بە کلکی نێرەکەرەوە ئیتر نازەڕێنێ.

✓ سمی نێرەکەر بە ڕۆن چەور بکرێ ئیتر نازەڕێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ تووشی گزاز بوو گۆشتی کەر بکوڵێنێ و پاشان لەناو ئاوەکەیا دانیشێ بۆ نەمانی گزازەکەی باشە.

✓ ئەگەر یەکێ فێی لێ بوو لە سمی کەر ئەنگوسیلەیەك بکرێ و بکرێتە پەنجەیەوە فێکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر شوێنێك خوێنی هەر نەئەوەستایەوە تەرسی کەر بارگیری بکرێ بەسەرا خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.

✓ یەکێ خوێنی لووتی پژاو هەر نەئەوەستایەوە سرکە بکرێ بەسەر پەینی کەرداو ئەو کەسە بۆنی بکا خوێنی لووتەکەی ئەوەستێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ دووپشك پێوەی بدا بە بەرەواژەیی سواری کەر ببێ ژانەکەی نامێنێ و ئەچێ بۆ کەرەکە. هەروەها ئەگەر یەکێ دووپشك پێوە دابوو، بچێ بەلای کەرێکاو سەر بنێتە گوێچکەی کەرەکەو بڵێ من لە فلانە شوێنا دووپشك پێوەداوم ژانەکەی نامێنێ.

✓ مێشکی کەر لەگەڵ ڕۆنی زەیتون تێکڵاو بکرێ و بیهێنن بە سەردا ئەوسەرە مووی درێژ ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ سەیری چاوی کەرەکێوی بکا چاوی تیژ ئەبێ و ئاوی چاوی نایەت.

✓ چاو ڕەشتن بەزراوی کەرەکێوی چاو تیژ ئەکا، تاریکایی ئەو چاوە ناهێڵێ، ئەگەر ئاویش بکا ئەوەش نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر جومگەکانی ژان بکا گۆشتی کەرەکێوی قەڵەو بخوا ئەو ژانەی نامێنێ، گۆشتی کەرەکێوی دروستە خواردنی.



## کەرگەدەنگ

کەرگەدەنگ حەیوانێکە بە زلی وەکوو فیلە، لە وێنەدا وەکوو گا وایە بەڵام لە گا گەورەترە، سمیشی هەیە و شاخیشی هەیە، زۆر تووڕەو زوو تووڕە ئەبێ، هەموو حیوانات لێی ئەترسن، کەرگەدەنگ زیاتر لە وڵاتی هێند دایە، تاقە شاخێکی هەیە وا لە تەوقەسەریەوە سەرەکەی ئەوەندە تیژە وەکوو نەشتەر وایە، بنەکەی ئەوەندە بتەوو قایم و ئەستوورە وەکوو داری بەڕوو وایە، ئەم شاخەی بەسەر سەریا چەماوەتەوە و پشتی کردۆتە پشتی، هیچ حەیوانێك نییە سم و شاخی هەبێ کەرگەدەنگ نەبێ، لە هەڕاکردنا هەموو حەیوانێك ئەیگاتێ، تا حەوسەد ساڵ ئەژی، لە پەنجا ساڵی‌دا بالغ ئەبێ، سێ ساڵ بەچکەکەی لەزکیا ئەمێنێتەوە ئەو وەختە ئەبێ، کەرگەدەنگ لە هەر وڵاتێکا بێت هیچ حەیوانێکی دڕندە لەترسی ئەو لەو وڵاتەدا نامێنێ هەموو تا ماوەی سەد فرسەخ لێی هەڵدێن. کە فیلی چاو پێ کەوت لە پشتەوە بۆی ئەچێ و پەلاماری ئەدا شاخەکەی ئەکا بە ورگیاو لەسەر هەردوو پێ ڕائەوەستێ و ئەو هێز ئەکا و فیلەکە هێز ئەکا تا بە تەواوی شاخەکەی لە ورگی فیلەکەدا ون ئەبێ ئەمجا بۆی دەرنایەتەوە لە ئەنجاما هەردووکیان ئەمرن، شیر و تیر و خەنجەر کار ناکاتە پێستی کەرگەدەنگ، پێستەکەی ئەکرێ بە مەتاڵ، هیچ حەیوانێ بەرانبەری ناکا، دەنگی کۆتری

فاختەی زۆر پێ خۆشـە، ئەو کۆترە ئەچی لەسـەر شاخەکەیەوە ئەنیشێتەوەو ئەخوێنێ، ئەو جوولە لە خۆی ئەبڕێ نەوەك کۆترەکە بڕوا. بە شاخەکەیەوە لقە شاخێك هەیە چەماوەییەکەی پێچەوانـەی چەماوەیـی شـاخەکەیەتی، نیشـانەی سـاغی و باشـی ئـەو لقـە شـاخە ئەوەیـە کـە وێنـەی سوارێکی تێدا دەرئەکەوێ، ئـەم لقـە لای کەس دەست ناکەوێ مەگـەر لەلای پادشـاکانی هینـد نەبـێ، چاکـەی ئـەو لقـە ئەوەیـە یەکـێ کۆڵنج گرتی هـەر گرتی بە دەستەوە بەرەڵای ئەکا، ئافرەتێ کە منالی بەگران ئەبوو هەر گرتی بە دەستەوە منالەکەی ئەبێ، ئەگەر شوێنێك قایم بوو نەئەگیرا ئەو لقە شاخە ئەخەنە ناو ئاوو ئەو ئاوە ئەپڕژێنن لەو شوێنە ئیتر ئەگیـرێ، توزێکـی لـێ بـدرێ بە فێدار ڕزگاری ئەبێ، ئەو کەسـەی بەلایەوە بێ چاو کاری تێ ناکاو لە وڵاغ ناکەوێتە خوارەوە، بخرێتە ناو ئاوی گەرم ساردی ئەکاتەوە.

شاخی کەرگەدەنگ بهاڕرێتەوەو بکرێ بە ڕووی دوژمنا بایەکی وا پەیدا ئەبێ دوژمنەکە پێ ناکرێ پەلامار بدا. لەم شاخی کەرگەدەنگە بکرێ بەدەسکە چەقوو و شتە ئەو چەقۆیە نزیکی هەر خواردمەنیەکی زەهراوی بکەوێ زەهرەکە ئەو هێزەی نامێنێ لەو شاخە بەلای هەر کەسێکەوە بێ هیچ ئازارێك ڕووی تێ ناکاو مار و دووپشکیش لێی هەڵدێن.

## کەروێشك



کەروێشـك حەیوانێکـی زۆر بەسـەزمان و خرپـن و ترسنۆك و کلۆڵە، هەموو جانەوەرێك پێی ئەوێرێ، ساڵێ نێـرە و ساڵێ مـێ، حەیـزی پیـا دێـت، دەسـتی لەقاچـی کورتترە، لە سەرەو ژوورەدا چاك ئەڕوا لە سەرەوخوارەدا خل ئەبێتەوە، کە ئەنوێ هەردوو چاوی زرتەی دێ، کە نەخـۆش کـەوت زەلی سـەوز ئەخوا چـاك ئەبێتەوە. زوو زوو و زۆر زۆر بەچکەی ئەبێ.

✔ قوزی کەروێشك ئافرەت بیخوا و پاشان لەگەڵ مێردەکەی بنوێ زکی پڕ ئەبێ.

✔ یەکێ جادووی لێ کرا وەیا چاو کاری تێ کردبوو میچی کەروێشـك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ جادوو و چاوەکە بەتاڵ ئەکاتەوە.

✓ یەکێ «سی» ژان بکا بە تووکی کەروێشك قانگ بدرێ بۆی چاکە.
✓ شوێنێ ئەگەر خوێنی نەوەستێتەوە تووکی کەروێشکی بخرێتە سەر ئەیوەستێنێتەوە.
✓ هەر ددانێ کە کرم خواردبێتی هەر وەکوو ئەو ددانە، واتە لای ڕاستە یا چەپ یا سەر یا خوار هی کەروێشکی لەسەر دابنرێ ژانەکەی نامێنێ و دانەکەش دەردێتەوە.
✓ زراوی کەروێشك یەکێ بیخواتەوە خەوی لێ ئەکەوێ و خەبەری نابێتەوە مەگەر سرکەی بدرێتێ.
✓ یەکێ جومگەکانی ژانی ئەکرد گۆشتی کەروێشك بکوڵێنێ و لەناو ئاوەکەیا دانیشێ ژانی جومگەکانی نامێنێ.
✓ یەکێ قاچی ژان بکا، واتە جومگەکانی قاچی کەروێشکی پێوە ببەستێ چاك ئەبێتەوە، هی ڕاست بۆ ڕاست و هی چەپ بۆ چەپ.
✓ ئافرەتێك ئەگەر مێشکی کەروێشك بخواو بە شافیش هەڵیبگرێ و پاشان لەگەڵ مێردەکەی بنوێ زکی پڕ ئەبێ.
✓ خوێنی کەروێشك هەر ژنێ بیخواتەوە قەت زکی پڕ نابێ.
✓ یەکێ موو لە چاوی بێ خوێنی کەروێشك بێنێ بە چاویا ئیتر مووی لێ نایە.
✓ یەکێ فێدار بوو فریشکی کەروێشك لەگەڵ سرکەدا تیکلاو بکرێ و بیخوا بۆی باشە، هەروەها بۆ ئەو کەسەش باشە کە مارو شتە پێوەداوە یا زەهری خواردووە.
✓ ئەگەر بە ئەندازەی دوو دەنکە گەنم لە مێشکی کەروێشك تێکلاو بە کیلۆیەك شیری مانگا بکرێ و یەکێك بیخواتەوە ئەو کەسە قەت مووی سمێڵی سپی نابێ.
✓ ئەگەر ژنێك ژەکی کەروێشکی نێر بخوا منالەکەی کوڕ ئەبێ ئەگەر هی مێ بخوا منالەکەی کچ ئەبێ ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە کەروێشك هەندێ جار نێرەو هەندێ جار مێ.
✓ ئەگەر ئافرەتێك قشپلی کەروێشك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ تا ئەو قشپلەی پێ بێ زکی نابێ.
✓ پووکی منالی ساوا بە مێشکی کەروێشك بهەنوورێ ئەو منالە زوو دان دەر ئەکا.
✓ ئەگەر یەکێ میزی ئەکردە جێ، خۆی بگرێتە خواردنی گۆشتی کەروێشك کەمەری توند ئەبێتەوەو ئیتر میز ناکاتە جێ.

✓ ئەگەر پشقلی کەروێشك لە حەماما بسووتێنرێ هەرکەسە لەو حەمامەدا بێ و بۆنی بچێ بەسەریا دەست ئەکا بە تڕ کەندن.

✓ ئەگەر یەکێ مار یا دووپشك یا شتێکی‌تر پێوە بدا شوێنەکەی بە هێلکەگونی کەروێشك بهەنوون ژانی نامێنێ و چاك ئەبێتەوە.

✓ پیوی کەروێشك لە ژێر سەری ژنی نووستوودا دابنرێ چی کردووە لە خەوەکەیا ئەیگێڕێتەوە.

✓ یەکێ دانی ژان بکا دانێکی وەکوو ئەو دانەی کەروێشك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ژانەکەی ئەشکێ.

## کەمتیار



کەمتیار سەروشکڵێکی زۆر ناشیرینی هەیە، زۆر ناتوانێ هەڕا بکا هەر خنەی دێ، بە مردوو فێرە کە لە گۆڕەکەی دەربێنێ،ساڵێ نێرەو ساڵی مێیە، ئەو ساڵەی کە نێرە ئاووس ئەبێ ساڵی دوایی کە مێیە ئەزێ، دۆستایەتی گورگ و کەمتیار زۆر خۆشە تەنانەت ئەگەر پێکەوە بکەونە ناو مەڕ ئەو مەڕە بێوەی ئەبێ، دوژمنایەتی سەگ و کەمتیار زۆر تیژە، سەگ زۆری لێ ئەترسێ، تەنانەت ئەگەر دنیا مانگەشەو بوو سەگێك لەسەر دیوارێك بوو لە خوارەوە کەمتیارێك پێی نا بە سێبەرەکەیا سەگەکە ئەکەوێتە خوارەوەو کەمتیارەکە ئەیخوا، لەوانەیە چۆن ئاسنکێش ئاسن ڕائەکێشێ کەمتیاریش بەو جۆرە سەگ ڕائەکێشێ! گورگ و کەمتیار ئەپەڕن لەیەك بێچوویەکی زۆر سەیریان ئەبێ لە ناشیرینیدا وەسف ناکرێ.

✓ ئەگەر یەکێ لەشی خۆی بەپیوی کەمتیار بهەنوێ لە ئازاری سەگ ئەمین ئەبێ.

✓ زراوی کەمتیار وشك بکرێتەوە هەر ژنێك بە ئەندازەی گرانایەتی دەنگە گەنمێکی لێ بخوا ئیتر ئارەزووی ئەوە ناکا کە لەگەڵ پیاوا بنوێ و ئەو ئیشەی لێ ئەبێزرێ.

✓ لە پێستی کەمتیار بێژنگ دروست بکرێ، هەر گەنم و جۆیەك بەو بێژنگە ببێژرێ و بچێنرێ «کولە» ئیتر توخنی ئەو چێنراوە ناکەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ پێستی کەمتیاری پێ بێ سەگ پێی ناوەڕێ.

✓ یەکێ ئەگەر تاریکایی لە چاویا هەبێ و چاوی ئاو بکا زراوی کەمتیار بێنێ بە چاویا لای ئەباو چاوەکەشی بەهێز ئەکا.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی ڕاستی کەمتیار دەرێنێ و حەوت ڕۆژ بیخاتە ناو سرکەوەو پاشان بیخاتە ژێر نقێمی ئەنگوسیلەکەیەوەو بیکاتە دەستی نە چاو وە نە جادوو هیچیان کاری تێ ناکەن.

✓ سەری کەمتیار لە هێلانەی کۆتر دابنرێ کۆترێکی زۆر لەو شوێنە کۆ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ زمانی کەمتیار بگرێ بە دەستی ڕاستیەوە نە سەگ پێ ئەوەڕێ وە نە ئازاری ئەدا.

✓ ئەگەر یەکێ ڕیشەی پیازە خوگانە بگرێ بە دەستەوە کەمتیار لێی هەڵدێ.

✓ یەکێ ئەگەر تۆزێ لە قوزی کەمتیار لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ هەموو کەس خۆشی ئەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ دانی کەمتیار ببەستێ بە باسکیەوە لەبیرچوونەوەی کەم ئەبێتەوەو ئەگەر دانیشی ژان بکا ئەویش ژانی ئەشکێ.

✓ کاسەیێ شتێك لە پێستی کەمتیار دروست بکرێ و دەغڵی پێ بپیورێ و ئەو دەغڵە بچێنرێ ئیتر ئەو دەغڵە تووشی هیچ ئافەتێك نایە.

✓ ئەگەر یەکێ خوێنی کەمتیار بخواتەوە وەسوەسەی نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر گوژاڵك بگرێ بە دەستەوە کەمتیار لێی هەڵدێ.

✓ ئەگەر یەکێ زراوی کەمتیار تێکەڵاو کا بە هەنگوین و بیهێنێ بە چاویا چاوی جوان ڕووناك ئەکاتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ زمانی کەمتیاری پێ بێ لەکاتی قسەکردنا زمانی پاراو ئەبێ و لەگەڵ هەر کەسیشا بکەوێتە دەمەقڕە بە سەریا زاڵ ئەبێ.

✓ هەرماڵێك زەماوەن وەیا ئاهەنگیان هەبێ زمانی کەمتیار بکرێ بەسەر دەرگای ئەو ماڵەدا دڵ عاجزی لەو ئاهەنگەدا ڕوو ناداو خۆشییان زیاتر ئەبێ.

✓ زراوی کەمتیار لەگەڵ خوێنی چۆلەکە تێکەڵاو بکرێ و بکرێتە چاو نایەڵێ ئەو چاوە ئاوی لێ بێ.

✓ دڵی کەمتیار بە منالا هەڵواسرێ زیرەك ئەبێ و زوویش شت وەرئەگرێ.

✓ هەرکەس مێشکی کەمتیار بێنێ بە برۆیا خۆشەویست ئەبێ لای هەموو کەس.

✓ دەستی ڕاستی کەمتیار بەلای هەرکەسێکەوە بێت ئەو کەسە لەلای پادشا و پیاو گەوران هەموو ئیشێکی بۆ جێ بەجێ ئەبێ، هەروەها ئەگەر ئافرەتیش بیبەستێ بە قۆڵ وە یا قاچییەوە بە ئاسانی منالی ئەبێت.

✓ چەمۆڵەی کەمتیار بکرێ بە داری بەردارا تەیری میوەخۆر توخنی ناکەوێ.

✓ کێری کەمتیار وشك بکرێتەوە و بهاڕێتەوە، پیاوێك بێنێ بە کەف لەمە بە ئەندازەی نیو مسقاڵی لێ بخوا زۆر ئەچێتە لای ژن. ئەگەر ژنی خراپ ئەو ئەندازەیە بخوا خراپکاری ئیتر تەرك ئەکا.

✓ قوزی کەمتیار و پێستی ناوکی کەمتیار لای هەر پیاوێك بێت هەر ژنێك چاوی پێ بکەوێ دڵی لێ ئەچێ، هەروەها ئەگەر لەلای هەر ژنێك بێ هەر پیاوێك چاوی پێ بکەوێ دڵی لێ ئەچی.

## گا



گا حەیوانێکی بەهێز و بە مەنفەعەتە، خزمەتی ئینسان ئەکا و ئینسانیش دوژمن لەو لائەداو خزمەتی ئەکا، گا چەك و هێزی لە سەریایە لەگەڵ شێردا شەڕ ئەکا، گورگ زۆر ناوێری توخنی کەوێ، زۆر حەز لە پەڕین ئەکا، کە هاتە کەڵ گوللەشی پێوە بنێ ناگەڕێتەوە، ڕۆیشتنێکی زۆر جوان و بەنازی هەیە، ئاوێکی نەجیبانە ئەخواتەوە، گا دوو ددانە تیژەکەی سەرەوەی «ثنایا» نییە گیا بە دوو ددانەکەی خوارەوەی ئەبڕێ، ئەگەر ئەمە نەبوایە لەبەر زۆر پەڕینی زوو پیر ئەبوو و لەکەڵك ئەکەوت.

✓ پیوی گا ئەگەر لەگەڵ زڕنیخی سووردا تێکلاو بکرێت، هەر شوێنێکی پێ دووکەڵ بدرێ مار و دووپشك و حەشەراتیتر توخنی ئەو شوێنە ناکەون، هەروەها ئەگەر حاجەتێکیشی پێ بهەنوون هەچ کێچێك لەو شوێنەدا هەبێ لەو حاجەتەدا کۆ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر شاخی گا بهاڕرێتەوە و بکرێتە ناو خواردنێك، سێبەڕۆدار ئەو خواردنە بخوا سێبەڕۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ چاوی گا دەربهێنرێ و بە ئاوەکەی کاغەزی پێ بنووسرێ، ئەو نووسراوە بە ڕۆژ نابینرێ و بە شەو ئەبینرێ.

✓ مووی گا بسووتێنرێ و خۆڵە سووتاوەکە تێکڵاوی ئاو بکرێ یەکێ ددانی ژان بکا غەرغەرەی پێ بکا ژانی ددانەکەی ئەشکێ.

✓ یەکێ سپڵی هەبێ مووی گا بسووتێنێ و بووڵەکەی تێکڵاوی سکەنجیە بکا و بیخواتەوە بۆ نەمانی سپڵەکەی باشە.

✓ یەکێ قورحەی هەبوو لە زکیا، مووی گا بسووتێنێ و لەگەڵ هەنگوین تێکڵاوی بکاو بیخوا بۆ نەمانی قورحەکەی باشە.

✓ شاخی گا بسووتێنرێ و بکرێتە ناو شەربەت وەیا ئاو وەیا شیرەوە هەرکەس بیخواتەوە چوونە لای ئافرەتی زۆر بەهێز ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژا شاخی گا بسووتێنن، خۆڵەمێشەکەی بکەنە لووتیەوە خوێنەکە ئەوەستێتەوە.

✓ زراوی گا بسوون بە هەر دارێکا کرم لێی نادا.

✓ زراوی گا لەگەڵ گوو مشك تێکڵاو بکرێ، ئەو کەسەی کۆڵنجی هەیە بیکا بە شاف و هەڵی‌بگرێ کۆڵنجەکەی بەری ئەدا.

✓ زراوی مانگای ڕەش هەرکەسێ بیهێنێ بەچاویا هێزێکی تەواو پەیدا ئەکا.

✓ مەشکەیەك ناوەکەی پیوی گای پیا هەڵسوون پاشان بخرێتە چاڵەوە و دەرگاکەی بەرەلا بکرێ هەر کێچێك لەو شوێنەدا بێ هەمووی ئەچێتە ناویەوە.

✓ گونی گا وشك بکرێتەوە بهاڕێتەوەو لەگەڵ ئاودا بخورێ شەهوەت زۆر ئەجووڵێنێ.

✓ کێری گا وشك بکرێتەوەو بهاڕرێتەوەو بکرێ بەسەر نیمرووداو بخورێت چوونە لای ئافرەت زۆر زۆر ئەکا.

✓ قاپی گا بیسووتێنن خۆڵەمێشەکەی بهێنرێ بە ددانا سپی ئەکاتەوەو چڵکی لا ئەبا.

✓ شوێنێك ئاوسابێ و ژان بکا بە خوێنی گا بیهەنوون ژانەکەی نامێنێ.

✓ خواردنی شیری مانگا ڕەنگ زەردی لا ئەبا.

✓ یەکێ دووپشك پێوەی بدا بە ڕۆنی مانگا بیهەنوون ژانەکەی ئەشکێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ سێبەڕۆی بوو میزی گا و میزی ئینسان تێکڵاو بکا و بیدا لە دەستی و پێی تا سێ جار، سێبەڕۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ شیاکەی گا لەگەڵ سرکەی خورما تێکڵاو بکرێ بنرێ لەو دمەڵانە کە دەرگا ناکەن دەرگایان پێ ئەکاو ئەیانتەقێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر زەردەواڵە و شەنگە سووره پێوەی دا، پەینی گا لەگەڵ سرکەو گوڵاو تێکڵاو بکرێ و لێی بنرێ ژانەکەی ناهێڵێ.

✓ یەکێ بالووکی لێی پەیدا بوو پەینی گا و سرکە و گوڵاو پێکەوە تێکڵاو بکا و بیخاتە سەری نایهێڵێ.

✓ کاتێ کە کەڵەگا ئەچێتە سەر مانگا و لە ئیشی خۆی ئەبێتەوە میز ئەکا، ئەو خۆڵەی کە میزەکەی کەوتۆتە سەر یەکێ بیهێنێ بەسەرکونی کێری خۆیا زۆر زۆر ئەچێتە لای ئافرەت.

✓ یەکێ ئەگەر میزی ئەکردە جێ، میزڵدانی گا وشك بکرێتەوە و بهاڕێتەوە و لەگەڵ سرکە و ئاوی ساردا بیدرێتێ بیخوا ئیتر میز ناکاتە جێ.

✓ گا ئەگەر مانی کرد، هێلکەگونی بگری ئیتر ئەکەوێتەوە ڕۆیشتن.



## گەوەزن

گەوەزن، گاکێوییە، لەشێکی زلی هەیە، جووتە شاخێکی زۆر زلتری هەیە، شاخەکانی لق لقە، هەر ساڵێك لقێك دەرئەکا بەو لقانەدا ئەزانرێ ئەو گەوەزنە چەند ساڵ عومریە، شاخی گەوەزن پتەوە بە پێچەوانەی شاخی حەیوانیتر هی ئەوان بۆشە، دەنگی خۆش و ئاوازی زۆر خۆش لێ دێ، کە گوێی لەو دەنگە بێ ڕائەوەستێ و گوێی لێ ڕائەگرێ زۆرتر لەو کاتانەدا

ڕاوئەکرێ، کە گوێ قوت کردەوە ئەوە دەنگ ئەبیسێ کە شۆڕی کردەوە گوێ لە هیچ نابێ، کە نەخۆش کەوت مارو ئەژدەها ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە ماری خوارد لە کلکیەوە دەستی پێ ئەکا تا ئەگاتە لای سەری کە گەیشتە ئەوێ ئیتر نایخوا، مار کە هەستی بە گەوەزن کرد ئەچێتە کونەوە ئەمیش کە هەستی بەو کرد لە کونایە دەم ئەنێ بە کونەکەوەو بە تەوژمی هەناسەی مارەکە ئەکێشێتە دەرەوە. بەجۆرێ کوشتنی ماری پێ خۆشە ئەگەر ڕاوچی ڕاوی بنێ و ئەو هەڕاکا، لەوکاتەدا کوتوپڕ تووشی مارێکی گەورە بێت ڕائەوەستێ و مارەکە ئەکوژێ، بە کوشتنی مارەکە زیاتر کەیف خۆش ئەبێ تا ڕزگارکردنی نەفسی خۆی! شوێنی گەوەزن شوێنی هەرد و سەختە، ئەچێتە ناودارستانی چڕیش، وەختی وا ئەبێ شاخی گیر ئەکا لە بەینی دوو داراو ئەمیش هێز ئەداتە خۆی یا دارەکە لە بن دێت یا شاخی ئەشکێ ئەو وەختە دەرباز ئەبێ! کە مار پێوە بدا قرژاڵ ئەخوا و چاك ئەبێتەوە، لەگەڵ ماسیدا زۆر دۆستە ئەچێتە گوێ ڕووبارەکان بۆ ئەوە ماسی ببینێ، ماسییەکانیش دەر ئەکەون بۆ ئەوە ئەو ببینن، گەوەزن کە مار پێوە بدا فرمێسك لە چاوی دێتە خوارەوە ئەو فرمێسکە لە چاڵاکی بەر چاویا ئەگیرسێتەوە وەکوو مۆمی لێ دێت، ئەوە دەرمانێکی زۆر بەکەڵکە بۆ ئەو کەسەی مارو دووپشك پێوەی بدا لێی ئەنرێ. ئەگەر یەکێ زەهری خواردبوو ئەو مۆمە بخاتە ناو دەمی زەهرەکە هیچ کاریگەرییەکی نامێنێ.

✓ شاخی گەوەزن کە ئافرەت لای بێ زوو منالی لێ ئەبێتەوە.

✓ شاخی گەوەزن بسووتێنرێ و خۆڵە مێشەکەی تێکلاوی هەنگوین بکرێ، یەکێ کرمی هەبێ بیخوا کرمەکەی ئەخا.

✓ یەکێ ئەگەر شتێك لە ئەجزای گەوەزنی پێ بێ خەوی لێ ناکەوێ.

✓ یەکێ بەرد لە میزڵدانیا هەبوو خوێنی گەوەزن بخواتەوە بەردەکە فڕێ ئەدا.

✓ شاخی گەوەزن بە هەرکەسەوە بێت دڕندە نزیکی ناکەوێ هەروەها مارو دووپشکیش نزیکی ناکەون.

✓ شاخی گەوەزن لە هەر ماڵێکا بسووتێنرێ مارو دووپشك لەو ماڵەدا نامێنێ.

✓ خۆڵەمێشی شاخی گەوەزن بنرێ لە ددانی کرمێی زۆر بە ئازار، چاك ئەبێتەوە.

✓ خوێنی گەوەزن تریاقە بۆ هەرچێ زەهر و سموومە.

- ✓ یەکێ میزی بگیرێ خوێنی گەوەزن بخواتەوە چاك ئەبێتەوە.
- ✓ مووی گەوەزن لە هەر ماڵێکا بسووتێنرێ مشکی ئەو ماڵە هەڵدێت.
- ✓ یەکێ ئەگەر ئیفلیج بوو مێشکی گەوەزن بخوا چاك ئەبێتەوە.
- ✓ لەپێست وە یا لە سمی گەوەزن لەهەر شوێنێکا بسووتێنرێ مارو دووپشك لەو شوێنە هەڵدێن.
- ✓ تووکی گەوەزن لە هەر شوێنێکا بسووتێنرێ مشك و قالۆچە لەو شوێنە هەڵدێن.
- ✓ ئەگەر یەکێ بەڵەکی تووش بوو شاخی گەوەزن بسووتێنرێ و خۆڵەمێشەکەی تێکڵاوی سرکە بکرێ و شوێنەکەی پێ بهەنوورێ و ئەمجا لەبەر هەتاو دانیشێ بەڵەکییەکەی نامێنێ.
- ✓ خۆڵەمێشی شاخی گەوەزن بۆ وەستانەوەی خوێنی لووت باشە کە بپژێ.



## گورگ

گورگ حەیوانێکی زۆر پیس و فەساڵێکی ترسێنەری هەیە، پەلامارەدەرو و شەڕکەرو فێڵبازە، لە شەڕا ئەم لاو ئەولا ئەکا بۆ ئەوە سەر لە بەرانبەرەکەی تێك بداو بیشڵەژێنێ، لە پەلامارا کە بازدی دایە سەر شتێك مەگەر بە دەگمەن نەبێ ئەگینا بە هەڵەدا ناچێ، ڕەوە گورگ لە کاتێکا کۆ بوونەوە لەیەك دانابڕێن ئەمەش لە ترسی ئەوە ئەگەر یەکێکیان دابڕان ئەوانیتر ئەیخۆن، گورگ زۆرتر لە وڵاتی کوێستانیدا ئەبێ، کە بەفر ئەرزی داپۆشی پەلاماری ئاوایی ئەدا، لەکاتی نووستنا ڕوو لەیەك ئەکەن و بە یەك چاو ئەنوون هەموو لەترسی ئەوە کە دڵنیا نین لە یەك، کە خوێنیان چاو پێ کەوت لە لەشی یەکێکیانا و برینداربوو ئەوانیتر ئەیخۆن. گورگ کەڵبەیەکی تیژو دەمێکی فراوانی هەیە، زۆر زۆر بە هێزە، دێڵە گورگ پیسترو شەڕانیترە تا نێرە گورگ، ئەگەر گورگێك بەرەنگاری یەکێك بوو زانی چاری ناکا ئەلوورێنێ گورگیتری لێ کۆ ئەبێتەوە و یارمەتی ئەدەن، گورگ کە نەخۆش کەوت خۆی تەریك ئەگرێ لە گورگیتر ئەزانێ ئەگەر گورگەکانیتر پێی بزانن ئەم

بێ‌هێز بووە ئەیخۆن، لەکاتێکا کە تووشی زەلام ئەبێ کە داری چاو پێ کەوت بە دەست زەلامەکەوە زۆر ئەترسێ وە ئەگەر زەلامەکە لێ بکاتە هەراو گاڵە دیسان ئەترسێ و هەڵدێت. گورگ بەردی بۆ باوێژی هەڵدێت و ئەڕوا بەڵام ئەگەر داری بۆ باوێژی زیاتر پەلامار ئەدا، کە تووشی ڕانە مێ‌گەل بوو لە لایەکەوە ئەلوورێنێ و ئەمجا ئەچێ لە لایەکی‌ترەوە پەلاماری مێ گەلەکە ئەدا، ئەمەش بۆ ئەوە ئەکا ئەزانێ سەگی لای ڕانەکە ئەچێ بە شوێن دەنگەکەوە و لێی دوور ئەکەوێتەوە، زیاتر کە پەلاماری مێ‌گەل ئەدا لەدەمەو بەیاندایە چونکە سەگەکە بەدرێژایی شەو پاسی کردووەو لەبەری بەیاندا خەوی دێ. کە مەڕ ئەگرێ قەپ ئەکا بەبن ملیاو بەکلك لە دواوە لێی ئەدا ئیتر مەڕەکە لەگەڵیا وەکوو ئەو ڕائەکا. ئەسپ بەشوێن گورگدا ڕاناکا چونکە ئەگەر سمی بکەوێتە شوێن چەمۆڵەی گورگەکە سمی گێر ئەبێ، هەر مەڕێك گورگ گرتی و لێی سەنرایەوە گۆشتی ئەو مەڕە لە مەڕەکانی‌تر خۆشترە، شتێك کە لە تووکی گورگ دروست بکرێ کرم و شتە هەڵنایەنێ، هیچ حەیوانێ بە ئەندازەی گورگ بۆن‌کردنی تیژ نییە، ئەگەر بۆنی کرد زەلامێکی بریندار کردووە ممکن نییە ئەو زەلامە لە دەستی ڕزگاری ببێ حەز ئەکا ڕۆستەمی زاڵیش بێ، هیچ حەیوانێك تا برسێتی زۆری بۆ نەیەنی و پیر نەبێ و شتێکی‌تری دەست نەکەوێ پەلاماری ئینسان نادا بە پێچەوانەی گورگ بەڵکوو ئەو لە هەموو حەیوانێ زیاتر بە شوێن ئینسانا ئەسوورێتەوەو لە هەموویان زیاتر پەلاماری ئینسان ئەدا.

گورگ و زەلام تووشی یەك بوون ئەگەر زەلامەکە لە پێشا گورگەکەی بینی گورگەکە بێ‌هێز ئەبێ و ترسێك لەخۆیەوە ئەچێتە دڵیەوە، ئەگەر گورگەکە لە پێشا زەلامەکەی چاو پێ کەوت ئیشەکە پێچەوانە ئەبێتەوە.

گورگ ڕاوی ڕێوی ئەکا و ئەیخوا، ڕێوی ڕاوی ژیشك ئەکا و ئەیخوا، ژیشك ڕاوی مار ئەکا و ئەیخوا، مار ڕاوی چۆلەکە ئەکا و ئەیخوا، چۆلەکە ڕاوی کولە ئەکا و ئەیخوا، کولە بە شوێن بێچووە زەردەواڵەدا ئەگەڕێ و ئەیخوا، زەردەواڵە هەنگ ئەکرێ و ئەیخوا، هەنگ مێش ئەگرێ و ئەیخوا، مێش مێشوولە ئەگرێ و ئەیخوا.

✓ گورگ بە یەك چاو ئەنوێ.

✓ پێستی گورگ بنرێتە لای پێستی مەڕەوە پێستە مەڕەکە هەموو تووکەکەی هەڵئەوەرێ.

✓ گورگ پیێ بنێ بە پیازەخووگانەو گەڵاکەیا ئەمرێ.

✓ گورگ کەبرسێتی زۆری بۆ هێنا ئەلوورێنێ گورگی‌تر لە دەوری کۆ ئەبنەوە لە تەنیشت یەکەوە ڕائەوەستن، ئەمجا ئەگەر هاتوو یەکێ لەوانە هەڵات ئەوانی‌تر پەلاماری ئەدەن و ئەیخۆن.

✓ ڕەوە گورگ تووشی زەلام بوو ویستیان بیخۆن، ئەگەر هاتوو زەلامەکە ئیشێکی وای کرد یەکێکیانی بە هەر جۆر بوو بریندار کرد و تۆزێ خوێنی لێ دەرچوو گورگەکانی‌تر هەموو پەلاماری ئەو گورگە ئەدەن ئەیخۆن و ئەم ڕزگاری ئەبێ.

✓ زەلام تووشی گورگ بوو ئەگەر لە گورگەکە ترسا گورگەکە پەلاماری ئەدا، ئەگەر خۆ نەترساو ئەو پەلاماری گورگەکەیدا گورگەکە هەڵدێ.

✓ ئەو شوێنەی کۆتری لێیە ئەگەر سەری گورگی تیا هەڵبواسرێ نە پشیلە توخنی ئەو شوێنە ئەکەوێ نە ئەو شتانە کە زیان بە کۆتر بگەیەنێ.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی ڕاستی گورگ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ نەلە دز ئەترسێ نە لە دڕندە.

✓ ئەگەر یەکێ گوێی کەڕ بوو خوێنی گورگ تێکڵاو بە گوێز بکاو بیکاتە گوێ کەڵکی هەیە بۆی و چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ کەڵبە وەیا پێست وەیا چاوی گورگ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ بەسەر دوژمنیا زاڵ ئەبێ و لەلای هەموو کەس خۆشەویست ئەبێ.

✓ ئەگەر کلکی گورگ لە گەوڕی گادا هەڵبواسرێ گورگ قەت توخنی ئەو شوێنە ناکەوێ.

✓ یەکێ ئەگەر بیکا بە عادەت هەر لەسەر پێستی گورگ دانیشێ تووشی کۆڵنج نابێ.

✓ ئەگەر پێستی گورگ بکرێ بە تەپڵەوە ئەو تەپڵە لە ناو دەستە تەپڵێکی‌ترا لێ بدرێ هەموو تەپڵەکانی‌تر ئەدڕێن.

✓ زراوی گورگ لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا تێکەڵ بکرێ هەرکەس بیهێنێ بە برۆیا بە بەردەم هەر ژنێکا بڕواو چاوی پێ بکەوێ دڵی لێ ئەچێ.

✓ ئەگەر یەکێ فێدار بوو چاوی دێڵە گورگ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ فێکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ ددانی هاتە ژان و هیچ چار نەکرا ئەو ئێسکەی لەناو تەرسی گورگدا پەیدا ئەبێ بیهێنێ بە ددانەکەیا ژانەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر هەردوو چاوی گورگ هەڵبواسرێ بە منالاَ ئەو منالە قەت تووشی فێ نابێ.

✓ ئەگەر تۆزێ لە زراوی گورگ لەگەڵ هەنگوینی ئاگر نەدیوودا تێکڵاو بکرێ و چاوی پێ برێژرێ ئەو چاوە بێهێزی و کەمبینایی بەسەرا نایەت و بە شەویش ئەبینێ.

✓ ئەگەر کلکی گورگ بە ناوی ئافرەتێکەوە گرێ بدرێ هیچکەس بەو ئافرەتە زاوا نابێ تا ئەو گرێیە نەکرێتەوە.

✓ ئەگەر سەری گورگ لە گەوڕی مەڕدا بنرێتە چاڵ هەموو مەڕەکان نەخۆش ئەکەون و ئەمرن.

✓ کەڵبەی گورگ بە هەرکەس بێ عەرەق سەرخۆشی ناکا.

✓ کەڵبەی گورگ بکرێتە ملی هەر ئەسپێك ئەو ئەسپە لە ڕاکردنا پێش هەموو ئەسپێك ئەکەوێ.

✓ چاوی ڕاستی گورگ یەکێك ئەگەر پێی بێ بە شەو ناترسێ و ئەگەر گەوجیشی هەبێ ئەو گەوجیەی کەم ئەکا، ئەگەر چاوی چەپی هەڵبگرێ خەو بە سەریا زاڵ ئەبێ.

✓ بە زراوی گورگ هەرکەس ناوچەوانی بهەنوێ لەلای خەڵك پایەبەرز ئەبێ.

✓ ئەگەر ژنی نەزۆك هەندێ لە زراوی گورگ بکا بە شاف و هەڵیبگرێ و لەگەڵ مێردەکەیا بنوێ منالی ئەبێ.

✓ ئەگەر ئافرەت خوێنی گورگ بخواتەوە قەت زکی نابێ.

✓ یەکێ گونی گورگ ببرژێنێ و بیخوا زۆر ئەچێتە لای ئافرەت.

✓ هەرکەس گونی گورگی پێ بێ ژن زۆر ڕووی تێ ئەکا.

✓ ئێسقانی گورگ ورد بکرێ و بهاڕرێتەوەو بپرژێنرێ بە دەورەی پەچەو گەوڕی مەڕدا ئیتر گورگ ڕوو ناکاتە ئەوێ.

✓ میچی گورگ بە هەر ڕێبوارێك بێ لە ڕێگا ڕۆیشتنا ماندوو نابێ.

✓ هەر منالێ تووڕەو بەدخولق بوو قاپی گورگی پیا هەڵواسرێ ئەو خووەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ قاپی لای ڕاستی گورگی پێ بێ لە بەربەرەکانێ و هەرادا بەسەر پیاوانا زاڵ ئەبێ، ئەگەر هی لای چەپی پێ بێ بەسەر ژنانا زاڵ ئەبێ.

✓ یەکێ میچی گورگ بکا بەسەر دارێکەوەو لە کاتی شەڕا پەلاماری سوارەکەی بەرانبەری بدا ئەسپی کابرای بەرانبەری هەڵدێت.

✓ کلکی گورگ لەهەر شوێنێك بنرێتە چاڵ مێش تووخنی ئەو شوێنە ناکەوێ.

✓ ژن ئەگەر میز بکا بە شوێن میزی گورگا قەت زکی پڕ نابێ.

✓ کەم حەیوان وەکوو گورگ خۆی ئەگرێ بۆ برسێتی، ئەگەر زۆر زۆر برسی بوو بە «با» ئەژی و ڕائەبوێرێ، مادە (مەعیدە)ی گورگ هەموو شت ئەتوێنێتەوە ناوکە خورما نەبێ، گورگ وەکوو سەگ وایە لە یەك گرتنا، واتە پێکەوە ئەبەسترێن لەو کاتەدا هەرکە بچێ بە سەریانا، ئەیانکوژێ، دێڵە گورگەکە ڕائەکشێ و نێرە گورگەکە ئەکەوێ بەسەریا، کە شتێکی ڕاو کردو تێری لێ خوارد ئیتر نایەتەوە سەری بەڵام زۆر خائنە بکەوێتە ناو مەڕەوە زۆری لێ مردار ئەکاتەوە.

✓ گورگ لەکاتێکا بەرەڵا بێ زۆر ئەلوورێنێ بەڵام کە گیرا پارچە پارچەی بکەنەوە نووزە لەدەمی دەرناچێ، لەماوەی فرسەخە ڕێگایەکەوە بۆنی شت ئەکا، کە ئێسك ئەشکێنێ هیچ تەقەی نایە وەکوو بە چەقۆ خەیار کەرت بکرێ بەو جۆرە بە دانی ئەو ئێسکە ئەبڕێ.

✓ کلکی گورگ لە ئاخوڕی گادا هەڵبواسرێ ئەو گایە ئیتر ڕووناکاتە ئەو ئاخوڕە.

✓ ئەگەر شوێنێك بە گووی گورگ قانگ بدرێ مشك ئیتر ڕووناکاتە ئەو شوێنە.

✓ ئەگەر تاڵێك لە مووی گورگ بکرێ بە تاڵەکانی هەر ئالەتێکی مووسیقیدا کە لە ئالەتەکە درا هەموو ئەو تارەکانی ئەپچڕێن و ئیتر هیچ دەنگێکیان لێوە نایەت.

✓ ئەگەر شوێنێك تەپڵ و دمڵەکی لێ بێ - بە تایبەتی هی ژنان - ئەگەر بێنن ئەو شوێنە بە پێستی گورگ قانگ بدرێ هەموو تەپڵ و شتەکە ئەدڕێن.

✓ ئەگەر کەلەخی گورگێك لەمس دروست بکرێ و پڕ بکرێ لە گووی گورگ و لە شوێنێکا بنرێتە چاڵ گورگ قەت ڕوو ناکاتە ئەو شوێنە.



## مەیموون

مەیموون حەیوانێکی ناشیرینی جوانە، زۆر زیرەکە شت زوو وەرئەگرێ، پەنجەی هەیە وەکوو ئینسان بە مووتە مووت شت ئەخواو سەیری ئینسان ئەکا، زۆر قابلی شت فێربوونە، کە فێر بکرێ بەرگ دروێتی ئەکا، دوکانداری ئەکا، پاسەوانی و حاجەت شۆردن و ئیشی ماڵ هەموو ئەکا.

نێرەکانیان بە کوردی پیان ئەڵێین عەنتەر، عەنتەر زۆر بەغیرەتە لەسەر ژنی خۆی، مەیموون بەزگێ تا دە دوانزە بەچکەی ئەبێ، لە کاتی ڕۆیشتنا مەیموونەکە هەندێکیان هەڵئەگرێ و عەنتەرە باوکەکەش هەندێکیان، مەیموون چ نێر چ مێ زۆر زۆر بە شەهوەتە، مەیموون کۆبوونەوەو کۆڕیان هەیە، لەکاتی کۆڕبەستنیانا دەنگە دەنگیان لێوە دێت وەکوو پێکەوە قسە بکەن، لەو کۆبوونەوانەدا مەیموونەکان بە جیا دائەنیشن و عەنتەرەکان بە جیا، ئەگەر عەنتەرێ هەستی خیانەتی کرد لە مەیموونەکەی هاوسەری عەنتەرەکانی‌تر کۆ ئەکاتەوەو پێکەوە زیندە بە چاڵی ئەکەن.

✓ ئەگەر مەیموونێك بکەوێتە ناو ئاوێکەوەو پاشان لەو ئاوە هەر کەس لێ بخواتەوە هەموو کردەوەیەکی وەکوو کردەوەی مەیموونی لێ دی.

✓ ئەگەر یەکێ دە ڕۆژ لەسەر یەك بەیانیان کە هەستا و چاوی کردەوە لەخەو یەکەم شتێك کە چاوی ئەکەوێتە سەری مەیموون بێ هەموو دەم کەیف خۆش ئەبێ، ڕۆزی زۆر ئەبێ، ژنان زۆریان خۆش ئەوێ.

✓ هەرکەس چاوی مەیموونی پێ بێ هەرکەس تووشی ئەو کەسە ببێ گەمەو گاڵتەی لەگەڵ ئەکا.

✓ دانی مەیموون هەرکەسە لەگەڵ خۆی هەڵی‌بگرێ نەخەو بەسەریا زاڵ ئەبێ نە بە شەویش ئەترسێ.

✓ خواردنی گۆشتی مەیموون بۆ گولی باشەو لە کۆڵی ئەخا.

✓ خوێنی مەیموون هەرکەسە بیخواتەوە لاڵ ئەبێ و لەبەر چاوی خەڵکیش زۆر

ناشیرین ئەبێ.

✓ پێستی مەیموون بکرێ بە هەر دارێکا سەرما زەرەر بەو دارە ناگەیەنێ.

✓ لە پێستی مەیموون بێژنگ دروست بکرێ و دەغڵی پێ لە بێژنگ بدرێ و ئەو دەغڵە بچێنرێ کولە توخنی ئەو چێنراوە ناکەوێ.

✓ مەیموون کە چاوی بە خواردەمەنیەکی زەهراوی بکەوێ ئەزریکێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ لەکاتی نووستنا مووی مەیموون بخاتە ژێر سەری خەوی زۆر سەیر سەیر ئەبینێ.



## ورچ

ورچ حەیوانیکی قەڵەوی ناکولۆکارە زۆرتر حەز بە تەنیایی ئەکا، لە هیچ حەیوانێ ناترسێ لە شێر نەبێ، کە لەگەڵ گادا شەڕ ئەکا خۆی ئەخاتە سەرپشت و بە هەردوو دەست هەردوو شاخی گایەکە ئەگرێ و لە ئەنجاما بێهێزی ئەکاو بە سەریا زاڵ ئەبێ، حەز لە فەریکە گوێزو گوێز زۆر ئەکا.

دەعبایەکی سەیرە؛ ئەوی درندە ئەیخوا ئەویش ئەیخوا، ئەوی حەیواناتی غەیر درندە ئەیخوا ئەویش ئەیخوا، ئەوی ئادەمیزاد ئەیخوا ئەوەش هەر ئەخوا!.

ورچ کە زستان هات و ڕێگای لێ گیرا ئەچێتە کونەوە دەرناچێ تا بەهار دێت و هەوا خۆش ئەکا، کە لەو ماوەیەدا ئازۆخەی تەواو بوو برسی بوو چەمۆڵەی دەست و پێی خۆی ئەمژێ بەوە تێر ئەخوا، بەهار کە دەرئەچێ قەڵەوتر بووەتەوە لەو وەختە کە چووەتە کونەوە.

لەکاتی دروستبوونی نێرو مێیەکەیانا ئەبێ هەر دووکیان بن نابێ کەسی تریان لابێ، مێیەکە ڕائەکشێ و نێرەکە خۆی ئەکێشێ بە سەریا، دێڵەورچ گەلێ جار زەلام ئەفڕێنێ و ئەینێ لەخۆی.

ورچ کە بەچکەی ئەبێ پارچە گۆشتێکە نە سەری دیارە نە دەست و قاچی، لە

ترسی ئەوە نەوەك مێرووله تێی بدا هەر بەم لاو بەولادا ئەیگوێزێتەوە، هەموو جاریش ئەیلێسێتەوە تا دەست و قاچ و سەری دەر ئەکەوێ.

✔ کەڵبەی ورچ بخرێتە ناو شیری دایکی مناڵ و بدرێتە دەرخواردی، مناڵەکە بە ئاسانی دان دەرئەکا.

✔ یەکێ بەڵەکی هەبوو بە پیوی ورچ خۆی بهەنوێ بەڵەکییەکەی نامێنێ.

✔ کەسێ چاوی ڕاستی ورچ ببەستێ بەقۆڵی خۆیەوە ئەو کەسە لەهیچ دڕندەیەك ناترسێ.

✔ یەکێ ئەگەر هەموو دەم هەر تای هەبوو چاوی ڕاستی ورچ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ تایەکەی نامێنێ.

✔ ئەگەر یەکێ زراوی ورچ ببەستێ بەڕانی ڕاستی خۆیەوە ئەو کەسە زۆر ئەچێتە لای ئافرەت و هیچ زیانێکیشی ناگاتێ لەم زۆر چوونە لای ئافرەتەی.

✔ مناڵێك کە وڕکن بوو پارچەیەك لە پێستی ورچ بکرێ بەو مناڵەدا وڕکینەکەی نامێنێ.

✔ ئەگەر مناڵێ لەکاتی نووستنیا هەر ئەگریاو نەئەنووست چاوی ڕاستی ورچ وشك بکرێتەوە، بکرێ بەو مناڵەدا ئیتر بە پوختی خەوی لێ ئەکەوێ.

✔ هەردوو چاوی ورچ بخرێتە ناو پەڕۆیەك و سێبەڕۆدار لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ سێبەڕۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✔ یەکێ سەرما دەست و پێ قەڵشاندبووەوە بە پیوی ورچ بیهەنوێ زوو چاك ئەبێتەوە، هەروەها جومگەو دەمارەکانیشی پێ بهەنوێ نەرمیان ئەکاتەوە.



## یووز

یووز بە عەرەبی پێ ئەڵێن (فهد) حەیوانێکی گۆشت خۆرە، لە شکڵا وەکوو پڵنگ وایە بەڵام بچووکترە. زۆر تووڕە و جیقڵدانە تەنگە، زۆر ئەنوێ، لە بازدانا بە گوڕە، لەگەڵ ئادەمیزاد ڕێئەکەوێ بە پێچەوانەی پڵنگ ئەو ڕێ ناکەوێ، وا ئەڵێن کە یووز لە شێرو پڵنگ پەیدا ئەبێ بەڵام ئەم قسەیە وەنەبێ زۆر جێ بڕوا بێ، دڕندەکانی تر

بۆنی یووزیان زۆر پێ خۆشە، دڕندە بچووکەکان شوێنی ئەکەون بۆ ئەوە لە پاش ماوەی بخۆن یوز کاتێ کە قەڵەو بووەوە تێ ئەگا کەوا ئەستێرەی کەوتۆتە لێژی و شێرو پڵنگ و ئەوانە بەشوێنیا ئەگەڕێن کە بیخۆن، خۆی ون ئەکاو ئەوەندە دەرناکەوێ تا ئەو قەڵەویەی بەسەر ئەچێ، لەبەر بادا ڕاناوەستێ نەوەك بایەکە بۆنی بەرێ بۆ دڕندەکانی‌ترو بێن بیخۆن، لە هەڕاکردنیشا زۆر ئازا نییە، دەنگی خۆشی خۆش لێ دێ و گوێ بۆ ڕائەگرێ، کە نەخۆش کەوت گۆشتی سەگ ئەخوا چاك ئەبێتەوە گەلێ جار لەگەڵ ورچدا دروست ئەبن و بەچکەیەکی زۆر سەیر لەوناوەدا پەیدا ئەبێ. یەکێ گۆشتی یوز بخوا زەینی تیژ و لەشی بەهێز ئەبێ، خوێنەکەی هەرکە بیخواتەوە گێل و گەوج ئەبێ، چەمۆڵەی یوز لەهەر شوێنێك هەبێت مشك توخنی ئەو شوێنە ناکەوێ.

## چوار چوار

چوار شت ژیری زیاد ئەکا:

لە خۆوە خۆ لەشت هەڵنەقورتان، سیواك و فرچە بە داناهێنان، لەگەڵ پیاوی چاکدا هەڵسان و دانیشتن، ئەو زانیاریەی کە یەکێك ئەیزانێ خۆی بیکا.

چوار شت لەش بەهێز ئەکا:

گۆشت‌خواردن، بۆنکردنی بۆنی خۆش، زۆر خۆ شۆردن، کەتان لەبەرکردن.

چوار شت مرۆڤ نەخۆش ئەخا:

زۆر چوونە لای ئافرەت، زۆر خەم‌خواردن، زۆر ئاوخواردنەوە لە ناشتا، زۆر تورشی‌خواردن. ئەمانە لەش تێك ئەدەن.

**ئەم چوارە هەریەکە شتێکیان نییە:**

حوشتر زراوی نییە، ئەسپ سپڵی نییە، حوشتر مورغ مێشکی نییە، ماسی سی و ملی نییە.

◈◇◈

# گێتیی پەلەوەر



## باز

باز لە هەموو باڵندەیەکی ڕاوچی تووڕەترو بەفیزترە، لە کاتێکا کە لەسەر دەستی بازەوان ڕائەوەستێ دیمەنێکی گەلێ جوانتری هەیە، نێچیر لە دەستی کەم دەرئەچێ، وادەرکەوتووە باز نێرەکەی لەغەیری ترۆمی خۆی ئەبێ، یا لە کۆلارە یا لە شاهین یا لە پیرۆزە، ئەگەر نێرەکە واتە ئەو تەیرەی کە بۆی ئەبێ بە جووت سپێتی لەوا زۆرتر بوو ئەم بازە جوانترو بە جەرگترو گوندەتر ئەبێ، دڵی بەهێزو چاکتر فێری شت ئەبێ، باز لە وڵاتی کوردەواری کە هەبوو زۆرتر چیل چیلە، باز لە ناو لق و پۆپی دارا نەبێ هێلانە ناکا ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە لق و پۆپی دارەکە گەرماو سەرمای لێ بگێڕێتەوە، کە هێلکە بکا سەری هێلانەکەی دائەپۆشێ بۆ ئەوە باران لێی نەدا، کە نەخۆش کەوت گۆشتی چۆلەکە ئەخوا چاك ئەبێتەوە، باز بۆ ڕاوی تەیر و تیوور فێر ئەکرێ و ئاهەنگێك لە ڕاوکردنەکەیا هەیە، کەنێچیرەکەی خۆی گرت بەفیزێکەوە ئەیهێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

- ✓ زراوی باز یەکێ بیهێنێ بە چاویا قەت ئاوی چاوی نایەت.
- ✓ شوێنێك سووتابێ لە لەشا ئێسقانی باز بسووتێنن و خۆڵەمێشەکەی پێوەکەن یەکەندەر دوو چاکی ئەکاتەوە.
- ✓ چنگی باز بکرێ بە هەر دارێکا پەلەوەری‌تر ناچن بەلایا.
- ✓ ژنێك ئەگەر منالی نەئەبوو ڕیقنەی باز لەناو ئاودا بتوێنێتەوەو بیخواتەوە پاشان لەگەڵ مێردەکەیا بنوێ منالی ئەبێ.

## پەپووسلێمانە



پەپووسلێمانە پەلەوەرێکی بە ڕواڵەت جوانە، تاجێك وا بەسەر سەریەوە لە باوەشێن ئەکا، گوڵ گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ لە پەڕەکانیشیا هەیە، لەگەڵ ئەمانەدا باڵندەیەکی بە بۆگەنە، وا ئەڵێن کە گوایە بۆیە بۆنی لێوە دێت، چونکە هێلانەکەی بە پیسی ئادەمیزاد سواغ ئەدا، لە بەهارانا سەیری ئەکەی ئەوا دەمی کردۆتەوە مێش لەناو دەمیەوە دەرئەچێ، پەپووسلێمانە وەکوو چۆن ئینسان لەناو شووشەدا ئاو ئەبینێ ئەویش بەو جۆرە لە ژێر ئەرزا ئەیبینێ، هەر شوێنێ پەپووسلێمانەی لێ بێ مۆرانەی لێ نابێ، کە نەخۆش کەوت هەڵۆی کێوی ئەخوا چاك ئەبێتەوە. حەکایەت لەسەر پەپووسلێمانە زۆرە وەکوو ئەوە ئەڵێن:

جارێك بە سلیمان پێغەمبەری وت ئەمەوێ بانگێشتنێکت بکەم، وتی هەر خۆم بەتەنها؟ وتی نا بە هەموو لەشکرەکەتەوە لەفلانە ڕۆژا هەمووتان لە دوڕگەی واق واق کۆ بینەوە نانتان بۆ دروست ئەکەم. لە ڕۆژی ناوبراودا سلێمان و هەموو لەشکرەکەی چوونە ئەوێ، ئەویش چوو کولەیەکی گرت خنکانی و خستیە ناو دەریاکەوە وتی فەرموو بخۆن ئەوی گۆشتی بەردەست ناکەوێ ئاوەکەی بەردەست ئەکەوێ، تێرو پڕ بخۆن ماڵی خۆتانە هیچ درێغی مەکەن! هەتا ساڵێ سلێمان و لەشکرەکەی هەر بەم دەعوەتە پێ ئەکەنین!.

✓ لە ماڵێکا ئەگەر پەڕی پەپووسلێمانە بسووتێنرێ هەموو جرو جانەوەرێکی لێ دوور ئەکەوێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ شتێکی لەبیر چوو چاوی پەپووسلێمانە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ بیری ئەکەوێتەوە.

✓ یەکێ ئەگەر خوێنی لەشی لە شوێنێکەوە بەرەڵابوو هەر نەئەوەستایەوە ڕیخۆڵەی پەپووسلێمانەی پیا بکرێ ئەوەستێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ دەنووکی پەپووسلێمانە بخاتە ناو پارچە چەرمێکەوەو لەگەڵ خۆی هەڵی‌بگرێ هیچی لێ ون نابێ و بچێتە لای هەرکەسیش قسەی ڕەوا ئەبێ.

✓ خۆڵی هێلانەی پەپووسلێمانە بپژێنرێت بەسەر بەندیخانەدا هەرکەس لەو

حەپسخانەدا بێ زوو بەرەڵا ئەبێ.

✓ ئەگەر لە چڕنووکی پەپووسلێمانە هەڵبواسرێ بەمناڵا تا ئەو چڕنووکەی پێوەبێ چاو کاری تێ ناکاو لەشیشی زۆر ساغ ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێك زمانی پەپووسلێمانە بێنێ بیخاتە ناو ڕۆنی کونجییەوەو بیخاتە ژێر زمانی خۆی، لەو کاتەدا داوای هەر شتێك لە هەرکەس بکا دەست نانێ بە ڕوویەوە.

✓ یەکێ ئەگەر پەڕی پەپووسلێمانەی پێ بێ لەگەڵ هەر کەسێکا هەرا بکا زاڵ ئەبێ بەسەریاو هەر شتێکیشی بوێ بۆی جێ بەجێ ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ مێشکی پەپووسلێمانە بێنێ بیکاتە ناو ئاردەوەو بیکا بە هەویر، پاشان پانی کاتەوە وەکوو کولێرەو لە سێبەرا وشکی کاتەوەو بیدا بە یەکێك و پێ بڵێ ئەی فلانی کوڕی فلان ئەم پەپووسلێمانەیەم دایە دەرخواردت ئەبێ قسەم ببیسیت، لە ژێر فەرمانما بیت، شایەتیم لەسەر بدەی وەکوو شایەتیت لەسەر سلێمان پێغەمبەر دا. ئیتر ئەو کەسە کە دەرخواردی دراوە ئەمی‌تری زۆر زۆر خۆشی ئەوێ و قەت لەژێر فەرمانی دەرناچێ.

✓ خوێنی پەپووسلێمانە بکرێتە ناو سەدەفێکەوە بکرێتە هەر چاوێك کە مووی لێ دێ ئیتر مووی لێ نایە.

✓ ئەگەر یەکێك پەپووسلێمانەیەك سەر ببڕێ مێشکەکەی بێنێ وشکی کاتەوەو لەگەڵ هەندێ جەویی سپیدا بیهاڕێتەوەو بیست و یەك گەلای ئاسی لەگەلا تێکلاو بکاو بیسوێتەوە ئەمە بدا بە لووتی هەر کەسێکا ئەو کەسە زۆر زۆر خۆشی ئەوێ.

✓ یەکێ بێنێ چاوی ڕاستی پەپووسلێمانە بخاتە ناو پارچە پەڕۆیەکی تازەوەو بیبەستێ بەقۆڵی ڕاستیەوە، هەرکەس بیبێنێ زۆر زۆر خۆشی ئەوێ.

✓ ئەگەر یەکێ ڕیخۆڵەی پەپووسلێمانە بێنێ وشکی کاتەوە لەگەڵ ڕۆنی کونجیدا پێکەوە بیسوێتەوە، سێ ڕۆژ لەسەر یەك بیدا لە مووی سەر یا ڕیشی بە تەواوی ڕەشی ئەکاتەوە.

✓ لاشەویلەی خوارووی پەپووسلێمانە بە هەرکەس بێ هەموو کەس خۆشی ئەوێ.

✓ شوێنێك ئازاری هەبوو پۆپەی پەپووسلێمانەی بەسەرا بسووتێنرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ باڵێ چەپی پەپووسلێمانە بسووتێنرێ خۆڵەمێشەکەی بکرێتە سەر ڕێگایەك. هەرکەس پێی پیابنێ خۆشەویستی ئەو کەسەی ئەچێتە دڵەوە کە خۆڵەکەی کردووە بەوێدا.

✓ یەکێ ژانەسەری هەبێ پۆپەی مورغی سلێمان بکا بەسەریا ژانەسەرەکەی ئەشکێ.
✓ چاوی مورغی سلێمان هەرکەس وشکی بکاتەوە و تێکڵاوی ڕۆنی بکاو بیدا لە دەموچاوی، هەرکەس چاوی پێ بکەوێ خۆشی ئەوێ.
✓ چاوی مورغی سلێمان بخرێتە ژوورسەر هەرکەسێکەوە تا ئەو چاوەی لەژێر سەرابێ خەوی لێ ناکەوێ.
✓ یەکێ تووشی گولی بوو چاوی پەپووسلێمانە بکاتە ملی کەڵکێکی زۆری هەیە بۆی.
✓ هەرکەس زمانی پەپووسلێمانەی پێ بێ دوژمن بەهیچ جۆرێ پێی ناوێرێ.
✓ زمانی پەپووسلێمانە هەرکەس بیخوا زانیاری و فەزلی زیاد ئەبێ.
✓ دڵی پەپووسلێمانە بەلای هەرکەسێکەوە بێت هێزی چوونە لای ژنی زیاد ئەکا.
✓ دڵی پەپووسلێمانە ببرژێنرێت پاشان لەگەڵ شەکردا پێکەوە تێکڵاوی کەن و بیخەنە سەر کولێرەیەك دووکەس پێکەوە ئەو کولێرەیە بخۆن یەکتریان زۆر خۆش ئەوێ.
✓ ئەگەر باڵی ڕاستی پەپووسلێمانە بخرێتە ژوور سەر یەکێ کە نووستووە خەوی زۆر گران ئەبێت.
✓ ئێسکی پەپووسلێمانە لە هەر ماڵێکا بسووتێنرێ هەر مۆرانەو مێرووڵەو دووپشك و شتەی‌تر لەو ماڵەدا هەبێ لەبەر بۆنی ئەو دووکەڵە هەموو ئەمرن.
✓ نینۆکی پەپووسلێمانە، واتە چڕنووکەکەی بسووتێنرێ و خۆڵەمێشەکەی ئافرەت بیخواو پاشان لەگەڵ مێردەکەی بنوێ زگی ئەبێ.



## پەڕەسێلکە

پەڕەسێلکە باڵندەیەکی جوانی پیرۆزە، زۆر بێ‌زەرەرە، ڕەوشتی وایە هەر لە ئاوەدانیدا ئەبێ، بە بنەمیچی خانووەوە هێلانە ئەکا، هەتا بڵێیت پاك و پوختە، بەهیچ جۆر زیانی بۆ ئادەمیزاد نییە، مێش و مێشوولە ئەخواو خۆی ناکا بەبار بەسەر ئینسانەوە، قەت نەبینراوە پەڕەسێلکە لەسەر شتێك بێت و بیخوا، وەیا نێرەو مێیەیان جووت بین، دەنگێکی خۆشی هەیە بۆ خوێندن،

قەت لە هێلانەی کۆنا دانانیشێ، کە گەڕایەوە لە کوێستان بۆ گەرمیان وەیا لە گەرمیان بۆ کوێستان سەر لە نوێ هێلانە دروست ئەکاتەوە، قوڕو کا پەیدا ئەکاو ئەیکا بە هێلانە، ئەگەر قوڕی دەست نەکەوت خۆی ئەکا بە ئاواو پاشان خۆی ئەپلکێنێ بە خۆڵەوە تا وەك قوڕی لێ دێ و هێلانەکەی پێ دروست ئەکا، تۆزە تۆزە دروستی ئەکا، ئەو بەشەی کە ئیمڕۆ ئەیکا وازی لێ دێنێ تا وشك ئەبێتەوە ئەو وەختە هی تری ئەداتە دەم، ناوی هێلانەکەی زۆر ساف ئەکا، کاتێ کە نێر و مێیەکە هاتنە سەر ئەوە هێلکە بکەن تۆزێکی تر لە هێلانەکەیان زیاد ئەکەن، کە بەچکەیان بوو هێلانەکە گەورەتر ئەکەنەوە، قەت نایەڵن هێلانەکەیان پیس ببێ، کە بێچووکانیشیان گەورە بوون ئەوانیش هەر فێر ئەکەن کە جیقنە و شتەکەیان فڕێ بدەنە دەرەوە، لەترسی ئەوە کە نەوەك شەمشەکوێرە بێتە گیانی بێچووەکانیان کەرەوز دێنن ئەیخەنە ناو هێلانەکەیانەوە لەبەر ئەوە کە شەمشەمەکوێرە ڕقیەتی لە کەرەوز ئیتر نایەت بۆیان. کاتێ کەوەختی ئەوە هات ئەو هەوارە چۆڵ بکەن و بچن بۆ وڵاتە پێشووەکەیان هەر تۆزێ بێچووەکان باڵەفڕە بوون هەڵیان ئەگرن و ئەڕۆن، کە چوونە وڵاتەکەیتر بەهەرەوەز هێلانە بۆ یەك دروست ئەکەن، ئەگەر لە وڵاتێکایان دەست نەکەوت موو تێکڵاوی قوڕەکە ئەکەن.

زەردوویدار فێڵێك لە پەڕەسێلکە ئەکا؛ دێنێ تۆزێ ڕەنگی زەرد ئەدا لە بێچووەکانی، کاتێ کە دایکە و باوکەکە دێنەوەو بێچووەکانی خۆیان بە زەردی ئەبینن، بەردێك هەیە لە کانیاوێکی هێندا بۆ زەردوویدار باشە ئەوان وا ئەزانن کە بێچووەکانیان تووشی زەردووی بوون، یەکێکیان ئەچێ بەردەکە ئەدزێ و بێچووەکانیش لە ڕەنگەکە پاك ئەکاتەوە.

✓ پەری پەڕەسێلکە هەرکەس بینێتە ژێر سەری خەوی لێ ناکەوێ مەگەر پەڕەکەی لە ژێر سەر دەرێنن.

✓ ئەگەر یەکێ تاریکایی لە چاویا بێ مێشکی پەڕەسیلکە بێنێ بە چاویا ئەو تاریکاییەی نامێنێ.

✓ مێشکی پەڕەسێلکە لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا تێکڵاو بکرێ و بهێنرێ بەسەردا ئەو سەرە ئیتر ئەسپێ هەڵناهێنێ.

✓ چاوی پەڕەسێلکە بخرێتە ناو پەڕۆیەك و بخرێتە سەر نوێنی هەرکەس، ئەو

کەسە کە ئەچێتە ناو ئەو نوێنە خەوی لێ ناکەوێ.

✓ خواردنی گۆشتی پەڕەسێلکە چاو زۆر تیژ ئەکا.

✓ ئافرەت خوێنی پەڕەسێلکە بخوا شەهوەتی نامێنێ.

✓ ڕیقنەی پەڕەسێلکە بنرێ لە دمەڵ زوو ئەیگەیەنێ.

✓ پەڕەسێلکە چاوی هەڵبکۆڵی چاوی دێتەوە.

✓ یەکێ بێنێ چاوی پەڕەسێلکە وشك بکاتەوەو لەگەڵ ڕۆنێکی بۆنخۆشدا تێکڵاوی بکا، ئەوە بداتە دەرخواردی هەر ژنێك دڵی لێ ئەچێ.

✓ ئەگەر یەکێ تووشی ژانەسەر بوو، وە ژانەسەرەکەش لەبەر تێکچوونی معدەی بوو، بێنن خوێنی پەڕەسێلکە بخەنە سەر مڵاشووی ئیتر ژانە سەرەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ بێنێ زراوی پەڕەسێلکە بخواتەوە مووی ڕەش ئەبێتەوە. بەڵام ئەبێ ئەو کەسە پڕی دەمی خۆی بکا لە شیر ئەگینا دانەکانی هەموو ڕەش ئەبێتەوە.

✓ خواردنی گۆشتی پەڕەسێلکە هەر چەندە چاو زۆر تیژ ئەکا بەڵام خەویش ناهێڵێ و لای ئەبا.

✓ بەردێکی بچووك هەیە لەسەری پەڕەسێلکەدا کەڵکێکی زۆری هەیە، یەکێك لەوانە ئەوەیە هەرکەس دەسی بکەوێ و لەگەڵ خۆی هەڵی بگرێ لە کاتی تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشیدا تووشی زیان نابێ و ئەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵك خۆشیان بوێ و کەس ناتوانێ بە قسەی نەکا.

✓ ئەو وەختە کە پەڕەسێلکە هێلانە ئەکا یەکەم جار لەو هێلانەیەدا کە هێلکە ئەکا هەر لەو یەکەم جارەدا دوو بەرد لەو هێلانەیەدا پەیدا ئەبێ، ئەم بەردانە یا هەردووکیان سپین، وەیا یەکێکیان سپی و ئەویکەیان سوورە. هەروەها ئەگونجێ یەکێکیان درێژکۆلە بێ و ئەویکەیان تێك ئاڵا بێ.

جا ئەو دوانە کەوا یەکێکیان سپی و ئەویتریان سوورە ئەگەر سپیەکەیان لەسەر فێدار دابنرێ فێکەی لەکۆڵ ئەکەوێ، ئەگەر لەسەر یەکێك کە لە ژن بەستراوە دابنرێ ئەکرێتەوە. سوورەکەشیان ئەگەر یەکێ میزگیرانی هەبێ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ئەو میزگیرانەی نامێنێ. هەروەها لە کاتێکا کە ئەم دوو بەردە یەکێکیان درێژو ئەویکەیان

بە بەیەکا ئاڵاوە بخرێتە ناو پارچەیەك لەپێستی گوێرەکەوەو یەکێ وەسوەسەو خەیاڵاتی هەبێ لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ وەسوەسەو خەیاڵاتەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

## پۆڕ



پۆڕ باڵندەیەکی پیرۆزی بە بەرهەمە، بێچوویەکی زۆری ئەبێ، لە شکڵا پشتی کۆماوەتەوە بەمە لەگەڵ کەودا جیا ئەکرێتەوە، ئەڵێن هەموو گیاندارێك وەیا پەلەوەرێك مایەسیری هەیە پۆڕ نەبێ، کە بەهار هات ئەو موژدەی دێنێ، بای شەماڵ و هەوای سافی زۆر پێ خۆشە، لەوانەیە بە بای زریان ئەوەندە وەڕز ئەبێ نەتوانێ بفرێ، لە فڕینا زۆر تیژە، یەکگرتنی نێر و مێیان لەناو دارو باخا نەبێ یەك ناگرن.

هەرکە دەوام بکا لەسەر خواردنی پۆڕ تێگەیشتن و فیکری ئەو کەسە زۆر زیاد ئەکا.

گۆشتاوی گۆشتەکەی هێزی جماع زیاد ئەکا، گۆشتی پۆڕ لە هەموو گۆشتێك بەلەزەتترە، لە بەهارانا ڕاو ئەکرێ.



## پیرۆزە - کەرکەس - نەسر

پیرۆزە بەشای باڵندەکان بە ناوبانگە، زۆر بەهێزە، زۆر تیژ و بەپشووە بۆ فڕین، هەموو باڵندەکانی دەشتەکی لێی ئەترسن، لە هەڵۆ گەورەترە، دەنووکی وەکوو قولاپ وایە، چڕنووکی نایەتەوە یەك گیری ئەکا لەشت وەکوو نەشتەر وایە، هەزار ساڵ عومر ئەکا، بە ڕۆژێك لە ڕۆژهەڵاتەوە بەیەك پشوو ئەچێ بۆ ڕۆژاوا، لە ماوەی چوارسەد فرسەخا بۆنی مردارەوەبوو ئەکا، خواردنی گۆشتی مردارەوەبووە، کە کەوت بەسەر لاشەی مردارەوەبوویەکدا باڵندە گۆشت خۆرەکانی تر هەموو لەترسی

ئەو دوور ئەکەونەوە، کە دەستی کرد بە خواردن ئەوەندە ئەخوا ئیتر ناتوانێ بفڕێ ئەکەوێتە قونەکردن تا تۆزێ سووك ئەبێتەوە ئەمجا ئەفڕێ، لەو کاتەدا هەموو کەس ئەتوانێ بە دەست بیگرێ، کە بۆنی شتی بۆنخۆشی کرد مردار ئەبێتەوە، کە جووتەکەی مرد ئەویش لەبەر خەم و خەفەت ئەمرێ، کە هێلکەی کرد گەڵای چناری لەلا دائەنێ لە ترسی ئەوە نەوەك شەمشەمەکوێرە هێلکەکانی بخوا، لە شوێنانی زۆر بەرز هێلکە ئەکا، بۆ هەڵهێنانی نانیشێتەوە بەسەریەوە بەڵکوو بە گەرمایی ڕۆژ هێلکەکان هەڵدێن، هەر دوو هێلکە ئەکا بۆ جارێك،کە کاتی هێلکەکردنی هات لەبەر ئەوە کە زۆر بە عەزیەت لێی ئەبێتەوە نێرەکە ئەچێ بەردێك هەیە ئەڵێین لە وڵاتی هێندە ئەیهێنێ و لەلای مایەکەوە دایئەنێ ئیتر بە ئاسانی هێلکە ئەکا، نەخۆش کەوت گۆشتی ئادەمیزاد ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە تاریکایی بە سەر چاویا هات زراوی ئادەمیزادی پیا ئەهێنێ چاك ئەبێتەوە، زۆرتر بە شوێن لەشکرەوەیە بۆ ئەوە گۆشتی لەشە کوژراوەکانیان بخوا.

✓ زراوی پیرۆزە بتکێنرێتە گوێچکەیەکەوە کە لەمێژ بێ گران بووبێ چاکی ئەکاتەوە. بهێنرێ بەچاوا ئەو چاوە ئەگەر تاریکایی وەیا پەردەی بە سەرەوە بێ وەیا ئاو بکا چاك ئەبێتەوە.

✓ گوێچکەیەك کە کەڕ بێ پیوی پیرۆزە بتوێننەوەو چەند ڕۆژێك لەسەر یەك بە شەوو بە ڕۆژ تێیکەن چاك ئەبێتەوە.

✓ دڵی پیرۆزە بخرێتە ناو پارچەیەك لە پێستی گورگ هەرکەس لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ ئەو کەسە لای هەموو کەس خۆشەویست ئەبێ، بەسام ئەبێ لە بەرچاو مەردم، هەر شتێك داوای بکا لە هەرکەس ناتوانێ دەست بنێ بە ڕوویەوە، هیچ دڕندەیەکیش زیانی پێ ناگەیەنێ.

✓ ئەگەر ئافرەتێك لە کاتی مناڵبوونا تووشی ئازار ئەبوو مناڵەکەی لێ نەئەبووەوە پەڕێك لە پەڕی پیرۆزە لە ژێر خۆیا دانێ زوو مناڵەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ خزمەتی پیاوی گەورەو پادشاکانی ئەکرد ئێسکێك لە ئێسقانە گەورەکانی پیرۆزە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ئەو کەسە ئیتر هێمن ئەبێ لە زیانی ئەو پیاوە گەورەیەو خۆشەویستیش ئەبێ لەلای.

✓ ئەگەر یەکێ تووشی «نقرس» بوو لوولاقی پیرۆزە ببەستێ بە پاژنەی خۆیەوە چاك ئەبێتەوە. هی ڕاست بۆ ڕاست هی چەپ بۆ چەپ. «نقرس» دەردێکە ئەدا لە جومگەکانی پێ و پەنجەکانی دەست ئەستوور ئەبن و ژان ئەکەن.

✓ پەڕی پیرۆزە لە هەر ماڵێکا بسووتێنرێ جرجانەوەر لەو ماڵە نامێنێ و هەموو دەرئەپەڕن.

✓ جگەری پیرۆزە ئەگەر یەکێ بیهێنێ و بیسووتێنێ و خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ ئاودا بخواتەوە هێزێکی زۆری ئەبێ بۆ چوونە لای ژن.

✓ ئەگەر یەکێ دوو هێلکەی پیرۆزە بدا بە یەکاو بیانشکێنێ بە جۆرێ کە هەردووکیان تێکلاوی یەك ببن و پاشان بیدا لە دەعباکەی خۆی ئەوە هێزێکی زۆر سەیری ئەبێ بۆ چوونە لای ژن.

✓ یەکێ ئەگەر هات و چاوی ئاوی ئەکرد، زراوی پیرۆزە بێنێ بیکاتە ناو ئاوی ساردەوە، حەو ڕۆژ لەسەر یەك بیهێنێ بەچاویاو دەوروبەری چاویشی پێ بهەنوێ ئیتر چاك ئەبێتەوەو چاوی ئاو ناکا.

## تاووس



جوانترِ باڵندەیەك کە هەبێت تاووسە، بە ئەندازەی قازێك ئەبێ، تاووس لەناو پەلەوەرا وەکوو ئەسپ وایە لەناو چوارپێدا چۆن ئەم بەخۆی ئەنازێ و جوانە ئەویش ئاوایە، تاووس زۆر بەفیزەو شانازی بەجوانی خۆیەوە ئەکا، بە تایبە تی لەکاتێکا کە کلکی بڵاو ئەکاتەوە لەناو هەر پەڕێکیا چەند دائرەی ڕەنگاو ڕەنگ دروست ئەبێ کە چاو لە سەیرکردنی تێر نابێ، تاووس لەگەڵ ئەو جوانیەدا کە هەیەتی قاچەکانی ڕەشە کە سەیری قاچی خۆی ئەکا زۆر پێ تێك ئەچێ و چەترەکەی کلکی ئەنیشێتەوە، نێرینەی تاووس لە کاتێکا کە مێنەکە سەیری بکا ئەکەوێتە دنیایەکی ترەوە هەرچی جوانیەکی هەیە دەری ئەخا، کەم جووتە باڵندە هەیە وەکوو جووتەی تاووس وابن، نێرینەکە زۆر بە ئاشکرا دیارە کە گەمەو گاڵتە

لەگەڵ مێنەکەدا ئەکا، تاووس تا بیست و پێنج ساڵ عومر ئەکا، مێنەکە لە پاش سێ ساڵ دێتە هێلکە، ساڵێ دوانزە هێلکە ئەکا، وەنەبێ بە ڕێك و پێکیش هەر مانگێ هێلکەیەك بکا، جاری وا هەیە مانگی دوو هێلکە ئەکا، کاتی واش هەیە بە سێ مانگ هێلکەیەك ناکا، گەلێ جار نێرینەکە هێلکەکان ئەشکێنێ بۆ ئەوە نەوەك مێنەکە بچێتە سەری و ئەو گەمەو گاڵتەکەی لە دەست دەربچێ، لەبەر ئەمە هێلکەی تاووس ئەخەنە ژێر مریشك ئەمەش نابێ لە دوو هێلکە زیاتر بێ، مریشکەکەش بە سێ ڕۆژ هەڵیدێنێ، ئەبێ دان و ئاوی لەلاوە دانێن بۆ ئەوە لەسەری هەڵنەستێ، هەر هەڵساو هەوا لیێی دا هێلکەکان پیس ئەبن، لەگەڵ ئەمەشا ئەو هێلکە تاووسەی کە مریشك هەڵیدێنێ یا لە لەشا یا لە جوانیدا ناتەواوییەکی هەر تێدایەو وەکوو ئەوە نییە کە تاووسەکە خۆی هەڵیبێنێ. نێرینەکە کە مێنەکە هاتە هێلکە ئەو وەختە ئەو دەست بە خۆیا دێنێت و پەڕەکانی جوان ئەکا، وەنەبێ وەکوو کەڵەشێرو مریشك هەموو وەخت ئارەزووی سواربوون بکەن، بەڵکو کاتی سواربوونی نێرەکە لەسەر مێیەکە هەر وەختی بەهارانە، لە پاییزا پەڕەکانی هەڵئەوەرێ، لە بەهارا کە چرۆی دار دەستی پێ کرد ئەویش وردە وردە پەڕ دەر ئەکاتەوە، لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵە عومرەیا هەر ساڵێك بە ڕەنگێك ئەدرەوشێتەوە بە جۆرێکی وا کە ئینسان سەرسامە لەو هەموو ڕەنگە جوانانە کەلەو باڵندەدا هەیە. سەید حوسێنی حافز هەبوو لە سنە لە گەڕەکی جۆراوا، ئەمە تاووسی ڕائەگرت، لەگەڵ ئەوەشا کە چاوی نەیئەبینی بە جۆرێ خزمەتی ئەکردن هەرکە تاووسەکان گوێیان لە دەنگی ئەبوو هەڕایان ئەکرد بۆ لای و ئەویش دەستی ئەهێنا بەسەر پشتیانا، ئەمە شتێکی زۆر سەیرە. جوانی تاووس ئەوەیە کە بەچاو ببینرێ، سەید حوسێن چاوی نەبوو کەچی گەلێ لە چاوساغ ئاشناتر بوو بە تاووس، ئەیووت ئەوەی من بەچاوی دڵ ئەیبینم لە تاووس ئێوە نایبینن و ئەقڵتان پێ ناشکێ، هەموو ڕۆژێ پاش عەسر ئەیهێنانە سەربان دان و ئاوی ئەدانێ و یاری لەگەڵ ئەکردن، تەنانەت ئەیزانی نێرەکە چ وەختێ چاوی عەشقی بە مێیەکە ئەکەوێ و پەڕەکانی بڵاو ئەکاتەوەو یاری لەگەڵ ئەکا. من سەید حوسێن و تاووسەکانیم دیبوو، زەمان گەلێ پێچ و پەنای تیایە!!...

✓ ئەگەر زەهرێك کرابووە ناو خواردنێکەوە، وەیا خواردنێك زەهراوی بوو بوو، تاووس کە چاوی

بەو خواردنە کەوت وەیا بۆنی کرد دەست ئەکا بە خۆشی خۆشی و سەماکردن و باڵ بەیەکادان.

✓ ئەگەر بەجیقنەی تاووس بالووك بهەنوون بالووکەکە لائەچێ.

✓ یەکێ وشکەبیرۆی هەبێ ئێسکی تاووس بسووتێنێ و بیهاڕێتەوەو لێی بدا چاك ئەبێتەوە.

✓ تاووس لە هەر ماڵێکا هەبوو جرِوجانەوەر ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە.

✓ خوێنی تاووس هەرکە بیخواتەوە شێت ئەبێ.

✓ یەکێ زکی ژان بکاو چار نەکرێ بە ئەندازەی شەش یەکی مسقاڵێك لە زراوی تاووس تێکڵاو کا بە سکەنجەبین و بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە ئەم دەرمانە بۆ کەسێکیش کە زمانی گران بێ هەر باشە.

✓ خواردنی گۆشتی تاووس شەهوەت زیاد ئەکاو بۆ ژانی ئەژنۆش باشە.

✓ ئەعزایەك سەرما بیبا بە پیوی تاووس بهەنوورێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئێسکی تاووس بە هەرکەس بوو چاوکاری تێ ناکا.

✓ تاووس بوونی لە ماڵا بەدیوومە.

## تووتی



تووتی لە ڕیزی باڵندەکانایە بە ئەندازەی کۆترێك ئەبێ، باڵندەیەکی جوانە زۆرتر ئێستە کە هەبێ سەوزکارە، خوویەکی جوان و زەینێکی تەواوی هەیە، قسە ئەگێڕێتەوە وەکوو خۆی و ناشزانێ چی ئەڵێ، وەکوو چۆن ئادەمیزاد بە دەستی شت ئەخوا ئەویش بەو جۆرە بەقاچەکانی شت ئەبا بۆ دەمی و ئەیخوا، دەنووکێکی پان و زمانێکی پان و سەرێکی خڕی هەیە، ئاو ناخواتەوە ئەگەر بیخواتەوە ئەمرێ.

تووتی کە فێری قسەی ئەکەن ئەیهێنن هەر بە منالّ دایئەنێن و یەکێك ئەچێتە پشت ئاوێنەیەکەوە دەست ئەکا بە قسەکردن، تووتیەکەش لەناو ئاوێنەکەدا وێنەی خۆی ئەبینێ و کابرای لێوە دیار نییە وا ئەزانێ ئەوە یەکێکی‌ترە وەکوو خۆی قسە لەگەڵ ئەم

ئەکا ئەو چی ئەڵێ ئەمیش ئەیگێڕێتەوە بەم جۆرە فێری قسە ئەکرێ لە ئەنجاما هەر شتێك بوترێ ڕاست وەری ئەگرێ، من لە «خانە» تووتیەکم چاو پێ کەوت بە فارسی قسەی ئەکرد، لەلای سەرهەنگێك بوو، هەرکەس بچوایەتە ئەوێ ئەیووت: «آقا آمد». لە بەغداش یەکێکیترم دی لە ماڵێکا خەڵکی ئەناسی بە تایبەتی لەو گەڕەکەدا بوو جلی ئەبردەوە بۆ ماڵەکە، هەرکە ئەم بچوایە تووتیەکە ئەیووت: «اجا الاتوچی»!.

خەڵکی لەبەر ئەم قسەو باسەی ڕایئەگرن و خزمەتی ئەکەن.

✓ یەکێ زمانی تووتی بخوا زمان پاراوو بێترس ئەبێ لە قسەکردنا.

✓ ڕیقنەی تووتی وشك بکرێتەوەو بسوورێتەوەو لەگەڵ ئاوی بەرسیلەدا تێکڵاو بکرێ، یەکێ شەوکوێری هەبێ ئەمە بێنێ بە چاویا لای ئەبا.

## چەرخ



چەرخ یەکێکە لەو چوار مەلە تیژە ڕاوکەرانە کەڕاوی تەیرو تیوور ئەکەن، ئەوانەش چەرخ، شاهین، هەڵۆ و بازن، ئەم لەتەن و مەنی شاهێندایە بەڵام قاچەکانی گەلێ ئەستوورترن، لە وڵاتی کوێستانیدا نەبێ ناژی. کە ئەینێرن بۆ ڕاو لە ڕاوکردنا شێوەیەکی تایبەتی هەیە؛ بەرز ئەبێتەوە بە ئاسمانا، پۆلە مەلێك ئەبینێ، چەرخەیەك ئەکا بە دەوریانا، لەو چەرخەیەدا ئەو پۆلە هیچیان ناتوانن لەناو چەنبەری چەرخەکەدا دەرچن، دیسان چەرخەکە سوور ئەداتەوە بە دەوریانە، لە هەر چەرخەیەکدا ماوەیەك نزیکتر ئەبنەوە بە زەوی، تا لە ئەنجاما هەموویان ئەنیشنەوە ڕاوچییەکە ئەیانگرێ.

✓ ئەڵێین چەرخ زراوی نییە لەبەر ئەوە هەر دەستی ئینسانی لێ کەوت لە تاوانا ئەمرێ.

✓ مێشکی چەرخ یەکێ بیدا لە دەعباکەی خۆی ئارەزووی چوونە لای ژنی زۆر زۆر ئەبێ.

✓ یەکێ لەشی تووشی گەڕی و خوران ببێ مێشکی چەرخ بهێنێ و پێ بهەنووی چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ ڕەنگی پێستی دەموچاوی گۆڕاو ڕەنگی تێك چوو و ڕەش هەڵگەڕا بە مێشکی چەرخ بیهەنوێ چاك ئەبێتەوە، هەروەها لەشیش.

## چۆلەکە



چۆلەکە باڵندەیەکی هاروهاجە، گۆشتیش ئەخواو دانیش ئەخوا، ترۆمی زۆرە بەڵام ئەوی بەناوبانگ بێ ئەوەیە کەوا لە ئاوەدانیدایە و ئێمە ئەیبینین، باوکەی چۆلەکە دیارە تۆزێ پەڕ وەکوو ڕیش لەژێر ملیەوەیە و لەگەڵ گوڵێکی سپیدا، چۆلەکە شوێنی هەر لە ئاوەدانیدایە، ئەگەر دێیەك چۆڵ ئەکرا ئەویش ئەڕوا کە ئاوەدان کرایەوە دێتەوە، هیچ باڵندەیەك بە ئەندازەی چۆلەکە دڵسۆز نییە بۆ بێچووی، هەر لەبەر دڵسۆزیە بۆ ئەوان بۆیە هەر لە گوێسەبانەدا هێلانە ئەکا، کە ئەنیشێتەوە سێ چرنووکەکەی لەپێشا دائەنێ و پاشان ئەوی چوارەم کە لە دواوەیە دایئەنێ، پەلەوەرەکانی‌تر وا نین لەپێشا دووی دائەنێن و ئەمجا دووەکەی‌تر دائەنێن، لەبەر ئەمەیە بۆیە نازانێ بچێ بە ڕێگاداو هەر باز ئەدا.

هیچ گیانلەبەرێك بە ئەندازەی چۆلەکە ناپەڕێ لەوانەیە لە سەعاتێکا سەد جار بپەڕێ، هەر لەبەر ئەمەیە کە عومری کەمە، لاشەی چۆلەکەی مردارەوەبوو بە دەگمەن نەبێ نەبینراوە، لەگەڵ کەرا دوژمنایەتی لە بەینیانا هەیە ئەویش لەبەر ئەوەیە کەر کە لەشی ئەخورێ زیاتر خۆی دێنێ بۆ شکانی خورەکەی بەو دڕك و داڵانەدا کە چۆلەکەی تێ‌ئەچێ و لەو ئێشەی ئەو چۆلەکە کە بەرئەکەوێ و مردار ئەبێتەوە، کە کەر ئەزەڕێنێ لەوانەیە بێچووی چۆلەکە لەهێلانەکەی بکەوێتە خوارەوە وەیا هێلکەکانی پیس ببێ لەبەر ئەمە چۆلەکە کە کەری چاوپێ کەوت بەسەر سەرو چاویا هەڵئەفڕێ و سەری لێ تێك ئەدا، چۆلەکە کەبەچکەکانی هاتە فڕین بە ئاشکرا ئەزانرێ ئەوا قسەیان لەگەڵ ئەکاو فێری فڕینیان ئەکا، لەگەڵ ماردا زۆر دوژمنن، مار فێرە بە خواردنی بێچووی چۆلەکە، چۆلەکە کەماری چاو پێ کەوت دەست ئەکا بە جرووکە جرووك و هەچ چۆلەکەیەك لەو دەورەدا هەبێ لێی کۆ ئەبنەوە دەورە ئەدەن لە مارەکەو بە دەنووك

بریندارى ئەکەن پاشان مێرووله ئەداته شوێن برینەکەو له ئەنجاما مارەکە ئەتۆپێ.

✓ جیقنەی چۆلەکە لەگەڵ لیکی ئینسانا تێکڵاو بکرێ و بدرێ له بالووك نامێنێ.

✓ خواردنی گۆشتی چۆلەکە بەبرژاوی بۆ نەمانی بەرد له میزڵدان و گورچیله باشه.

✓ خوێنی چۆلەکـه لەگەڵ ئاردی نیسـکدا تێکڵاو بکرێ، یەکێ دەعباکەی خۆی بەوە بهەنوێ بەڵام پێ نەنێته سەر ئەرز شەهوەتێکی زۆر زۆر پەیدا ئەکاو فره ئەچێته لای ژن.

✓ گۆشتی چۆلەکە جگە لەوە خواردنەکەی خۆشه ئارەزووی چوونه لای ژنیش زیاد ئەکاو بەهێز ئەبێ.

✓ یەکێ پەردە لەسەر چاوی هەبوو ڕیقنەی چۆلەکە بهێنێ بە چاویا پەردەکە نامێنێ.

✓ هێلکەی چۆلەکە یەکێ بە کاڵی بیخوا زۆر ئەچێته لای ژن.

✓ خواردنی چۆلەکە، خواردنی فستق، خواردنی گوێز هێزی چوونه لای ئافرەت زیاد ئەکەن.

## حوشتر مورغ



حوشـتر مـورغ باڵندەیەکـی زلی سـەیرە؛ لـه لایەکەوە حوشترە، لەلایەکەوە پەلەوەرە. ملی درێژ و قاچ و قول و سـمی لـه هـی حوشـتر ئەکا، دەنـووك و باڵ و پەڕی له پەلەوەر ئەکا، بەجۆرێکی تێکڕایی له نەوعی پەلەوەرە، پەڕەکەی زۆر جوانە، بۆ بێهۆشی و سرکی بەناو بانگە، مێشکی نییە، گوێچکەی نییە، لوولاقەکانی مۆخی تێدا نییە، هێزی بۆنکردنی زۆر تیژە، ئەم بۆنکردنەی ناتەواوی بیستنی بۆ پڕ ئەکاتەوە، جیقڵدانەی بەرد ئەتوێنێتەوە، پشـکۆی ئاگر قووت ئەداو هیچی لێ نایـه، ئـاو ناخواتـەوە، وا دیارە ناو زکـی حوشـتر مـورغ عامله بـۆ کوژاندنەوەی ئاگر نـەوەك ئاگر عامـل بـێ بـۆ سـووتانی ناوسـکی ئـەو. کـه بیـەوێ بـڕوا باڵەکانی شـۆڕ ئەکاتەوە بـۆ لای پێ و دەست ئەکا بە هەڕاکردن هیچ حەیوانێك نایگاتێ، ڕووەو با چاکتر هەڕا ئەکا تا پشتەوبا، که هاوین هات ڕەنگی سوور هەڵئەگەڕێ، زۆر بێ فیکریشه هێلکەی خۆی ون ئەکا، که ڕاوچی ڕاوی ئـەکا سـەری خـۆی ئـەکا بـە ژێر لمـەوە ئیتـر وائەزانێ کـەس نایبینێ، که لـه قاچەکانی

پەکی کەوت ئیتر نارِواو نافرِیّ تا بەو جۆرە بۆ خۆی لە برسانا ئەمریّ. کە هێلکە ئەکا بیست وەیا زیاتر لە بیست هێلکە ئەکا، بە جۆرێك رِیزیان ئەکا بە درێژی بە موو زیادو کەمیان نییە، ئەم هێلکانەی ئەکا بەسیّ بەشەوە؛ بەشێکی ئەکا بەژێر خۆڵەوە، بەشێکی ئەخاتە بەرهەتاو، بەشەکەی‌تری کرِ ئەکەویّ بەسەریا، کە بێچووەکانی دەرچوون ئەو بەشەی کە خستونیە بەر هەتاو و تا ئەندازەیەك تواونەتەوە ئەیانشکێنیّ و ئەیاندا بە بەچکەکانی، کە بێچو تۆزیّ گەورەتر بوون ئەو بەشەی کە کردوویەتە ژێر خاکەکەوە دەریان ئەهێنیّ کونیان ئەکا مێش و مێشوولەو مێروولەو شتەی کۆ ئەبێتەوە بەچکەکانی ئەوانە ئەخۆن، بەم جۆرە گەورەیان ئەکا تا خۆیان ئەکەونە سەر پیّ و ئەرِۆن و شت بۆ خۆیان پەیدا ئەکەن.

قسەیەك هەیە ئەڵیّ بە حوشترمورغیان وت وەرە بار هەڵگرە وتی من پەلەوەرم، پیان وت وەرە دان بخۆ وتی من حوشترم!

✔ یەکیّ تاریکایی بەسەر چاویەوە بوو زراوی حوشترمورغ بینیّ بەچاویا تاریکاییەکەی نامێنیّ.

✔ یەکیّ ئەگەر لەشی خوررووی تێدابیّ وەیا بۆنی ناخۆشی لیّ بیّ واتە بۆن کلێشەی هەبیّ، وەیا بالووك لە لەشیا بیّ دەوام بکا لەسەر خواردنی گۆشتی حوشترمورغ هەمووی لەکۆڵ ئەکەویّ.

✔ یەکیّ لەشی تازە ئاوسابوو بە پیوی حوشترمورغ بیهەنویّ چاك ئەبێتەوە نامێنیّ.

✔ توێکڵی هێلکەی حوشترمورغ زوو ئەکۆڵیّ بەپێچەوانەی توێکڵی هێلکەی باڵندەی‌تر ئەو قەت ناکولّیّ.



## سەوزەکەوا

سەوزەکەوا مەلێکە بە عەرەبی پیّ ئەڵێین «شقراق».

سەوز کارە بەئەندازەی کۆترێك ئەبیّ، سەوزییەکەی زۆر جوانە رِەشایی لە باڵەکانیا هەیە، گەلێکیان خەت خەتن بەخەتی سوورو سەوزو رِەش، گەرمیان وکوێستان ئەکا، زۆر خۆی ئەپارێزیّ لە ئینسان، زۆرتر لە دەشت و لەسەر کێوەکان ئەبیّ، بەڵام لە ئاوەدانیا هێلکە ئەکا،

هێلانەکەی زۆر بۆگەنە، هاوار هاواری زۆر ئەکا، مێملی هێلکەی تەیرو تیووریترە. بەدیومیشە، زۆر دوژمنی هەنگە ئەوی ئەیخوا ئەوی نایخوا ئەیکوژێ.

✓ ئەگەر ئاڵتوونێك عیارەکەی کەم بێ زراوی سەوزەکەوا بتوێنرێتەوەو بکرێتە ملیا ئاڵتوونەکە سوور هەڵئەگرێ و عیارەکەی زیاد ئەکا.

✓ ئەگەر زراوی سەوزەکەوا بدرێ لە موو ڕەشی ئەکاتەوە.



## شەمشەمەکوێرە

شەمشەمەکوێرە دەعبا وەیا پەلەوەرێکی سەیرە، لە هەموو حەیوانێکی وەرگرتووە، وەکوو دروستکراوێکی بازاڕی بێ وایە: دانی هەیە، دوو گوێچکەی قوتی هەیە، دەنووکی هەیە، چوار قاچی هەیە، مەمکی هەیە، نێرەکەیان هێلکەگونی هەیە، وەکوو ئافرەت حەیزی پیادێت، وەکوو بەنیئادەم پێ ئەکەنێ، وەکوو چوارپێ میز ئەکا، شیر ئەدا بە بێچووەکانی، پەڕی نییە ئەفڕێ، باڵەکانی لەوێنەی لاستیکێکی تەنك و وەکوو تەلی چەتر خرێنچکەیەکی مەیلەو ڕەقی کەوتۆتە بەینی پەڕەی باڵەکانیەوە، زۆریش ئەژیت، بێچووەکانی لە ژێر باڵەکانیا لەگەڵ خۆی ئەگێڕێ، هەندێ جار بەدەم هەڵیان ئەگرێ، لە بەینی سێ تا حەوت بەچکەی ئەبێ، هەر بە هەواوە شیر ئەدا بە بێچووەکانی، زۆریش بێئەقڵە - زۆر تیژە لە فڕینا، کە دنیا دەستی کرد بەتاریك بوون دێتە دەرەوە دەست ئەکا بە مێش و مێشوولە خواردن، ڕێختی باڵەکانی بەجۆرێکن لە کاتی فڕینا هەواکە ناجووڵێتەوە تا مێش و مێشوولەکە سڵی لێ بکەنەوەو خۆیانی لێ بپارێزن، هەر بەهەواوە نێرو مێ کە جووت ئەبن، کە کەوت لە گەڵای دار چنار لەوانەیە بێهۆش ببێ و بمرێ، لە حەیواناتا تەنها ئینسان و مەیموون و شەمشەمەکوێرە بەچکەی خۆیان بە بێیارمەتی دەم هەڵئەگرن، هەموو باڵندەیەك پێی ئەوێرێ و ڕقیەتی لێی، ئەو باڵندەی گۆشتخۆر بێ ئەیخوا، ئەوەش کە گۆشتخۆر نەبێ ئەیکوژێ، لەبەر ئەمەیە کە هەر بەشەو ئەفڕێ، لەبەر ئەمەیەو لەبەر

ئەوەشە کە بە ڕۆژ چاوی نابینێ، زرتەشی دێ بەڵام هیچ. کە دنیاش زۆر تاریك بوو ئیتر ناگەڕێ، زۆرتر شوێنی لە ئەشکەوتەکانایە، کە لە ئاوەدانیشا بۆ هێلانەکردن خۆی بۆ ئەو شوێنانە ئەکوتی کە کەمتر ڕێبازە.

✓ یەکێ سەری شەمشەمەکوێرە بخاتە ناو سەرینێك و سەری لەسەر دانێ خەوی لێ ناکەوێ.

✓ لە ماڵێکا شەمشەمەکوێرە سەر ببڕێ و دڵەکەی لەو ماڵەدا هەڵبواسرێ مارو دووپشك ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە.

✓ یەکێ ئەگەر ملی شەمشەمەکوێرە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ دووپشك توخنی ئەو کەسە ناکەوێ.

✓ ئافرەتێك ئەگەر بە گران مناڵەکەی لێ ئەبووەوە بەزراوی شەمشەمەکوێرە شەرمگای بهەنوون زوو مناڵەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ مووی بنەنگڵی هەڵبکەنێ پاشان خوێنی شەمشەمەکوێرە بێنێ بە ئەندازەی خوێنەکە شیری تێکڵاو کاو شوێنەکەی پێ بهەنوێ ئیتر مووی لێ نایەتەوە، ئەمە بۆ بەریش هەروایە.

✓ خوێنی شەمشەمەکوێرە بهێنرێ لەگەڵ بە ئەندازەی خۆی شیری تێکڵاو بکرێ و بسوێ بە بەری ئەو مناڵانەدا کە هێشتا تووکەبەریان نەهاتووە ئیتر تووکی نایەت.

✓ سەری شەمشەمەکوێرە لەگەڵ ڕۆنی یاسەمەندا لەناو مەنجەڵێکی مس وەیا ئاسندا بکوڵێنرێ هەتا بە تەواوی سەرەکە دائەرزێ و ئەبێ بە مەعجوون، پاشان ئەگەر یەکێ شەلەل وەیا ئاوساوی هەبێ لێ بنرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ هەر زەوییەك بە ڕیقنەی شەمشەمەکوێرە کووت بدرێ ئەو زەوییە زۆر بە هێزو بەرهەمێکی باش ئەبێ.

✓ ئەگەر شەمشەمەکوێرەی بچووك بکوڵێنن بە جۆرێکی وا کە هەتا دائەرزێ و پاشان بدرێ لە کونی گون ئەو کەسە ئەمین ئەبێ لە میزگیران.



## سیسارگەکەچەڵە

سیسارگەکەچەڵە باڵندەیەکە لە وێنەی پیرۆزە بە ڕەوشتا، زۆر جار هەریەك هێلکە ئەکا، بۆ ئەو هێلکەیەش ئەچێتە شوێنە هەرە سەختە شاخ و داخەکان بۆ ئەوە کەس نەیگاتێ، زۆر بە گرانیش ئەو هێلکەیە ئەکا، کەکاتی هێلکەکردنەکەی هات ئەچێ بەردێك هەیە لە وڵاتی هێند ئەیهێنێ، ئەو بەردە خڕە کە بیشەکێنێتەوە خڕەی لێوە دێ وەکوو بەردێکیتر لەناویابێ، جا ئەو بەردە لەژێر خۆی دائەنێ و بە ئاسانی هێلکەکەی ئەکا، سیسارگەکەچەڵە زۆرتر ئەکەوێتە شوێن لەشکر بۆ ئەوە لەگۆشتی کوژراوەکانیان بخوا، ئەگەر لەشکری دەست نەکەوت ئەکەوێتە شوێن کاروان بۆ خواردنی تەرسی وڵاغەکانیان، هەروەها ئەکەوێتە شوێن حەیواناتی کێویش بە تەمای ئەوە ئەوان بەربخەن و ئەم بیخوا.

✓ یەکێ ئەگەر گوێی گران بوو زراوی سیسارگەکەچەڵە لەگەڵ ڕۆن زەیتدا بتکێنێتە گوێ گرانیەکەی نامێنێ.

✓ چاو کە سپی بوو زراوی سیسارگەکەچەڵەی پیا بێنن سپیایەتیەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ سێیەرۆی هەبوو خوێنی سیسارگەکەچەڵە بخواتەوە لە کۆڵی ئەکەوێ.

✓ خوێنی سیسارگەکەچەڵە لەگەڵ زەیبەقدا تێکڵاو بکرێ و یەکێ دەموچاوی خۆی پێ بهەنوێ لەلای پادشاهان بەڕێز ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ بێنێ ئێسقانی باڵی ڕاستی سیسارگەکەچەڵە بسووتێنێ و بیدا بە یەکێکیتر ئەو یەکە ئەوەندە ئەمی خۆش ئەوێ هەر نەبێتەوە، ئەگەر هی باڵی چەپی وا لێ بکاو بیداتێ ئەوەندە ڕقی لێ ئەبێتەوە هەر نەبێتەوە.

✓ ئەگەر ئافرەتێ بیەوێ سکەکەی بخا ڕیقنەی سیسارگەکەچەڵە بخوا.

✓ پەڕی سیسارگەکەچەڵە لەهەر ماڵێکا بسووتێنرێ مێش و مێشوولەو شتە لەو ماڵەدا نامێنێ.

✓ یەکێ بەڵەکی هەبێت ڕیقنەی سیسارگەکەچەڵە تێکڵاوی سرکەی شەراب بکاو

خۆی پێ بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ جەرگی سیسارگەکەچەڵە ببرژێنرێت و بیهاڕنەوە، یەکێ کە شێت بوو تا سێ ڕۆژ ڕۆژێ سێ جار تێکڵاو بە ئاو بکرێت و بیدرێتێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر ژنێ بە زەحمەت منالّی ئەبوو سەری سیسارگەکەچەڵەی پیا هەڵواسن ئیتر بە ئاسانی منالّەکەی ئەبێ.

✓ پێستێکی زەرد هەیە لەسەر جیقڵدانەی سیسارگەکەچەڵە، ئەگەر ئەو پێستە بهێنرێ وشك بکرێتەوەو بیهاڕنەوەو لەگەڵ هەنگوینا تێکڵاو بکرێ، یەکێ هەر جۆرە زەهرێك کاری تێکردبێ بیخوا زەهرەکە زیانی ناداتێ.

ئەگەر یەکێ ژانەسەری دائمی لەگەڵا هەبوو، سەری سیسارگەکەچەڵە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ژانە سەرەکەی نامێنێ.

## قاز



قاز پەلەوەرێکە زۆر حەز لە مەلەوانی ئەکا، ئەو شوێنانەکە جۆگەو ڕووباری لێ نەبێ قازکەمتر تیا ئەژی، بێچووی قاز هەر لە هێلکەکە دەرچوو خۆی ئەخاتە ناو ئاوو مەلەوانی ئەکا، قاز لەسەر هێلکەی خۆی نەبێ نانیشێ، یا نۆ هێلکە ئەخاتە ژێر خۆی یا یانزە ئەگەر زیاتر بوو فڕێی ئەدا، کەمێ کە کەوتە سەر هێلکەکان نێرەکە پاسەوانی ئەکاو بەهیچ جۆر لێی جیا نابێتەوە، لە ڕۆژی نۆزدەی مانگی عەرەبیدا ئەبێ هێلکەکانی هەڵێنێ ئەگەر هەڵێنەهێنان درێژە ئەکێشێ تا ئاخری مانگ.

✓ خواردنی زمانی قاز بۆ نەمانی میزەچۆرتکێ باشە.

✓ یەکێ پرخەپرخ لە لووتیا هەبێ زراوی قاز لەگەڵ ڕۆنی وەنەوشەدا تێکڵاو بکاو بیدا بە لووتیا پرخەپرخەکەی نامێنێ.

✓ دەست و قاچێ کە بە هۆی سەرماوە قەڵیشابێتەوە بە پیوی قاز بهەنووڕێ چاکی

ئەکاتەوە، هەروەها ئەم پیوی قازە بۆ لابردنی مووە ڕێزە - داء الثعلب - یش چاکە.

✓ خواردنی گۆشتی قاز ڕەنگی سەرو ڕوومەت جوان ئەکا.

✓ مێشکی قاز، خواردنی، ئینسان قەڵەو ئەکاتەوە، ڕەنگی جوان ئەکا، شەهوەتیشی زیاد ئەکا.

✓ یەکێ سێبەرۆی هەبێ چاوی چەپی قاز لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ لە کۆڵی ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر ئەندامەکانیشی ژان بکا بۆ نەمانی ئەو ژانەش باشە.

✓ خواردنی هێلکەی قاز شەهوەت زیاد ئەکا.

✓ ئەگەر یەکێ کۆکەوشکەی هەبێ ڕیقنەی قاز وشك بکاتەوەو بیهاڕێتەوەو بە کەفلەمە بیخوا بۆی باشە.

✓ بەردێك لەناو سکی قازدا هەیە یەکێ گرفتی کردبێ ئەو بەردە بهاڕێتەوە و بیخوا چاك ئەبێتەوە.

هەر چاکە و شتێك لە قازدا هەیە هەمان شت لە مراویشدا هەر چەشنی شتەو هیچ فەرقی نییە.



## قازی قوڵەنگ

قازی قوڵەنگ باڵندەیەکی گەورەیە، ملێکی درێژ و قاچێکی زۆر درێژی هەیە، قازی قوڵەنگ لەو تەیرانەیە کە بەبێ سەرۆك نایکرێ، زۆر سرك و سڵ کەرەوەو بە پارێزە، کاتێ کە ئەفڕن ڕیز ئەبەستن و لێك جیا نابنەوە، یەکێك لە پێشەوەیەو ئەوانیتر بە شوێنیا ئەڕۆن، کەسەرەی ئەو دوایی هات یەکێکیتر ئەو پێشەنگیە وەرئەگرێ، ئەمەش هەر بەسەرە، بەشەو یەکێك ئەبێ بە پاسەوان و بە دەوریانا ئەسوورێتەوە، ئەو پاسەوانە دەنگێکی باریکی وەکوو فیکەی لێوە دێت ئەوەیان تێ ئەگەیەنێ کە ئەو پاسەوانە، کە هەستی بە دوژمن کرد دەنگێکیتری لێوە دێت تێیان ئەگەیەنێ کەوا خەتەر پەیدا بوو، ئەم پاسەوانیەش

دیسان بە نۆبەیە، پاسەوانەکە لەسەر یەك پێ ڕائەوەستێ بۆ ئەوە خەوی لێ ناکەوێ، کە بەسەر زەویدا بڕۆن بە وردی و بەترسەوە ئەڕۆن، گەرمیان و کوێستان ئەکەن، هی واشیان هەیە هەر لە شوێنێکا ئەمێنێتەوەو ئەو گەرمیان و کوێستانە ناکا، بێچووەکانیان کە باوك و دایکەکانیان پیر بوون وازیان لێ دێنن و گوێیان نادەنێ.

✓ یەکێ ئەگەر چاوی قازی قوڵەنگ بکوتێ و بیهێنێ بە چاوی خۆیا خەوی لێ ناکەوێ.

✓ گۆشتی قازی قوڵەنگ بە پیوەکەیەوە بکوڵێنرێ جوان جوان، ئاوەکەی بکرێتە گوێچکەی ئەو کەسەوە کە گوێی گرانە چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ ئاو لە چاوی بێ زراوی قوڵەنگ بهێنێ بە چاویا چاوی ئیتر ئاو ناکا.

✓ یەکێ سپڵی هەبێ مێشکی قوڵەنگ لەگەڵ سرکەی پیازەخووگانە تێکڵاو بکرێ و ئەو کەسە لێی بخوا بۆ نەمانی سپڵەکەی باشە. بەڵام ئەمە لە حەماما.

✓ یەکێ گورچیلە وەیا میزڵدانی ژان بکا جیقڵدانەی قازی قوڵەنگ وشك بکاتەوەو بیهاڕێتەوە بە ئەندازەی مسقاڵ و نیوێکی لێ بخوا بۆ دەردەکەی باشە.

## قەلەباچکە



قەلەباچکە دوو ڕەنگە؛ ڕەشە و سپی، کلکێکی درێژی هەیە، لەژێر بن میچ و شتەدا هێلانە ناکا، کە هێلکە ئەکا گەڵای داری چنار دێنێ ئەیخاتە ناو هێلانەکەیەوە لە ترسی ئەوە نەوەك شەمشەمەکوێرە بێتە هێلانەکەیەوە چونکە کە ئەوهات هێلکەکانی پیس ئەبێ، لەگەڵ ئەوەشا زۆر کەرە زۆر جار هێلکەکانی خۆی ون ئەکاو ئەچێ بەسەر هێلکەی ترەوە ئەنیشێتەوە، تەبیعەتێکی پیسی هەیە، خائنە، دزە، جووتی خۆی بێ یا جووتی خۆی نەبێ سواری ئەبێ، بە تایبەتی لەهەر لایەك خشڵێکی بەرچاو بکەوێ بۆی ئەچێتە پارێزەوە بۆ دزینی ئەیبا و ئەیخاتە شوێنێکی‌تر گەمە و گاڵتەی پێ ئەکا، ئازۆخە پاشەکەوت ئەکا، حەز لە سەماش ئەکا.

✓ ئەگەر شوێنێ لە لەشی ئینسان سەرەتیر وەیا بە تایبەتی دەرزیەکی پیا چوو بوو چونکە دەرزی ئەگەڕێ لە لەشاو ئەچێتە ژوورەوە، مێشکی قەلەباچکە بخرێتە سەر لۆکەیەك و بنرێ لە شوێنەکە ڕایئەکیشێ و ئەیهێنێتە دەرەوە.

✓ خوێنی قەلەباچکە وشك بکرێتەوەو لەگەڵ گوڵاودا تێکلاو بکرێ هەرکەسێ بیخواتەوە زمانپاراوو قسەکەر ئەبێ.

✓ پیوی قەلەباچکە لەگەڵ شەکردا بدرێ بەمناڵ ئەو مناڵە زمان لووس و بەلێغ ئەبێ و شتیشی لەبیر ناچێتەوە.

✓ پەڕی قەلەباچکە بسووتێنرێ و خۆڵەکەی بکرێتە شارە مێروولەوە هەموویان هەڵدێن.

✓ یەکێ سپیایەتی لە چاویا هەبوو، مێشکی قەلەباچکە بێنێ لە پاش ئەوەکە لە حەمام دەرچوو دوو وەیا سێ جار بیهێنێ بەچاویا سپیایەتی لا ئەباو چاك ئەبێتەوە.

## قەلەڕەش



قەلەڕەش یەکێکە لە ترۆمەکانی قەل، شکڵەکەی ڕەش و بە لەشیش بچووکە، هەندێ لەو قەلەڕەشانە هەیە دەنووك و قاچیان سوورە، ئەمە ئەو قەلەڕەش وەیا قالاوە نییە کە زلە و لە هەزارساڵیش زیاتر عومر ئەکا. ئەم جۆرە قەلەڕەشە کە ئێمە ئەیڵێین گۆشتی ئەخورێت. هەرچی تەیر و تیوورە کە بەچکەکەیان گەورە بوو دەریان ئەکەن و ئیتر ناچن بەلایانا مەگەر قەلەڕەش نەبێ ئەم با بەچکەکانیشی گەورە ببن و بڕۆن هەر ئەگەڕێ بە شوێنیانا و دڵی بۆیان ئەسووتێ.

✓ هەر کە دەنووکی قەلەڕەش لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ چاو کاری تێ ناکا.

✓ ئەگەر یەکێ سپڵی قەلەڕەش لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ شەهوەتی زۆر زۆر ئەجووڵێ.

✓ خوێنی قەلەڕەش وشك بکرێتەوە، یەکێ کە مایەسیری هەیە بیئاخنێتە ناو مایەسیریەکەی چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ ئەگەر نوشتەو جادووی لێ کرابو بە زراوی قەلەڕەش خۆی بهەنوێ ئەو نوشتەو جادوویە ئیتر کاری تێ ناکا.

✓ قەلەڕەشێکی زۆر ڕەش بە پەڕەکەیەوە بکرێ بە سرکەدا، ئەو سرکەیە بدرێ لەموو، ڕەش ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر منالێك کۆکەی بوو وە لێی پیر کردبوو، ڕیقنەی قەلی ئەبلەق -واتە ڕەش و سپی - بکرێتە ناو پەڕۆیەك و ئەو پەڕۆیە بە منالەکەدا هەلبواسرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ تێنووی بێ زمانی قەلەڕەش وشك بکاتەوەو بیخوا تێنوێتیەکەی ئەشکێ.

✓ دلی قەلەڕەش وشك بکرێتەوەو بکوترێ و بکرێتە ناو ئاو، ئەو کەسەی لە کارواندایە بیخواتەوە تێنوی نابێ.

✓ زراوی قەلە ڕەش لەگەل زراوی کەلەشێردا تێکلاو بکرێ، یەکێ شەو کوێر بێ بێنێ بەچاویا شەوکوێرییەکەی نامێنێ، هەروەها ئەگەر ئەمەش بدرێ لە موو زۆر ڕەشی ئەکا.

✓ پیوی قەلەڕەش لەگەل ڕۆنی گولدا تێکلاو بکرێ، یەکێ بیدا لە ناوچەوانی، بچێتە لای هەرکەسێك بۆ هەر ئیشێك بۆی جێ بەجێ ئەبێ و دەست نانێ بەڕوویەوە.

✓ ڕیقنەی قەلەڕەش لەگەل سرکەدا تێکلاو بکرێ، یەکێ سپلی هەبێ لێی بدا چاك ئەبێتەوە.

## قەتێ



قەتێ مەلێکی جوانکەلەی زیرەکە، دەنگەکەی بەدەنگێکی پیرۆز و بەبووم ئەزانرێ، زیرەکییەکەی ئەوەیە لەو دەشتی چۆل و هۆلەدا هێلکە ئەکا و بە جێی دێلێ، لە پاش چەند ڕۆژ بە بێ سەرلێ تێکچوون دێتەوە سەری، بە شەو نانوێ، دێتە سەر ڕێگاکان بۆ ئەوە یاس و خواسێك لە ڕێبوارەکانەوە وەر بگرێ، هێلانە لە هێلانەی قەتێ جوانتر کەم هەیە کە لەناو پووشا ئەیکا و خاك و خۆلی لێ دوور ئەخاتەوە، گۆشتیشی بە لەزەتە.

✓ یەکێ مووڕێژە ـ داء الثعلبی ـ هەبێ بە خوێنی قەتێ خۆی بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ ئیسقا وەیا جەرگی نەخۆشی هەبێ گۆشتی قەتێ بخوا بۆی باشە.

✓ یەکێ بیەوێ شوێنێکی مووی لێ بێت ئێسکی قەتێ بسووتێنێ خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ ڕۆنی زەیتوون تێکڵاو بکاو بیدا لە شوێنەکە موویەکی زۆری لێ دێت.

✓ ئێسقانێك لە لەشی ئینسانا لەشوێنی خۆی ترازابوو بەناوزگی قەتێ بیهەنوون شوێنی خۆی ئەگرێتەوە.

✓ یەکێ بریـن لە چاویا هەبوو وەیا پەردەی بەسەرەوە بوو، زراوی قەتێ بێنێ بە چاویا چاك ئەبێتەوە.

✓ سەری قەتێ وشك بکرێتەوەو بخرێتە ناو پارچە کەتانێکی تازەوە، ببەسترێ بە ڕانی ژنی نووستووە وە ئەو ژنە چی کردبێ هەمووی ئەگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو زۆر قسەکانی تێکڵاو کرد ئەبێ خێرا لێی بکرێتەوە ئەگینە لەوانەیە لەوە زیاتر ببێتە هۆی عەقڵ تێك چوونی.

✓ ئەگەر یەکێ قەتێیەکی نێرو یەکێکی مێ بێنێ زکیان هەڵدڕێ، ناو زکەکانیان پێکەوە بکوڵێنێ و ڕۆنەکەیان بگرێت و بیکاتە ناو بەستووگەیەکەوە تا ماوەیەك، پاشان لەشی هەرکەسێ کە خۆی ئەیەوێ پێ بهەنوێ بەڵام ئەبێ کەسەکەیتر پێی نەزانێ، لەشی هەنووراوەکە کەسەکەیتری ئەوەندە خۆشی ئەوێ هەر لە حسابا نەیەت.



## قومری

قومری دەنگێکی خۆش و شکڵێکی جوانی هەیە، ئەگەر قومری نێرەکەی بمرێ ئیتر مێیەکەی ناچێتە لای نێرێکیتر، هەر ئەیلاوێنێتەوە هەتا خۆشی ئەمرێ، مێیەکەی هەر وایە، قومری و فاختە هەردووکیان ئەنیشن بەسەر هێلکەی یەکەوە، جرو جانەوەر هەڵدێن لە دەنگی قومری، زۆر شت لەشتی قومری هەر وەکوو کۆتر وایە لەباسی کۆتردا باسی ئەکرێ.



## کەڕەواڵە

کەڕەواڵە مەلێکی زۆر زل نییە، گۆشتەکەی لە بەینی گۆشتی مریشك و کەودایە، لە زستانا بەدرێژایی شەو بێدەنگە، کە دەمە دەمی بەهار هات لە دەمەو بەیانا دەست ئەکا بە هاوار هاوار، خواردنیشی گیایەکی زەهراوی هەیە ئەوەیە، تەنانەت ئەگەر باز تووشی ژانی جگەر بوو کەڕەواڵە ئەگرێ جگەرەکەی ئەخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ خواردنی گۆشتی کەڕەواڵە بەرد لە میزڵداندا لا ئەباو میز ڕەوان ئەکا.

✓ یەکێ گوێچکەی ژان بکا خوێنی کەڕەواڵەی تێ تکێنێ ژانەکەی ئەشکێ.

✓ ئەگەر یەکێ گرفت لە دڵیا هەبێ خۆی بگرێتە خواردنی گۆشتی کەڕەواڵە بە تایبەتی دڵەکەی، چاك ئەبێتەوە.

✓ ڕیقنەی کەڕەواڵە بهاڕڕێتەوەو بکرێ بەسەر برینی خۆرەدا چاکی ئەکاتەوە.

✓ سەری کەڕەواڵە لەهێلانەی کۆترو شارە کۆتردا دابنرێ جرو جانەوەر ڕووی تێ ناکا.



## کۆتر

کۆتر لەو مەلانەیە کە بەزیرەکی ناوی ئەبرێ، ترۆمی زۆرە، هیچ باڵندەیەك نییە بە ئەندازەی کۆتر پابەندی مەڵبەندی خۆی بێ، لە کاتێکا کە بەرز ئەبێتەوە بە پێچ‌پێچی ئەچێ بەئاسمانا بۆ ئەوە نیشانەیەك لە وڵاتی و شوێنەکەی خۆی بەدی بکا بۆ گەڕانەوە ئەگەر هەزار فرسەخ دوور بکەوێتەوە لە شوێنی خۆی هەر بۆی دێتەوەو ئەڵهای ئەکاتەوە، زۆر تیژە لە فڕینا، لەوانەیە بە ڕۆژێك سێ هەزار فرسەخ ببڕێ، لەبەر ئەمەیە بۆ نامەبردن بەکاریان هێناوە، زۆر جار ڕێ کەوتووە کە گیراوەو چەند ساڵێکی بەسەرا چووە لە ئەنجاما هەلی دەست

کەوتووە گەڕاوەتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، تا هەشت ساڵ عومر ئەکا، بۆ برسیەتی خۆی ئەگرێ بەڵام بۆ تێنویێتی هیچ خۆی ناگرێ. مەلە گۆشتخۆرەکان بەشوێنیان ئەگەڕێن، لە هیچیان ناترسێ وەکوو لە شاهێن ئەترسێ، لە ئاسمانەوە هەڵۆو واشەو شاهێن جیا ئەکاتەوە، هەرچەندە ئەم لەوان لە فڕینا خێراترە بەڵام بەتایبەتی کە شاهێنی چاو پێ کەوت ورە بەر ئەداو لە فڕینەکەی کەم ئەکاتەوە، وەکوو چۆن مەڕ گورگ و مشك و پشیلەی چاو پێ بکەوێ ئەمیش بەچاوی ئەوەوە وایە. گاڵتەکردنی نێرو مێی کۆتر زۆر سەیرە، لە کاتێکا کە نێرەکە سواری مێیەکە ئەبێ قاچی مێکە ئەکاتەوە لە پێش ئەوەدا گەلێ جار کڕنووشی بۆ ئەبا. کە نێرەکە سواری مێکە ئەبێ کلکی دێنێتەوە بەسەر مێکەدا بۆ ئەوە ئەو شوێنەی دەرنەکەوێ، کە عومری گەیشتە شەش مانگ وەکوو بڵێیت باڵغ ئەبێ، مێکە دوو هێلکە ئەکا، چواردە ڕۆژ بەسەریەوە ئەبن، مێکە هەر بە چل ڕۆژ جارێ دوو هێلکە ئەکا، بەینی هەردوو هێلکەکە شەوو ڕۆژێکە، نێرەکە ئەنیشێتە سەر هێلکەکە تا نیوەی ڕۆژەکەو باقی ڕۆژەکە مێکە ئەنیشێتە سەریەوە، شەویش هەروایە، ئەگەر مێیەکە لەبەر شتێك نەنیشتە سەر هێلکەکە، نێرەکە لێی ئەدا و بەزۆر ئەیخاتە سەری. مێیەکە خۆی جوان ئەکا بۆ نێرەکە، ئەو جووتە کە هەن تا یەکێکیان نەفەوتێ ئەویکەیان ناچێتە لای یەکێکی‌تر، گەلێ جار واش ئەبێ کە نێرێك دوو مێی ئەبێ، وەکوو پیاوێك دوو ژنی هەبێ، بەڵام نەبووە مێیێك دوو نێرەی هەبێ، نێرە کە هەست ئەکا بەوە کە گەرای هێلکە پەیدا بووە لەمێیەکەدا ئەکەوێتە کۆششی دروست‌کردنی هێلانەیەك کە بەشی خۆیان و بەچکەکانیان بکا، زۆرتر مێیەکە هێلکەکان ئەم دیو ئەو دیو ئەکا، کە بێچوو پەیدا بوو زۆرتر شت پێدانیان ئەکەوێتە ئەستۆی نێرەکە، کە بەچکەکە لە هێلکەکە دەرچوو فوو ئەکەن بە دەمیا بۆ ئەوە گەرووی فراوان ببێتەوە بەکەڵکی شت خواردن بێت، لە پێشا لیك ئەکەن بە دەمیانەوە، پاش ماوەیەك شتیان بۆ دێنن و بەو لیکە نەرمی ئەکەنەوەو ئەیاندەنێ خۆراکدانی کۆتر بە بەچکەکانیان نیشانەیەکی گەورەی بەزەیی پیاهاتنەوەیە، کۆتری دەشتەکی کە نەخۆش کەوت کولە ئەخوا چاك ئەبێتەوە، هی ماڵی گەڵای زەل و قامیش ئەخوا. یەکێ ئەگەر ڕەنگی کۆترێکی بەلاوە جوان بوو وە بیەوێ لەو ڕەنگەی هەبێ، ئەو کۆترە بێنێ لەنزیك جووتە

کۆترێکەوە داینێ، لەو کاتەدا نێرەکە سواری مێکە ئەبێ مێیەکە چاوی بکەوێ بەو کۆترە ئەو بەچکەیە کە ئەیانبێ لەو ڕەنگە دەر ئەچێ.

✓ ئەگەر یەکێ شوێنەکەی لە نزیکی هێلانە کۆتر وەیا شارە کۆترەوە بێ ئەو کەسە تووشی تەزووی لەش و ئیفلیجی و سەکتە نابێ.

✓ یەکێ چاوی بە خوێنی کۆتر بڕێژی بەڵام خوێنەکە هێشتا گەرم بێ و سارد نەبێتەوە ئەو برینانە کە تووشی چاو ئەبن ئەو کەسە تووشی ئەو برینانە نابێ و پەردە بەسەر چاویا ناکشێ.

✓ یەکێ ئەگەر تووشی میزگیران بوو جیقنەی کۆتری کێوی بهێنرێ بکرێتە ناو ئاوی گەرمەوە ئەو کەسە لەناو ئەو ئاوەدا دانیشێ لەو میزگیرانە ڕزگاری ئەبێ.

✓ یەکێ بەرد لە میزڵدانیا هەبوو بە ئەندازەی مسقاڵ و نیوێك لەجیقنەی کۆتری سوور لەگەڵ سێ مسقاڵ دارچینی تێکڵاو بکا بیخوا بەردەکەی نامێنێ.

✓ دووپشك دای بە یەکێکەوە، کۆترێك زك هەڵبدڕن بە گەرماو گەرمی بیخەنە سەری ژانەکەی ئەشکێنێ.

✓ ژنێك لەکاتی مناڵبووندا بە گران مناڵەکەی لێ ئەبووەوە مناڵەکە نەئەهات، جیقنەی کۆتری لەژێرا بسووتێنن و ئافرەتەکە خۆی بگرێ بە دووکەڵەیا هەر زوو مناڵەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ کۆتربازی بکا ئەبێ بە هەژاری بمرێ.

✓ زراوی کۆتری سپی بهێنرێ بەچاوا، شەوکوێری و پەردەیەك کە لەسەر چاوی بێ لای ئەبا.

✓ خوێنی بەچکە کۆتر بدرێ لە برین چاکی ئەکاتەوە، هەروەها هەر جێگایەك لە لەش کە کوترا بێ وەیا لێی درابێ و مۆر بووبێتەوە ئەو خوێنەی لێ بدرێ چاکی ئەکاتەوە.

✓ دەوامکردن لەسەر خواردنی گۆشتی کۆتر گێل گەوجی لائەباو زیرەکی دێنێ.

✓ برینێك کەدەمی کردبێتەوە ئێسقانی کۆتر بسووتێنن و پێوە بکەن چاکی ئەکاتەوەو ئەیهێنێتەوە یەك.

✓ ڕیقنەی کۆتری سوور بکرێ بە دمەڵەوە چاکی ئەکاتەوە.

## کەڵەشێر



کەڵەشێر لە هەموو مەلێك بەشەهوەتترە، زۆر بەخۆی ئەنازێ و شانازی بەخۆی ئەکا، شەو کورت بێ یا درێژ بێ قەت وەختی لێ تێك ناچێ و خەبەر بە بەیان ئەدا، یەکێ ئەگەر بەدەنگی کەڵەشێر خەبەری بێتەوە لەش گرانی نووستوێتی نامێنێ، لەکوردەواریدا بەتایبەتی لادێکان هەموو ماڵێ بۆ وەخت زانین کەڵەشێری هەیە، شێر لە دەنگی کەڵەشێری سپی هەڵدێ، کەڵەشێر مریشکی لە خۆی خۆشتر ئەوێ، دانەکە بە دەنووکی هەڵئەگرێ و بانگی مریشکەکە ئەکاو ئەیداتێ، بەیەك چاو سەیری هەموو مریشکەکانی ئەکا، بەڵام کە پیر بوو کۆششی ئەکەوێتە سەر نەفسی خۆی و دانەکە خۆی ئەیخوا، کە دوژمنێك رووی کردە مریشکەکانی ئەو لە پێشا پەلاماری ئەدا، بەشەو مریشکەکانی کۆ ئەکاتەوە لە کولانەکەداو ئەیانخاتە سەروی خۆیەوە و خۆی لەبەر کولانەکەدا ئەبێ و پاسەوانیان ئەکا، بەقسە کەڵەشێر لە عومری خۆی هێلکەیەکی پچووك ئەکا، کەڵەشێری چاك ئەوەیە پۆپەی زۆر سوور بێ، گەردنی ئەستوور بێ، چاوی تەنگ و ڕەش بێ، دەنگی بەرز بێ، چنگی تیژ بێ، ئەم کەڵەشێرە شەڕانییە، لەگەڵ ئەمانەشا بێ عەقڵیەکی هەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر لەسەر دیوارێك بکەوێتە خوارەوە ئیتر نازانێ ڕێ بەرێتەوە ماڵی خاوەنەکەی خۆی، ئەگەر کەڵەشێرێکی بێگانە بکەوێتە ناو چەند کەڵەشێرێك هەموویان سواری ئەبن وەکوو سواری مریشك بن!.

✓ پۆپەی کەلەشێر وشك بکرێتەوەو بیهاڕنەوەو بدرێ بەو کەسە کە میز ئەکاتە جێ تەرکی ئەکاو لە کۆڵی ئەکەوێ.

✓ پۆپەی کەڵەشێر سپی وەیا سوور بسووتێنرێ و دووکەڵەکەی بچێ بەسەر شێتدا بۆی چاکە.

✓ یەکێ پەردەو تاریکایی لە سەرچاویەوە بێ زراوی کەڵەشێر بێنێ بە چاویا بۆی باشە.

✓ یەکێ ئەگەر تووشی کەم فیکری و شت لە بیرچوونەوە بوو زراوی کەڵەشێری

سپی بخاتە ناو ئاو بیکوڵێنێ و ئەو ئاوە بخواتەوە ئەو دەردی شت لەبیرچوونەوەیە لەکۆڵ ئەکەوێ، بەڵام ئەبێ لەناشتا بیخواتەوە.

✓ ئێسکی باڵی کەڵەشێری سپی ئەگەر سوار پێی بێ ماندوو نابێ لە سواری.

✓ خوێنی کەڵەشێر لەگەڵ هەنگوین تێکلاو بکرێ و لەسەر ئاگر تۆزێ گەرم بکرێ، یەکێ بیخواو هەندێکیشی لێ بدا لە دەعباکەی شەهوەت و لەزەت زیاد ئەکا.

✓ یەکێ تووشی ژانەزگ بوو بێنێ گۆشتی کەڵەشێر لەگەڵ مازوو سماق هەموو بە ئەندازەی یەك تێکلاو بکاو بیکا بە مەعجوون و بە حەبی بچکوولەی وەکوو نیسك ئەمجا بەرە بەرە لێی قووت بدا ژانە زگەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ لەناو زگی کەڵەشێردا هەندێ بەردی بچووك هەیە شین کارو وەکوو ڕەنگی بلوور، ئەگەر لەو بەردە بکرێتە مل شێت ڕزگاری ئەبێ و چاك ئەبێتەوە بکرێتە مل غەیری شێت هێزی چوونە لای ژنی زۆر زیاد ئەکا.

✓ گونی کەڵەشێر بکرێتە مل کەڵەشێرێکی‌ترو ئەو کەڵەشێرە بکەوێتە شەڕەوە هیچ کەڵەشێرێکی‌تر بەسەریا زاڵ نابێ.

✓ یەکێ خوێنی کەڵەشێر بێنێ بە چاویا بۆ سپێنەی چاوی باشە.

✓ ئەگەر ناوچاوان و پۆپەی کەڵەشێر بە ڕۆن چەور بکرێ ئیتر ناخوێنێ.

✓ پەڕێکی زۆر درێژ هەیە بەسەر کلکی کەڵەشێرەوە، لە کاتێکا کە کەڵەشێرەکە ئەچێتە سەر مریشکەکەو پیا ئەتسێ لەو کاتەدا ئەو پەڕەی لێ هەڵکێشن و بیخەنە ناو ئاوەوە، هەرکەس بەو ئاوە مەلە بکا دەعباکەی هەڵئەستێ.

✓ ئەگەر شتێکی وەکوو مێش و مێشوولە دای بە شوێنێکی ئینسان خوێن وەیا مێشکی کەڵەشێر بدرێ لەو شوێنە چاك ئەبێتەوە.

✓ لە قەراخ باڵی کەڵەشێرەوە دوو ئێسکی گەورە هەیە ئەڵێن ئەگەر یەکێ دائم تای هەبوو ئێسکی باڵەڕاستەکەی هەڵبگرێ تایەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ ئەگەر سێبەڕۆی هەبێ ئێسکی باڵە چەپەکەی هەڵبگرێ سێبەڕۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.



## کوونەبەبوو

کوونەبەبوو زۆر جۆری هەیە، لە ڕاستیدا تەیرێکی جوانە، حەز بە وێرانە ئەکا، بە ڕۆژ دەرناکەوێ، بە شەو زۆر سەر بەرزە، بەشەو ڕێی کەوتە هێلانەی هەر مەلێك مەلەکە دەر ئەکا بەچکەکانی ئەخواو هێلکەکانی ئەشکێنێ، جا لەبەر ئەمە هەرچی تەیرو تیوورە ڕقیانە لێی ئەگەر بە ڕۆژ دەسیان کەوێ چاوی دەردێنن و هیچ پەڕی پێوە نایەڵن، لەبەر ئەم بەزمە نێچیرەوانەکان ئەیگرن و ئەیبەن لەکاتی ڕاوا لە شوێنی دیاریدا ئەیشارنەوە بۆ ئەوە بخوێنێ و تەیرو تیوور لەبەر ڕقبوونیان لێی لەو شوێنە کۆ ئەبنەوە، چاوی کوونەبەبوو زۆر زۆر جوانە، هەندێك ئەڵێن لەبەر ئەوە بە ڕۆژ دەرناکەوێ مەلەکانیتر هەموو ڕقیانە لێی لەبەر چاو جوانییەکەی دێن چاوی هەڵئەکۆڵن، زۆر دوژمنایەتییەکی تیژ هەیە لەگەڵ ڕەسەنی قەلەڕەشدا، زۆرتر بەسەر وێرانەوە ئەنیشێ، وا مەشهوورە کە بەدیۆمە، بەسەر هەر شوێنێکەوە خوێندی وێران ئەبێ، مار و ئەژدەها لە دەنگی هەڵدێن.

✓ کوونەبەبوو ئەگەر سەر ببڕێ چاوێکی هەروا بەکراوەیی ئەمێنێتەوەو چاوێکی ئەنووقێ، ئەو چاوەی کەکراوەتەوە ئەگەر یەکێ بیخاتە ژێر نقێمی ئەنگوسیلەکەی و هەڵی بگرێ تا ئەو ئەنگوسیلەیەی پێ بێ خەوی لێ ناکەوێ، ئەو چاوەکەی تریش ئەگەر بیخاتە ژێر نقێمی ئەنگوسیلەی تا پێی بێ خەوی لێ ئەکەوێ و خەبەری نابێتەوە. ئەگەر هاتو لێی تێك چوو نەیزانی کامیان هی خەبەریەکە و کامیان هی بێ خەبەرییەکەیە بیانهێنێ بیانخاتە ناو کاسە ئاوێکەوە، ئەوەیان کە کەوتە سەر ئاوەکە ئەوە هی بەخەبەریەکەیە، ئەوەشیان کە کەوتە بن ئاوەکە هی نووستوێتییەکەیە.

✓ ئەگەر دڵی کوونەبەبوو بنرێتە سەر دەستی چەپی ژنێك کە نووستووە، وەیا ببەسترێ بەو دەستەیەوە، ئەو ژنە لەم ڕۆژەدا چی کردووە هەمووی بە دەم خەوەوە ئەگێڕێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ زراوی کوونەبەبوو وەکوو کل بهێنێ بەچاویا تاریکایی لە چاویا نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ دڵی کوننەبەبوویەکی گەورە بهێنێت و بچێ بە تۆزێ لە پێستی گورگەوەو بیبەستێ بە باڵیەوە ئەو کەسە دز و هیچ حەیوانێك پێی ناوێرێ و لە کەسیش ناترسێ.

✓ ئەگەر یەکێ پیوی کوننەبەبوو بتوێنێتەوەو بیهێنێ بە چاویا، بە شەوی تاریك بچێتە هەر شوێنێك چاوی لەو شوێنەدا وەکوو ڕۆژ ئەبینێ و شوێنەکەی لەبەر چاو ڕووناك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ هەردوو چاوی کوننەبەبوو لەگەڵ میسکدا تێکڵاو بکاو لەگەڵ خۆیدا هەڵیبگرێ، هەرکەس بۆنی بکا خۆشی ئەوێ.

✓ زراوی کوننەبەبوو لەگەڵ خۆڵەمێشی دار بەڕوودا تێکڵاو بکرێ، ئەو کەسەی بەرد لەمیزڵدانیا هەیە بیخوا بەردەکە ورد ئەکا.

✓ یەکێ میز بکاتە جێ زراوی کوننەبەبوو لەگەڵ خۆڵەمێشی دارگەزدا تێکڵاو بکاو بیخوا تەرکی ئەکاو چاك ئەبێتەوە.

✓ کوننەبەبوو دوو هێلکە ئەکا، یەکێکیان موو دێنێ، یەکێکیان لای ئەبا، کەسێ بیەوێ جیایان بکاتەوە بیانشواو توێکیان بگرێتەوە، ئەوەیان کە بەلای ڕەشدا ئەڕوانێ موو دێنێ، ئەوەیان بەلای زەردیدا ئەڕوانێ موو لا ئەبا، جا ئەگەر یەکێ بیەوێ موو لە شوێنێکی بێ موو هێنەرەکەیانی لێ دا، وەیا ئەگەر بیەوێ مووی لێ نەیە ئەویکەیان بدا لەو شوێنە مووی لێ نایە ئیتر.



## کەو

کەو باڵندەیەکی جوانی خۆش گۆشتە، شوێنی لە کێوا ئەبێ، دەنووك و قاچی سوورە، لە کۆترێکی خرپن گەورەترە، تا پانزە ساڵ ئەژی، ماکەو تا بیست و پێنج هێلکە ئەکاو ئەو وەختە کڕ ئەکەوێ بە سەریا، نێرەکەو لەبەر ئەوە زۆر حەز لە پەڕین ئەکا هەموو دەم لە کۆششی ئەوەدایە ئەگەر هێلکەی دەستکەوێ ئەیشکێنێ، جا

لەبەر ئەمە ماکەوەکە ئەچێتە شوێنێك هێلکە ئەکا کە نێرەکەوەکە پێی نەزانێ، وەیا گەلێ جاریش ماکەوەکە لە دوو شوێن هێلکە ئەکا، لەشوێنێکیان خۆی کڕ ئەکەوێ بە سەریا، لە شوێنەکەی‌تر نێرە کەوەکە زانی ماکەوەکەی دەست ناکەوێ ئەنیشێ بە سەر ئەو بەشەیانەوە، بارەکان لە ئاخرا هەر شوێن دایکەکەیان ئەکەون، ماکەو هەوا دەنگی نێرەکەوی بگەیێنێتی ئەو هێلکانەی ئەکا تۆی تیا ئەبێ، نێرەکان زۆر تیژن لەسەر ماکەو، دوو نێرە کەو لەسەر ماکەوێك بوو بە شەڕیان کامیان زاڵ بوون ماکەوەکە شوێن ئەوەیان ئەکەوێ، هەروەها ئەگەر نێرەکان ماکەویان دەست نەکەوت و ماکەوەکان بە هۆی هێلکەکردن و کڕکەوتنەوە خۆیان ون کردبوو نێرەکان ئەبێ بەشەڕیان کامیان سەرکەوتن ئەوی‌کەیان شوێنی ئەکەوێ و بەهێزەکە سوار بێ‌هێزەکە ئەبێ، کەو دەنگی خۆشە، بەگەلێ جۆر دەنگی خۆی ئەگۆڕێ، کەو زۆر حەز لە دەنگی خۆش ئەکا ئەم حەزکردنەی گەلێ جار ئەبێتە هۆی ڕاوکردنی چونکە ڕاوچییەکان ئەم فێڵەشیان لێ ئەکەن بۆ ڕاوکردنیان، کە ڕاوچی شوێنی ئەکەوێ سەری خۆی ئەکا بە ژێر بەفرەوە وا تێ ئەگا لەبەر ئەوە خۆی چاوی لەخۆی نییە ڕاوچییەکەش چاوی لێ نییە. ماکەو ئەگەر هێلکەی خۆی نەما بنیشێتە سەریەوە ئەچێت ئەگەڕێ هێلانەی کەوی‌تر ئەدۆزێتەوە کە هێلکەی تیا بێ بە سەریەوە ئەنیشێت، لەبەر ئەو ڕقەبەریە لە نێو نێرەکەوەکانا هەیە ڕاوچی نێرەکەو ڕائەگرێ و ئەیبا بۆ ڕاو، ئەو نێرەکەوە بە هەموو جۆر دەنگی خۆی ئەگۆڕێ و کەوی‌تری لێ کۆ ئەبێتەوە، زۆر حەز لە دێوجامە ئەکا ڕاوچییەکان بە دێوجامە گەلێ جار ڕاوی ئەکەن، کوردەکان لە کاتی بەهارا بۆیان ئەچنە حەشار کە کەو سەرەوخوار ئەبێتەوە ڕاویان ئەکەن، بارەکەو هەرکە لەهێلکەکە هاتە دەرەوە ئەفرێ، بارەکەو ئەوەندە تیژە وەکوو بەردێك وایە لە قۆچەقانێ دەرچێ، یەکێك ئەگەر لە دەشتا تووشی دایکەیەك بوو بە بارەکانیەوە، دایکەکە وا خۆی پیشان ئەدا کە ناتوانێ بفرێ و بێ‌هێزە، هەڵئەسێتەوەو ئەنیشێتەوە، کابرا شوێنی ئەکەوێ بەو تەمایە کە بیگرێ، بەم جۆرە تۆزێ خۆی لە بارەکانی دوور ئەخاتەوە، کابراش لای وایە ئەگەر ئەوی گرت بارەکان ئاسانە، ئەوەندە ئەزانێ کەو ئەدا لە شەقەی باڵ و ئەڕوا، کابراکە دێتەوە بەسەرەوەخت بارەکانەوە سەیر ئەکا دەنکیان نەماون. لە ڕاستیدا کەس نازانێ

چۆن خۆیان ون ئەکەن، کەو تەبێعەتی وایە لە شاخ و کێوا نێرە لەمایەکە ئەپەڕێ، کەو گوڵی قامیش ئەباتە هێلانەکەی بۆ دەفعی ئەو دوژمنانەی کە هەیەتی و خۆی ئەزانێ کامانەن وا سڵ لە گوڵی زەل و قامیش ئەکەنەوە. گەلێ جار بێچووەکان کە لە هێلکەکە دەر ئەچن ڕووتن بەڵام زوو تووك دێننەوە، لە کوێستانەکانا لەناو کورددا ڕاوەکەو زۆر باوەو کورد زۆر حەز لەگۆشتی کەو ئەکا، کەو لە پێش هەڵهێنانی هێلکەکانیا هێلکەکان ئەناسێ و ئەزانێ کامەیان ئەبێ بە نێرەو کامەیان ئەبێ بەمایە، ماکەو ئەگەر نێرەی دەست نەکەوت خۆی ئەپلکنێتەوە بە خۆڵەوە بەو خۆ پلکاندنەوەیە تۆی بۆ پەیدا ئەبێ بۆ هێلکەکانی و گەرا بۆ هێلکەی، کە دەنگی نێرەکەو بێت هێلکە ئەکا وەیا بەو بایە کە لە لایەن دەنگی نێرەکەوە بێت هێلکە ئەکاو تۆ ئەکەوێتە هێلکەیەوە.

✓ یەکێ تاریکایی بەسەر چاویەوە هەبێ بەزراوی کەو چاوی برێژێ تاریکاییەکە نامێنێ.

✓ زراوی کەو بکرێ بە وەکوو برنووتی ئەگەر یەکێ هەموو مانگێ جارێ ئەو برنووتیە بدا بە لووتیا زەین و چاوی زۆر تیژ ئەبێ، دەردی کەم فیکری ئەگەر هەیبێ نایمێنێ و ئیتر شتی لەبیر ناچێ.

✓ جەرگی کەو بە برژاوی بدرێ بە منداڵ تووشی فێ نایەت.

✓ خوێنی کەو بهێنرێ بە چاوا ئەو چاوە نە برینی لێ دێ وە نە پەردەی بەسەرا ئەکشێ.

✓ خواردنی گۆشتی کەو بۆ نەمانی ئیسقا باشەو شەهوەت زیاد ئەکا.

✓ بۆنکردنی پیوی نێرەکەو بۆ تووش نەبوون بە سەکتەی دڵ باشە.

✓ ئەگەر ئاردی جۆ تێکڵاو بە شەراب بکرێ لە ڕێبازگەی کەوا هەڵبرێژرێ کەوەکان ئەیخۆن سەرخۆش ئەبن، وایان لێ دێ بەدەست ئەگیرێن.

✓ ئەگەر یەکێ بە ئەندازەی نیو مسقاڵ لە جگەری کەو بخوا بە گەرمی ترس و لەرزێ کە لە تەبێعەتیا هەبێ نایمێنێ.

✓ هێلکەی کەو جوانترو باشترە لە هێلکەی مریشك بەڵام بۆ ئەو کەسانە کەوا بە خۆشی و بێ ئیشی ڕائەبوێرن نەوەك بۆ ئەو کەسانە کە ئیش کەرن.



## کۆلارە «الحداة»

کۆلارە ترۆمێکە لە ڕەسەنی قەلەڕەش و شتە، لە زۆر لە باڵندە درەکان ئەترسێ وەنەبێ ڕەوشتێکی بەرزی هەبێ، گەلێ جار قەلەڕەش هێلکەکانی ئەدزێ هێلکەی خۆی لەشوێنیان دائەنێ، کۆلارەکە ئەنیشێ هەڵیدێنێ، نێرەکە لەمە سەری سڕ ئەمێنێ چونکە لەخۆی ناکا، دەست ئەکا بە قرەقرو بە دەنووك بەر ئەبێتە مێیەکە تا ئەیکوژێ، کۆلارە کە نەخۆش کەوت پەڕی خۆی ئەخوا چاك ئەبێتەوە، کە شتێکی سووری چاو پێ کەوت ئەیفڕێنێ، هەندێك ئەڵێن کۆلارە ساڵێك ئەبێ بە داڵ و ساڵێك کۆلارەیە، کۆلارە دوو وەیا سێ هێلکە ئەکا، بە بیست ڕۆژ هەڵیاندێنێ، کە نێرەکە سواری مێیەکە ئەبێ مێیەکە دەست ئەکا بە قرە قڕ، گوایە ئەڵێن ئەمە بۆ ئەوەیە شایەت پەیدا ئەکا بۆ پاشەڕۆژ کە تەیرو تیوور بزانن ئەم بەچکانەی کە ئەیبێ لەهی ئەو نێرەیەو زۆڵ نییە، کۆلارە لەکاتی فڕینا لە هەواوە ڕائەوەستێ لەو تەیرانەش نییە کەشت ڕاو بکا بەڵکوو شتەکە ئەفڕێنێ، وە شتیش کە ئەفڕێنێ هەر لەلای ڕاستەوە ئەیفڕێنێ، واتە لە لای ڕاستی ئینسانەوە، کۆلارە با لەبرسانیشا بمرێ قەت پەلاماری بێچووی پەلەوەریتری دراوسێ نادا، کۆلارە کەڕە ئەگەر بەکەڵکی ڕاو پێکردن بهاتایە لە باز بەنرختر ئەبوو چونکە شێوەی فڕین و وەستانی لە ئاسمانەوە زۆر جوانە.

✔ زراوی کۆلارە لە سێبەرا وشك بکرێتەوەو بکرێتە ناو شووشەیەك، ئەگەر یەکێ دەعبایەکی وەکوو مارو دووپشك پێوەی‌دا لەوە بکرێتە سەر شوێنی پێوەدانەکەی، وە سێ میلیشی لێ بهێنرێ بە چاوا بەڵام بەپێچەوانە، واتە ئەگەر شوێنی پێوەدانەکە بەلای ڕاستیەوە بوو ئەو بیهێنێ بەچاوی چەپیا، ئەگەر بەلای چەپیەوە بوو بیهێنێ بەچاوی ڕاستیا ڕزگاری ئەبێ لە ئازاری ئەو پێوەدانە.

✔ ئەگەر زراوی کۆلارە بخرێتە کونی مارەوە، چی مار لەو کونەدا هەبێ هەمووی ئەتۆپێ.

✔ ئەگەر یەکێ تەنگەنەفەسی هەبوو خوێنی کۆلارە لەگەڵ تۆزێ میسك و هەندێ گوڵاوی تێکڵاو کاو لەناشتا بیخواتەوە ڕزگاری ئەبێ لە تەنگەنەفەسیەکەی.

✓ ئەگەر کۆلارە بە زینوێتی لە ماڵێکا هەڵواسن مارو دووپشك ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە.
✓ یەکێ زەهر کاری تێ کردبوو خوێنی کۆلارە بخواتەوە زەهرەکە ئیتر کاری تێ ناکا.
✓ ئێسقانی کۆلارە بسووتێنرێ و بیهاڕنەوەو بینێن لە دمەڵی زۆر خراپ ئەیگەیەنێ و دەرگای پێ ئەدا.



## گۆرەویلە

گۆرەویلە باڵندەیە کە لە قەد دار هێلانە ئەکا، بە ئەندازەی چۆلەکەیەکە، گۆشتی ئەخورێ، هێلانەکەی لە گوش و پووش وەك دەزوو دروست ئەکا و ئەیتەنێتەوە وەکوو گوێرەوێ، کە شەو داهات لەناو هێلانەکەیا هەر ئەسووڕێتەوە لەترسی ئەوە نەوەك بکەوێ وەیا شتێك بێت بیخوا، دەنگی وەکوو فیکە بکا وایە.

✓ یەکێ لەکاتی سەرخۆشیدا هەروا هۆریا بکات، گۆرەویلە بەچەقۆ سەر ببڕن و خوێنەکەی بدەنێ ئیتر قەت ئەو هەراو هۆریایە ناکا.
✓ ئەگەر منداڵێك بەدخولق بوو، زراوی گۆرەویلە بکوڵێنرێ و لەگەڵ شەکردا بیدرێتێ ئیتر بەدخولق نابێ و زۆر چاك ئەبێ.
✓ ئەگەر ئێسکی گۆرەویلە لەکاتێکا کە مانگ لەزیادیە هەڵبواسرێ بەمناڵا، ئەو مناڵە لەلای خەڵك خۆشەویست ئەبێ با زۆر ناشیرینیش بێ.



## لەقلەق

حاجی لەقلەق باڵندەیەکی زلی مل درێژی دەنووك درێژی قاچ درێژە، دوژمنی مارە، کە ماری دەستکەوێ ئەیبا بە ئاسمانا ئەیخانە خوارەوە ئەپرۆکی و بۆی دێتە خوارەوە ئەیخوا، حاجی لەقلەق لەئاوەدانی کە هێلانە بکا

لەشوێنی بەرزی وەکوو سەری مەنارەو گوێبانی بەرز ئەیکا، حاجی لەقلەق زۆر زیرەکە هێلانەیەکی لە گەرمیان و یەکێکی لە کوێستان هەیە، ئەگەر لە شوێنێك هەستی کرد ئەوا هەوا ئەگۆڕێ وەیا بەڵایەك دێت خێرا هەستی پێ ئەکاو ئەو شوێنە بەجێ دێڵێ با هێلکەشی هەبێ، ئەو هێلانەیە کە ئەیکا لەوانەیە هەرچەندە بەشووڵ ئەیکا بەتەشوێ بەزەحمەت تێك ئەدرێ، جرِوجانەوەر و مێش و شتە زۆر لە حاجی لەقلەق ئەترسن، ئەو شوێنەی ئەوی لێ بێ ئەوانی لێ نابن، حاجی لەقلەق کە لە ئاوەدانی نەبوو زۆرتر لە دارستانا ئەبێ، ئەو شوێنە ئەکەن بە شار، کە یەکێکیان دەستی کرد بە تەقەتەق هەموو دەستی پێ ئەکەن. ئەگەر لەقلەقێ هەستی کرد مێیەکەی خیانەتی کرد نێرەکە ئەچێ هەچ لەق لەقێك لەو وڵاتەدا هەبێ کۆیان ئەکاتەوە دێن بە دەنووك ئەو لەق لەقە پارچە پارچە ئەکەن.

✓ لەشی گول بە خوێنی بێچوو لەقلەق بهەنووری کەڵکی هەیە بۆی.

✓ ئەگەر بە ئەندازەی دانقێك لەمێشکی حاجی لەقلەق، وەلە «ئامیان ـ انفحە»ی کەروێشکیش بە ئەندازەی ئەو تێکڵاو بکرێ و لەسەر ئاگر پێکەوە بتوێنرێنەوە، هەر کەسێ ئەمە بەناوی هەرکەسێکەوە کە ئەیەوێ بیخوا، ئەو کەسە خۆشەویستی لەدڵیا چەسپ ئەبێ و زۆر دڵی پێوە بەند ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ ئێسقانی لەقلەق لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ خەم و هەمی نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر گلێنەی چاوی ڕاستی لەقلەقی پێ بێ خەوی لێ ناکەوێ، ئەگەر گلێنەی چاوی چەپی پێ بێ هەر ئەنوێ مەگەر لێی بکرێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی لەقلەقی پێ بێ بچێتە ناو ئاو مەلە بکا ناخنکێ با مەلەش نەزانێ.



## مریشك

باڵندەیەو باڵندەش نییە؛ باڵندەیە بە ناخێری گیانی. باڵ ئەگرێتەوە بەڵام باڵ گرتنەوەکەی هیچ نییە هەموو دە هەنگاو نابێ، باڵندەش نییەو چونکە هەر لە ئاوەدانیدایەو ئەگەر بچێتە

ناو باڵندەکان دەری ئەکەن، مریشك هەموو دڕندەیەك دەستی بکەوێ ئەیخوا وە ئەمیش چاوی بەوان بکەوێ ناترسێ بەڵام ئەگەر ئەم لەسەر دیوار وەیا دارێك بێ تەنانەت ئەگەر چەقەڵ بە بنیا تێپەڕێ لە ترسا خۆی فڕێ ئەداتە بەردەستی، مەسەلەی ئەم و چەقەڵ وەکوو مەسەلەی پشیلە و مشك و گورگ و مەڕ وایە، مریشك خەوی زۆر کەمەو لەنوستنیا زۆر سرکە، تەنانەت ئەڵێن نووستن و بە ئاگابوونەوەی بە ئەندازەی نەفەسێکە کە ئینسان ئەیدات و ئەیهێنێتەوە، وە ئەڵێن ئەمەش هەمووی لەترسایە، ئەگەر نەکرێتە کولانەوە لەسەر ئەرز نانوێ بەڵکوو یا ئەچێتە ناو تاقێکەوە، یا سەر لقەدارێك، یا شوێنێکی بەرز، هەر لەگەڵ ڕۆژ هاتە ئاوا بوون ئەو ترسی لێ ئەنیشێ و ڕوو ئەکاتە کولانەی نووستنی، جووچکەکەی کە لە هێلکەکە دەرئەچێ زۆر جوانە کەم باڵندە ئەوەندەی ئەو جوانە، تووکێکی نەرمی هەیە کەم تووك ئەوەندە جوانە، زۆر گورج و گۆڵ و هەڕاکەرە بەشوێن شتا، هەر دایکەکە قرتەی کرد هەموویان هەڕا ئەکەن بۆلای، لەپاش ئەمە هەتا گەورەتر ئەبێ ناشیرینتر ئەبێ، کەرتر ئەبێ و گەوجتر ئەبێ، هەر بەم جۆرە ئەم شتانەی لە زیادییە تا ئەگاتە پایەیەك کە لەوێدا ئیتر بەکەڵکی هیچیتر نایە یا سەربڕین، یا خوێندن، یا هێلکەکردن نەبێ، مریشك وەکوو ڕاوچیانی باڵندە گۆشت ئەخواو وەکوو تەیرو تیووریتریش دان ئەخواو لەخواردنی وردە نانا هاوبەشی ئینسانیش ئەکا، کەواتە گەلێ تەبیعەتی دژی یەکی تێدا هەیە ئەگەر هێلکە درێژ کۆلەو دەورو بەرەکەی باریکۆلە بوو، واتە ئەم سەرو ئەو سەرەکەی ئەوە ئەبێتە مریشك، ئەگەر خڕو ئەم لاو ئەولای پان بوو ئەبێتە کەڵەشێر. هێلکە ئەگەر بخرێتە ژێر پەینی گەرمیشەوە هەر هەڵدێت، مریشکی وا ئەبێت ڕۆژێ دووجار هێلکە ئەکا، مریشك ئەبێت هێلکەی دوو زەردێنەش ئەکا، مریشك هەمووساڵ هێلکە ئەکا تەنها دوو مانگی زستان نەبێ، بە دە ڕۆژ هێلکەکەی دروست ئەبێ لەسەرەتای گەرابوونیەوە تا دروستبوونی، کە ئەیکا زۆر نەرمە هەرکە هەوا لێی دا ڕەق ئەبێ، سپێنەکە شتێکە و زەردێنەکە شتێك، لەسپێنەکەو چاوو مێشك و سەری جووچکەکە دروست ئەبێ، پەردەیەکی تەنك بەمانەوە پێچراوە پێستی جووچکەکە دروست ئەکا، پەردەیەکیش بەزەردێنەکەوە پێچراوە ئەندامەکانیتری جووچکەکەی تیایە، بە تایبەتی ئەم پەردەیە وەکوو بۆڕییەیەکە لە وێنەی ناوکاو ئەبێتە

هۆی ئەوزاری خواردنی جووچکەکە لەهی زەردێنەکە، وەکوو چۆن مناڵ لە زکی ئافرەتا لە ڕێگەی ناوکەوە لە خوێنی حەیزی دایکەکە ئەبێتە مایەی خواردنی ئەمیش وایە، هەر مریشکێ کەڵەشێری نەبێ هێلکەکەی ئەوەندە مایەی بەکاری بەهێزی تێدا نییە وەکوو ئەو مریشکەی کە کەڵەشێری هەیە، هەروەها ئەم جۆرە هێلکانەی کە مریشکەکەی کەڵەشێری نییە مایەی تۆی تێدا نییە بۆ بوونی بە جووچك، هەروەها ئەو هێلکانەش کە سپێنەکەیان کەمتر ئەبێ چونکە بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە هێلکەیەك کە لەسەری مانگەوە تا پانزەو شانزەی مانگ مریشکەکە ئەیکا ئەمە زیاتر پڕترو زیاتر خاوەن تۆیە تا ئەو هێلکەیە کە مریشکەکە لە کەمبوونەوەی مانگەوە ئەیکا تا دوایی مانگ، واتە هەتا مانگ لە زیادیدا بێت هێلکەی ئەو ماوەیە پڕتر و پڕتۆوترە، کە مانگ دایە کورتی ئەمیش ئەو مادەیە کەم ئەکاتەوە. مریشك و کەڵەشێر لەناو هێلکەکەدا لەپاش دە ڕۆژ ئەزانرێ، ئەویش بەم جۆرە: بنەوە لە دەنووکی جووچکەکە ئەگەر جووڵایەوە ئەوە کەڵەشێرە، ئەگەر نەجووڵایەوە مریشکە. بە دەگمەن مریشکی وا ئەبێ کە وەکوو کەڵەشێر ئەخوێنێ و وەکوو ئەو شەڕ ئەکا جا ئەو جۆرە مریشکانە قولاپێك لە قاچی دەرئەچێ وەکوو قولاپی کەڵەشێر وا ئەبێ، گەلێ جار کە مریشك خۆی لەخاکا ئەگەوزێنێ ئەمە بۆی ئەبێ بەوە کە وەکوو کەڵەشێر تسابێ بەسەریا لە بارەی هێلکەکردنیەوە، ئەم هێلکانە لە خواردنا خۆشن بەڵام نابن بە جووچك چونکە تۆویان تێدا نییە، ئەگەر هاتو هەر لەسەر ئەم جۆرە هێلکەیەکی زۆری کردو لەو ماوەیەدا کەڵەشێرێك تسی بەسەریا هێلکەکان هەموو تۆویان تێ ئەکەوێ، مریشك کە بە کڕ کەوت و نیشتە سەر هێلکە لەو ماوەیەدا دەنگی هەوری گوێ لێ بوو هێلکەکان هەموو پیس ئەبن، مریشك کە کەوتە کڕ هەڵژەنرێ لە ئاوا لە کڕ ئەنیشێتەوە. مریشك کە پیر بوو زەردێنە لە هێلکەیا نامێنێ.

✓ ئەگەر مریشکێك لەگەڵ دەسەلك پیازی سپی و لوێچێك کونجی بێ توێکڵ بکوڵێنرێ هەتا بە تەواوی دائەڕزێ، پاشان بە گۆشت و ئاوەوە یەکێ بیخوا شەهوەت و هێزی چوونە لای ژنی زۆر زۆر ئەبێ.

✓ پیوی مریشك بدرێ لە قەڵشانی دەموچاوو دەست و پێ کە بە هۆی سەرماوە بووبێ چاکی ئەکاتەوە.

✔ چاوێ کە ئاوی لێ بێت زراوی مریشکی پیا بهێنرێ چاکی ئەکاتەوە.

✔ یەکێ میز بکاتە جێ، جێقڵدانەی مریشکی بۆ ببرژێنن و بیدەنێ بیخوا چاك ئەبێ.

✔ دەوامکردن لەسەر خواردنی گۆشتی مریشك مایەسیری دێنێ.

✔ هێلکەو ڕۆن کە بە نیمرۆ بکرێ و بخورێ بۆ زیادبوونی مایەی شەهوەت زۆر بە کەڵکە.

✔ هێلکە بە زستانان لە ناو کادا وە بە هاوینان لەناو کۆزەر - کۆزەر ئەوەیە کە گەنم لە بێژنگ ئەدەن و ئەو خەوش و خاڵە لە بێژنگەدا ئەمێنێتەوە - دا دابنرێ ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوەو خراب نابێ.

✔ ئەگەر یەکێ مار پێوە بدا مێشکی مریشك بخرێتە سەر شوێنەکەی ژارەکەی ئەکێشێ و ئازاری نامێنێ.

✔ لە جیقڵدانەی مریشکدا بەردێك هەیە ئەگەر یەکێ فێدار بوو ئەو بەردەی پێوە ببەستن فێیەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ. هەر ئەو بەردە ئەگەر بخرێتە ژوور سەری مناڵ خەوێکی هێمن ئەکا.

✔ جیقنەی مریشکی ڕەش هەڵبسورێ بە دەرگای هەرماڵێکەوە ئەو ماڵە ئاژاوەی تێ ئەکەوێ.

✔ ئەگەر پیاوێك لەگەڵ ژنەکەیا بوو بە شەڕو هەرای، سەری مریشکی ڕەش بخرێتە ناو گۆزەڵەیەکی تازەوەو لە ژێر ڕایەخی پیاوەکەدا دابنرێ هەر خێرا لەگەڵ ژنەکەیا ڕێك ئەکەوێتەوە.

✔ ئەگەر یەکێ هەر دوو چاوی مریشکێکی زۆر ڕەشی لەگەڵ هەر دوو چاوی پشیلەیەکی ڕەش‌دا پێکەوە وشکیان بکاتەوە و بیانهاڕێتەوەو پاشان بیهێنێ بە چاویا عالەمێکی ڕۆحانی ئەبینێ، داوای هەر باس و خواسێك لەو عالەما بکا پێی ئەڵێن.



## مێشەسی

مێشەسی باڵندەیەکی گەورەی گێل گەوجە، یەکێ لە بێ‌ئەقڵیەکەی ئەوەیە کە گەلێ جار ڕێگا ناباتەوە سەر هێلکەی خۆی و ئەچێ ئەنیشێ بەسەر هێلکەی ترەوەو بەهی خۆی

ئەزانێ و زۆر چاکیش بەخێوی ئەکا، لە فڕینا بەهێزو بە توانایە، ملێکی درێژی هەیە، دەنووکی تۆزێ پانە، ڕەنگی لە ڕەنگی خۆڵە مێشایە، لەو مەلانە نییە کە ڕاو بکا بەڵکوو هەر ڕاوی ئەکەن، لەگەڵ ئەمەشا چەکێکی زۆر سەیری هەیە لەکاتێکا کە تەیرە ڕاوکەرەکان بیانەوێ ڕاوی بکەن بەو چەکەی خۆی ئەپارێزێ، ئەویش ئەوەیە کە لە ناو ڕیخووڵەو دەوری قنگیەوە کیسەیەك هەیە ئەم کیسەیە دائیما پڕیەتی لە شتێکی تەڕی لینج، لە کاتێکا کە تەیرێکی وەکوو چەرخ و هەڵۆو ئەمانە بیانەوێ ڕاوی کەن ئەم لەگەڵیان بەرز و نزم ئەبێتەوە تا هەلی دەست ئەکەوێ، کە هەلی دەست کەوت ئەفیڕێنێ پیانا، ئەو مادەیە وایان لێ ئەکا وەکوو بیانبەسێتەوە وایە پاشان ئەم ئەچێ بە دەنووك هەموو پەڕەکانیان هەڵئەکێشێ و بەو جۆرە ئەیانکوژێ. مێشەسی ئەگەر بیگرن و تەیرێکیتر بخەنە لای، ئەمجا بێنن پەڕو باڵی تەیرەکەیتر لەبەر چاو ئەمەوە هەڵکێشن ئەم لە خەفەتا بۆخۆی ئەمرێ.

✓ هێلکەی مێشەسی خەنە چ ڕەنگێك ئەکا ئەویش وایە.

✓ بەردێك لە جیقڵدانەی مێشەسیدایە هەرکەس تا ئەو بەردەی پێ بێ شەیتانی نابێ. هەروەها ئەگەر یەکێ سکی بچێ کە ئەو بەردە هەڵبگرێ ئیتر سکی ناچێ.

✓ ئەگەر یەکێ خەوی زۆر بێ دڵی مێشەسی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ خەوەکەی کەم ئەبێتەوە.

✓ ئەو هێلکە مێشەسییە کە ئەگەر لە ئەنجاما مێشەسییە هەڵێنێ و بە مێشەسی نێر دەرچێ ئەگەر بدرێ لە موو ڕەشی ئەکاتەوەو تا ساڵێکیش ئەو ڕەشیەی لاناچێ. ئەمجا هێلکەکەش بەوەدا ئەزانرێ کە ئەمە لە ئەنجاما بە مێشەسی نێر دەرئەچێ یا مێ، بهێنرێ دەزوویەکی سپی بکرێ بە دەرزیەکەوە، دەرزیەکە لەم سەرەوە بکرێ بە هێلکەکەداو لەو سەرەوە ڕایکێشی دیارە دەزووەکەشی پێوە ڕائەکشرێ، ئەگەر دەزووەکە ڕەش هەڵگەڕا ئەوە ئەو هێلکەیە کە مێشەسی نێری تیا ئەبێ، ئەگەر ڕەش نەبوو هی مێیە.

## هەڵۆ



هەڵۆ وەیا شاهەڵۆ باڵندەیەکە لە ڕەسەنی پیرۆزەو سیسارگەکەچەڵە بەڵام ئەم بچووکترە، تەیرو تیوور و کەروێشك و ڕێوی ڕاو ئەکاو لە مەلە گۆشت خۆرەکانە، ئەو گیانلەبەرانە کە ئەیانگرێ پێش هەموو شتێ و زیاتر جەرگەکەیان ئەخوا چونکە ئەو نەخۆشیانە کە ئەو ئەیگرێ جەرگ ئەو حەیواناتە بۆی ئەبێ بە دەرمان، چرنووکی هەڵۆ نەشتەرێکی زۆر سەیرە بو هەڵدڕینی گورگ، کە دادێتەوە بۆ گورگ بەو قولاپەیەی گورگەکە وەکوو خەیار هەڵئەدڕێ، ڕەوشتی وایە ئەکەوێتە شوێن لەشکر بۆ خواردنی گۆشتی کوژراوەکەی، هەڵۆ قەت ناترسێ، کە سەیری کرد واشتێك هەیە بۆی شۆڕ ئەبێتەوە ئەگەر تەیری گۆشت خۆری ڕاوکەری‌تر لەسەر ئەو شتە بێ ناچار لەترسی ئەم واز دێنێ و شتەکە بەجێ دێڵێ، هەڵۆ لە دوو هێلکە زیاتر هەڵناهێنێ، ئەگەر هێلکەی زیاتری هەبێ فڕێی ئەدا، ئەمەش لەبەر دڵ ڕەقی خۆی و زۆر خواردنیەتی کە پێی بەخێو ناکرێ، کە پیر بوو بێچووەکانی بەخێوی ئەکەن، کە زۆر پیر بوو پەکی کەوت و لەبەر پیری چاوی کز بوو سەرەو ژوور ئەبێتەوە ڕووبەڕووی هەوا بۆ ئاسمان تا پەڕەکانی بێ‌هێزو پەرپووت ئەبن ئەمجا سەرەو خوار ئەبێتەوەو خۆی ئەکا بە کانیاوا پیریەکەی ئەڕواو هێزی بە تەواوی ئەگەڕێتەوە، عومری درێژە پشووی فڕینی زۆرە، هەڵۆ لە شوێنێکی پانی سەختی کێودا هێلانە ئەکا، لە شوێنێك هێلانە ئەکا ئەگەر بێچووەکەی تۆزێ پێ لە هێلانەکە بترازێ ئەخشێتە خوارەو تا داوێنی کێوەکە لەگەڵ ئەمەشا ئەو بێچووە تا گەورە ئەبێ بەهیچ جۆر ناترازێ لەو هێلانەیە وەکوو بڵێیت ئەزانێ ئەخزێت و ئەڕوا، هەروەها ئەو بێچوویە نیازی فڕین ناکا تا شاپەڕی باڵی بەتەواوی خۆی ئەگرێ.

✔ ئەگەر پەڕی هەڵۆ لەهەر ماڵێکا بسووتێنرێ هەر مارێك لەو ماڵەدا هەبێ ئەتۆپێ.

✔ یەکێ ئەگەر چاوی ئاو بکا وەیا پەردەی بەسەرا هاتبێ زراوی هەڵۆ بێنێ بە چاویا چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر ژنێك شیر لەمەمکیا وەستاو نەئەهات بێنێ زراوی هەڵۆی پیا بسوێ چاك ئەبێ و کونی مەمکی ئەکرێتەوە.

✓ جمگەکان کە ژان بکەن پیوی هەڵۆ لەگەڵ ڕۆنی زەیتوون تێکڵاو بکرێ و لێی بنرێ چاك ئەبنەوە.

✓ پیوی هەڵۆ لەگەڵ هەنگوین و گوژاڵك بنرێ لە ناسۆر چاکی ئەکاتەوە.

## هەنگ



هەنگ زۆر کەس لە زاناکان لە ڕیزی باڵندەکانا دایئانێ بەڵکوو ئەیخاتە ڕیزی جروجانەوەرەوە بەڵام لەبەر ئەو هەموو کەڵکە کە لەودایە پایەی ڕێزی هەر ئەبێ لە ڕێزی باڵندەکانا بێ، هەنگ باڵدارە بچکۆلەیەکی جوانە کە بەدەنگە نەپچڕە مووسیقادارەکەی پەڕەی گوێ ئەزرنگێنێتەوە وەکوو بەهەنگوینە شرینەکەی لەش ئەگەشێنێتەوە.

هەنگ جگە لەبەرهەم و کردەوەکەی خۆی دروستکراوێکی نازکی جوانە، سەرێکی خڕی درێژکۆڵەی هەیە، دواوەی وەکوو وێنەی کەلە شەکرە، ناوەڕاستەکەی باریکێکی چوار گۆشەیی و شەش گۆشەییە، لە ناوەڕاستی لە شەکەیەوە چوار قاچ و دوو دەستی هەیە بە ئەندازەی یەك وەکوو شکڵێکی شەش گۆشەیی کە لەسەر دایەرەیەك بێ. لەناو خۆیانا پادشایان هەیە کە بە ئەندازەی دوو هەنگ ئەبێ، ئەم پادشایە باووباپیری هەر پادشا بووە، پادشا لە شانەکە دەرناچێ چونکە ئەگەر دەرچوو هەموو هەنگەکان دەرئەچن و ئیش و کار بەتەواوی ڕائەوەستێ، ئەگەر پادشا مرد ئەبێ زوو، شا دابنێنەوە، ئەگەر خێرا دایئەنێتەوە ئیش و کار ڕائەوەستێ و هەموو هەنگەکان ئەمرن، نابێ دوو پادشا هەبێ، ئەگەر بە ڕێکەوت دوو پادشا هەبوو بەبێ ئەوە دووبەرەکانێ لەبەینی هەنگەکان پەیدا ببێ یەکێکیان ئەکوژن ئەیخەنە دەرەوەو ئەویتر ئیتر ئیش و فرمان ئەگرێتە دەست.

ئەم پادشایە هەموو فەرمانێك ئەكا بەسەر هەنگەكاناو كەسیان لەژێر فەرمانی دەرناچن، هەر هەنگێك بە ئەندازەی توانا و لێهاتووی ئیشی ئەداتێ، فەرمان ئەدا بە هەندێك شانەكە دروست بكا، بەهەندێكی تر كە هەنگوین بكا، ئەوی ئیشی لێ نەیەت فەرمان ئەدا بیكەنە دەرەوە، بە فەرمانی پادشا دەرگاوان لە بەردەمی ژوورەكەدا هەیە ئەگەر هەنگێك ویستی شتی پیس بێنێتە ژوورەوە دەرگاوانەكە نایەڵێ، واتە تەوزیمی ئەو قاپیوانە ئەوەیە كە نەیەڵێ شتی پیس و خراپ بهێنرێتە ناو دوو بەرەو شانەكەوە، هەنگە كە شوێنێكی شایانی چاو پێ كەوت بۆ خۆی لەپێشا لە موو خانوو دروست ئەكا، پاشا خانووی پادشا دروست ئەكا خانوو بۆ ئەو هەنگە نێرانە دروست ئەكا كە ئیشێكی وایان نییە، هەنگە مێیەكان بە لەش گەورەترن لە نێرەكان، ئەم مێیانە لە ناو شانەكەدا گەلێ ئیش و فرمانیان بە سەرەوەیە، كە خانووی دروست كرد ئەمجا گەرا دائەنێ، كە گەرای دانا بە سەریەوە ئەنیشێتەوە، ئەم گەرایە ئەبێ بە كرمێكی سپی و ئەبێ بە هەنگ.

هەنگ نانیشێ بەسەر گوڵی هەمە جۆرەوە بەڵكوو ئەنیشێ بەسەر یەك گوڵەوەو پاشان ئەفڕێ، هەندێ لە ماڵەكانی هەنگوینی تێ ئەكاو هەندێكی بێچووەكانی تێدایە، هەنگ كە بینی شایەكەی بەكەڵك نایەو فەرمان نابا بەرێوە یا لێی ئەخەن وەیا ئەیكوژن، زۆرتریش ئەیهێننە دەرەوە ئەیكوژن، شا دەرناچێ مەگەر لەگەڵ هەموو هەنگەكانا نەبێ، ئەگەر شا نەیتوانی بفڕێ هەڵیئەگرن و ئەیفڕێنن.

شانەكانیان وەیا ماڵەكانیان هەمووی شەش گۆشەییەو بە ئەندازەی یەكە، ئەگەر چوار گۆشەیی بێ هەنگەكە خۆی مەیلەو درێژو شەش لاییە بۆشایی ئەمێنێتەوە، هەروەها پێنج گۆشەیی و هێلكەییش بێ بۆشایی هەر ئەمێنێتەوە نایانەوێ ئەو بۆشاییە بە خۆڕایی بڕوا، دارشتن و دروستكردنی ماڵی هەنگ بەو تەشكە لە دەست هیچ ئەندازیارێ نایە.

هەنگ لە بەهارو پاییزا هەنگوین ئەكا، لەو دوو وەختەدا ئەچێ ئەگەڕێ ئەنیشێ بەسەر گوڵ و بەری دارانەوە، دەست و قاچەكەی زبرە لە شیرەی گوڵەكانی پێوە ئەبێ و ئەیهێنێتەوە ئەیخوا، لە ئەنجامی خواردنی ئەو شیرەیە ئەوی لێ دەر ئەچێ ئەبێ بە

هەنگوين، دوو شفرەى تيژيشى هەيە «شىێ» گوڵ و شتەكە بەوە ئەمژىێ، هەنگوينەكە بەرهەمى ئەو ڕتوبەتە كە وەرى ئەگرێ، لە هەنگوينەكە خواردنى خۆى و بەچكەكانى پێك دێنىێ، ئەوى زياد بىێ هەڵیئەگرێ بۆ زستان، هەموو مقياسێك ئەزانىێ، ئەزانىێ چەندە هەنگوين ئەكا، ئەبێ چەندى لىێ بخواو چەندى پاشەكەوت بكا، لەهەندێ لە ماڵەكانيا كە دروستى ئەكا بە سەرپۆشێكى تەنك سەرى دائەپۆشىێ، ئەم سەرپۆشە لە مێوەكەيەتى، شكڵى ئەمانە واى لىێ دێ وەكوو گۆزەڵەيەكى بچكۆلە كە بەپارچە كەتانێكى تەنك سەرەكەى گيرابێ، تەنانەت ئەگەر لاريش ببێتەوە نارژێ. هەنگ ئەو شوێنەى خۆى تيايە بەچكە لەو شوێنەدا بەخێو ناكا بەڵكوو بەچكەكە لە خانووىترايە، هەموو ڕۆژێ خۆى و بەچكەكەى بە ئەندازەى خۆيان لە هەنگوينەكە ئەخۆن، بەم جۆرە زستان بەسەر ئەبا، كە زستان بەسەر چوو هەنگوينەكەش تەواو ئەبێ و ئيتر وەختى هاتنە دەرەوەى دێت و گوڵ پىێ ئەگا. هەنگ كاتێ زانى ئەوا دووكەڵى بەسەرا ئەكەن و هەنگوينەكەى لىێ ئەسێنن بە پەلەو بەهەڵپە ئەكەوێتە خواردنى هەنگوينەكەى.

ئەوانەى كە هەنگ بەخێو ئەكەن دوو بەرەى بۆ دروست ئەكەن، ئەمجا لەپشت دوو بەرەكەشەوە پاشكۆيەكىترى ئەدەنە پاڵ، هەنگوينى زيادە ئەڕژێتە ئەو پاشكۆيەوەو پاشان ئەيبرنەوە، گەلىێ جار لە شاخەكانا هەنگ هێلانە ئەكاو پێى نازانن، هەنگوينى ساڵەو ساڵ لەو شوێنانەدا ئەكەوێ بە سەر يەكا. هەنگ لەناو خۆيانا ئەبێ بە شەڕيان، يەكىێ نزيكيان بكەوێتەوە پێوە ئەدەن، كە پێوەدا هەنگەكە خۆى ئەمرێ، بيانەوێ بيبرنەوە ئەو كەسە سەرو دەست و دەموچاوى ئەبێ بە شتێك بپێچىێ و داپۆشىێ چونكە هەنگەكە شەڕ ئەكا لەسەر هەنگوينەكەى، ئەگەر هەنگێك لە ناو دوو بەرەكەدا مرد ئەيخەنە دەرەوە، بە هيچ جۆر نايەڵن شوێنەكەيان پيس ببێ، تەبيعەتى زۆر پاك و پوختە، ئەگەر شتێك پێچەوانەى هەنگوينەكەى بەرچاوكەوت فرێى ئەداتە دەرەوە چونكە ئەزانىێ هەنگوينەكەى بەوە بۆن ئەكا، لە بەهارو پاييزدا ئيش ئەكا، ئەو هەنگوينەى كە لەبەرهەمى بەهارانا پێك دێت زۆرترە لەهى پاييز، هەنگە بچووكەكان ئيشكەرترن تا زلەكان، لە ئاوا ئاوى جوان و پاك و ساف نەبێ نايخواتەوە، لە زستانانا ئەگەر زانى ئەوا هەنگوينەكەى كەم بووەتەوەو بەشى ناكاو نايخاتە بەهار بەئاو ڕشێنەيەكى كەمى

هەنگوینەکە ئەکا بۆ ئەمە زۆر ببێ، ئەزانێ کە هەنگوینەکە تەواو بوو ماڵەکانیان وشك هەڵئەگەڕێ و هەموویان ئەمرن.

هەنگ ئەوەیان ئیش نەکا فڕێی ئەدەنە دەرەوە چونکە ئەڵێن جێ‌گر و هەنگوین خۆرە ئەوانیش ئەو جۆرەیان ناوێ، تەنانەت خۆیان لەبەینی خۆیانا ئەزانن کامەیان گورج و گۆڵەو کامەیان تەمەڵە، هەنگ وەکوو مار کاژ ئەخات، دەنگی خۆشی زۆر خۆش لێ دێ، گیای بەلەك زۆر بۆی خراپە و ڕقی لێ ئەبێتەوە، جا ئەوانەی کە هەنگ بەخێو ئەکەن خۆ نزیك دووبەرەکە بخەنەوە و مانگی جارێکیش بیکەنەوە نەوەك لە بۆنی ئەو بەلەکە چووبێتە ناو دووبەرەکەوە، هەنگ کە ئەچێت بۆ لەوەڕو ئەگەڕێتەوە مومکین نییە یەکێکی‌تر بچێتە شوێنی یەکێکی‌ترەوە.

هەنگ شەش شت پەکی ئەخا لە ئیش‌کردن؛ تاریکی، هەور، با، دووکەڵ، ئاو و ئاگر.

دەرکەوتووە کە هەنگ هەنگوین لە دەمەوە هەڵدێنێتەوە، هەنگوین گوو ئەکا ئەو گووە هەنگ بە پاکی نازانێ فڕێ ئەداتە دەرەوە بۆ ئەوە هەنگوینەکەی بۆن نەکاو پیس نەبێ.

هەنگوین سپیەکەی جوانتر و باشترە تا زەردەکەی، سپیەکەی هی هەنگە گەنجەکانە.

هەنگوین بۆ هەرچێ دەردە بە کەڵك دێت، دمەڵ وە ئەو برینانە کە چڵکی تێ زاوە، وە شوێنی پێوەدانی مار بە هەنگوین بیهەنوون چاك ئەبنەوە، بەچاوا بهێنرێ بۆ دەردو ئازاری چاو باشە، کە سك چوو هەنگوین بخوا ئەیگرێتەو، سنگ ژانی کرد هەنگوین باشە بۆی.

هەنگوین خوێنی حەیز زیاد ئەکا، میز ڕەوان ئەکا، بەربەستی زەهر ئەکا، هێزی جماع زیاد ئەکا، کرمی زك ئەکوژێ، زیپکەی ناو ڕیخۆڵە و شتە ناهێڵێ، مایە کە سەرمای بووبێ هەنگوین بۆی باشە، ژانی جگەر نایەڵێ، سێبەڕو لەکۆڵ ئەخا. ئاگاداری شت ئەکا، مردوو هەنگوینی پیا هەلسوون هەتا هەتایێ ئاگاداری ئەکا لە ڕزان، گۆشت بخرێتە ناویەوە تا سێ مانگ نایەڵێ خراپ ببێ، تا شەش مانگ ئاگاداری میوە ئەکا، خواردنی هەنگوین تینوێتی دێنێ، کە لەگەڵ ئاودا بکوڵێنرێ کەفەکەی لابرێ ئەو تیژیە کە هەیەتی نایمێنێ و شیرینیەکەشی کەم ئەبێتەوە، ئەگەر هەنگوین خواردنەکەی یەکێکی گرت سێوی مێخۆش بخوا بەرەڵای ئەکاو زیانێکی کە هەبێ نایهێنێ، هەنگوینێ کە ئاو و ئاگرو دووکەڵی نەبینیبێ لەگەڵ میسکدا تێکڵاو بکرێ و بهێنرێ بەچاوا نایەڵێ ئیتر ئەو

چاوە ئاوی لێ بێ، لەشی پێ بەهنووێ ئەسپێ و کرێشی ئەکوژێ. یەکێ سەگی هار گرتبێتی خواردنی هەنگوین بۆی باشە، مێوەکەی ئەگەر یەکێ بیخوا وەیا پێی بی غەمی بۆ پەیدا ئەبێ بەلام شەیتانی نابێ، یەکێ زەهر کاری لێ کردبێ هەنگوینی کولاو بخوا زەهرەکە کاری نامێنێ، درك یا دەرزی چووبوو بە شوێنێکا مێوی هەنگوینی بخەنە سەر ئەیکێشێ. بەکورتی هیچ دەردێك نییە هەنگوین بۆی نەشێ.

## ماسی



ماسی یەکێکە لە گیانلەبەرە هەرە زۆرەکانی ئاوی، زیاتر لە سێ سەد جۆرە، ئاو بۆ ئەو وەکوو با وایە بۆ گیانلەبەری وشکانی، ماسی لە هەموو دەعبایەك زۆرخۆرترە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە تەبیەتی ساردو مایەی نزیکی دەمیەتی، نە ملی هەیە نە دەنگ، با وەرناگرێ، زۆر ئەجوولێ، بچووکەکان زۆر خۆیان ئەپارێزن لە گەورەکان چونکە گەورەکان ئەیانخۆن. لەبەر ئەوە بچووکەکان زۆرتر خۆیان ئەکوتن بۆ رووبارو جۆگەکان، گەرای ماسی وەکوو هێلکە وایە بۆ باڵندە بەلام گەرای ئەو سپێنەو زەردێنەی نییە بەڵکوو هەر یەك رەنگە، قولاخیان هەیە لەناو ئاودا، خەویشیان هەیە، ماسی گەرمیان و کوێستان ئەکا، گورِی ئاو هیچ پەکی ناخا لە رۆیشتن، لە پێچەوانەی ئاوەکەدا بەگورترە، ئەو هێزەی کە ماسی ئەجوولێنێ لە هەموو لەشیدایە وەکوو یەك وەنەبێ وەکوو گیانلەبەرەکانی‌تر بەش بووبێ بەسەر ئەندامەکانیا، ماسی وا هەیە ئەوەندە وردە چاو بەحاڵ ئەیبینێ، هەیە ئەوەندەش زلە بە ئەندازەی کێوێك ئەبێ، زۆر زۆر بەهێزیشە، کەم گیانلەبەر هەیە هێزی ماسی هەبێ، گیانلەبەری وشکانی هەوا بە لووت وەرئەگرێ و ئەیدا بە بۆریەکانی سی، ماسی سی نییە، ئاو بەهێزی لاجانگی وەرئەگرێ و تەوژمەکەی ئەکا بە رۆحی حەیوان و بە لەشیا بلاو ئەبێتەوە، زۆرتر وەختیش تینویەتی، ئەگەر ئەو رتوبەتی ئاو نەبوایە کە دایم لە ناویایەتی لە تینوانا ئەمرد.

✓ خواردنی گۆشتی ماسی بۆ تیژی چاو باشەو لەبەر ئەوە کە سووکە بۆ معدەش باشەو هێزی شەهوانیەتیش زیاد ئەکا، خواردنی ماسی زۆرتر لەگەڵ تەبێعەتی ئەو کەسانەدا باشتر رێ ئەکەوێ کە لە وڵاتی گەرمیانن.

✓ سەرخۆش ئەگەر بۆنی ماسی بکا سەرخۆشیەکەی لەسەر لائەچێ.

✓ زراوی ماسی و زراوی ڕەقە تێکڵاو بکرێ، پاشان بە قەڵەمێکی ئاسن لەسەر کاغەز پێی بنووسن، ئەو نووسینە لە شەوا وەکوو زێڕ دیارە.

✓ زراوی ماسی بەچاوا بهێنرێ مەنعی هاتنی ئاوی لێ ئەکا.

✓ یەکێ ئەگەر تەنگە نەفەس بوو زراوی ماسی بخوا بۆی باشە. هەروەها ئەگەر لەگەڵ شەکردا تێکڵاو بکرێ و بکرێ بە لووتا هەم بۆی باشە. وەیا ئەگەر سەری زراوەکە بخرێتە گەرووی کابراو فووی پیا بکرێ چەشنی شتە.

◈◈◈

# جڕ و جانەوەر

## ئەژدەها



ئەژدەها مارەو زل ئەبێ، زل ئەبێ هەتا وای لێ دێ بەحاڵ لە شوێنی خۆی ئەجوولێ، شوێنی وا لە مێرگ و کوێستانە دوورە دەستەکانا لە پێنج گەز تا سی گەز درێژ ئەبێ، ئەستووری بە ئەندازەی دارچنارێکی زۆر ئەستوور ئەبێ، چاوەکانی تیژ ئەبن بە شەو وەکوو چرا ئەدرەوشێنەوە، هەندێکیان تووکیان ئەبێ، لە ژێر چەناکەیەوە مووی هەیە، دوو شاخی بچووکی لێ پەیدا ئەبێ، ئەم ئەژدەها گەورانە زەهریان نەمێنێ ناتوانن پێوە بدەن، دانێکی زۆریان هەیە، برۆکانی چاوی دائەپۆشێ، نێرەکانیان خراپترن لە مێیەکانیان، ئینسان و حەیوانات هەڵئەلووشن، کە شتێکی هەڵلووشی و چوو بە دەمیا تازە ناتوانێ ئەمە فڕێ بداتەوەو شتێکی تر هەڵلووشێ، ئەبێ ئەوە قووت بدا ئەمجا شتێکی تر هەڵلووشێ، هەناسەکەی ئەڵێ گەرمایی ئاگرە، ئەو شوێنەی کە لێی ئەکەوێ بەردەمەکەی لەبەر هەڵمی هەناسەی گژو گیای لێ ناڕوێ، کە حەیوانێکی هەڵلووشی ئەچێ خۆی ئەئاڵێنێ بە دارێکی گەورە وەیا بە تاوێرێکا هەتا وردی ئەکا ئەوە خواردنەکەیەتی. هەندێ ئەژدەهای وا هەیە چەکی ئەو ئەوەیە بە گوڕ پەلاماری شێر وەیا پڵنگ وەیا کەڵەکێوی گەورە ئەداو خۆی پیا ئەئاڵێنێ و ئەمجا هێز ئەداتە خۆی هەموو پەراسووی حەیوانەکە ورد ئەکا بەسەریەکاو بەو جۆرە ئەیکوژێ پاشان هەڵیئەلووشێ، لە پێستی ئەژدەها شتی بەنرخ و نایاب دروست ئەکرێ. ئەژدەها لەبەر ئەو گەرمایی هەناسەیەی کە هەیەتی هەر خۆی ئەکوتێ بۆ شوێنە سەخت و

مێرگەکان و بۆ ئەو جێگایانە کە هەواو فێنکاییان هەیە، تەمەنێکی زۆریشی ئەبێ، گەلێ جار ئەو شوێنانەش کە خەزنەو نەختینەی لێیە ئەژدەهای لێیەو پاسەوانی شوێنەکە ئەکا.

✓ دڵی ئەژدەها هەرکەسێ بیخوا زۆر ئازاو نەترس ئەبێ.

✓ هەرکەس دڵی ئەژدەها بخوا زۆر لە گیانلەبەرەکان ئەچنە ژێر فەرمانیەوە.

✓ هەرکەس تۆزێ لە پێستی ئەژدەهای پێ بێ گەلێ حەیوانات ئەچنە ژێر فەرمانیەوە، هەروەها ئەگەر عاشق بێ عەشقەکەی نامێنێ.

✓ سەری ئەژدەها لە هەر لایەك دابنرێ خێرو بێرێکی زۆر ڕوو ئەکاتە ئەو شوێنە.

## ئەسپێ



ئەسپێ دەعبایەکی پیسی ناشیرینە، لەسەر خوێنی ئادەمیزاد ئەژی، دەست و قاچێکی زۆری هەیە، سەری مەیلەو درێژکۆڵەیە، دوو چاوی هەیەو پێی ئەڕوانێ، پەیدا بوونەکەی لە عەرەق و چڵکەوە ئەبێ لە لەشی ئینسانا، کە عەرەقەکە وشك بۆوە و جل وەیا مووی بەسەرەوە بوو لە ئەنجاما ئەبێ بە ئەسپێ، پاشان هێلکە ئەکا ئەم هێلکەیە سپیەو ئەبێ بە ڕشك و ئەنووسێ بە شوێنەکەوە بە گرانی لێ ئەبێتەوە.

ئەسپێ بەپێی شوێنەکەی ڕەنگی ئەگۆڕێ، لەناو مووی سپیدا سپی ئەبێ لە ڕەشدا ڕەش ئەبێ، مریشك و کۆترو ڕێوی ئەسپێیی ئەبێ، ئەسپێ ناداتە جلی گوڵ، حەریر مەنعی ئەسپێ ئەکا کە لەبەر یەکێکا هەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ میزی گیرابوو ئەسپێیەك لە ئەسپێی ئەو کەسە بگرن و بیخەنە کونی قنگیەوە میزەکەی بەرەڵا ئەبێ.

✓ هەرکەس بنی مووەکانی سەری بە ئاوی سڵق بشوا ئیتر ئەسپێ ناداتە سەری.

✓ ئەگەر سرکەو ئاوی دەریا تێکڵاو بکرێ و لەشی پێ بهەنوون ئەسپێ لەو لەشەدا نامێنێ.

✓ ئەگەر زەیبەق بە ڕۆنی کونجی بکوژرێ و لەشی پێ بەهنوون هەچ ئەسپێەك لەو لەشا هەبێ ئەیکوژێ.

✓ ئەمانەی کە من لێرەدا لە بابەت ئەسپێوە نووسیومە دوور نییە ئەگەر ئەفەندییەکی شاری بیخوێنێتەوە بڵێت سەججادی ڕێگای لێ تێك چووە، بێنە لەشت پاك و پوخت ڕابگرە و بە سابوون خۆت بشۆ و جلوبەرگەکەت ڕۆژی جارێ بگۆڕە ئیتر ئەسپێی چی و شتی چی؟!...

ئەمە ئەڵێت و منیش ئەڵێم ڕاست ئەکەی، بەڵام مەسەلەکەمان وەکوو مەسەلەی شاژنی هۆڵەندەی لێ دێتەوە کە خەڵکەکە هەمهەمیان کرد بۆ نان، ئەویش وتی ئەمە چییە؟

پێیان وت ئەمانە داوای نان ئەکەن و نان نییە بیخۆن، وتی: جا نان نییە با بەکسەم و پاقلاوا بخۆن!...

منیش ئەڵێم شوێن و گوندە بەدبەختەکانی کوردستان گەلێ لای هەیە کە ناوی سابوون نازانێ، گەلێ لای هەیە کە هەژاری و بێ خاوەنی وا پلیشاندوویەتەوە نوێنی ئاسمانەو ڕایەخی زەوی!

خۆم بە چاوی خۆم زۆر شوێن و مەردمی وام دیوە.



## بۆق

بۆق دەعبایەکی شلەپەتەی پان و پۆڕە، هیچ ئێسکی نییە، بە دوو جۆر پەیدا ئەبێ؛ بە پەڕین لە یەك و بە بێ پەڕین. سەرەتا کە پەیدا ئەبێ لە ناو ئاوێکا ئەبێ کە ڕۆیشتنەکەی زۆر سست بێ، لە ناو ئاوی گۆم و ئاوی پیسیشا پەیدا ئەبێ، وەکوو لە پاش بارانیش هەر ئەبێ چونکە ئاوی باراناوەکە لە هەندێ شوێنا گۆماوی پیس دروست ئەکاو ئەویش لەوێدا پەیدا ئەبێ.

سەرەتا کە پەیدا ئەبێ وەکوو خاڵ خاڵێکی ڕەش وایە بە ئەندازەی دەنکە هەرزنێك لە ناو شتێکی باریکی وەکوو ڕیخۆڵەدایە لە ناو ئاوەکە، پاشان وردە وردە لێی دەر ئەچێ

و ئەبێ بە مێکوتەسەرەو پاشان بە بۆق، هەندێ بۆق هەیە قیڕە قیڕ ناکا بەڵام بەشی زۆری ئەیکا، ئەوانەی کە ئەقیڕێنن دەنگەکەیان لە لای گوێچکەیانەوە دەرئەچێ، ئەگەر نەقیڕێنێ گوێ زۆر سووکە، زۆرتر لە ئێواران و شەودا ئەم قیڕە قیڕەی هەیە، کاتێ کە بیەوێ قیڕە قیڕ بکا لەشی لە دەرەوەی ئاوەکە ڕائەگرێ، کە ئاو چووە لاشەویلەی خوارووی ئیتر ناقیڕێنێ، بۆق بەم قیڕە قیڕەی بەلا بۆ خۆی دروست ئەکا وەکوو ئەوە زۆر ماری ئاوی وەیا دێمی -کە بۆقەکە لە ناو ئاوەکەدا نەبێ - کاتێ کە دەستی کرد بەو هەرا هەرایە دێن ئەیخۆن، بەڵام کە ئاگری چاو پێ کەوت واز لەو قیڕە قیڕە دێنێ. هەر ساڵێك ئەگەر زیاد لە ساڵان و عادەت بۆق زۆر بوو ئەو ساڵە وەباو تاعوون ئەکەوێتەوە.

✓ گۆشتی بۆق خواردنەکەی ئیسهالی لە خوێنا پەیدا ئەکاو نەفس تێك ئەدا، ڕەنگی لەش و پێست ئەگۆڕێ، ئاوساوی پەیدا ئەکاو عەقڵ تێك ئەدا.

✓ پیوی بۆقی ناودارو درەخت بنرێتە سەر ددان ئەو ددانە هەڵئەکەنێ بەبێ ئەوە هیچ ئازارێکی هەبێ.

✓ ئەو کەسەی تووشی «نقرس» ئەبێ قاچی بۆق بخاتە سەری ژانەکەی نامێنێ.

«نقرس» دەردێکە تووشی جومگەکانی پێ و پەنجەی پێ ئەبێ و ئەئاوسێ.

✓ ئەگەر ژنێك بۆقیکی ئاوی بێنێ دەمی بکاتەوەو سێ جار تف بکاتە دەمی بۆقەکەو پاشان بیخاتەوە ناو ئاوەکە ئەو ژنە ئیتر زکی پڕ نابێ.

✓ یەکێ بالووك تیایا پەیدا بوو بۆقی سەوز بخاتە سەری لا ئەچێ.

✓ ئەگەر یەکێ مار پێوە بدا بۆقێك بێنێ سکی هەڵبدڕێ و بیخاتە سەری چاك ئەبێتەوەو ژاری مارەکە زیانی ناداتێ.

✓ بۆق بخرێتە سەر مەنجەڵی ئاوی کوڵاو لە کوڵ ئەنیشێتەوە.

✓ یەکێ ئەگەر سێبەرۆی هەبوو لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ نایمێنێ.

✓ دانێك ژان بکا بۆق بخرێتە سەر پووکەکەی بەبێ عەزیەت و ژان ددانەکە ئەکەوێ.

✓ ئەگەر ژنێك بێنێ بۆقێك لەلای سەریەوە تا خوارەوە بیکا بە دوو کەرتەوەو ئەمجا سەیری بکا شەهوەتێکی زۆری ئەبێ و فرە ئارەزووی پیاو ئەکا.

✔ ئەگەر زمانی بۆق هەڵبواسرێ بە ژنی نووستوودا ئەو ژنە لەکاتی بەخەبەریدا چی کردووە هەمووی ئەگێڕێتەوە.

✔ ئەگەر زمانی بۆق بخرێتە ناو پارووە نانێکەوەو بدرێ بە یەکێك کە گومانی دزی لێ ئەکرێ بیخوا، ڕاستی دزیەکە ئەڵێ.

✔ مووی شوێنێك لە لەش هەڵبکەنرێ و پاشان شوێنەکەی بەخوێنی بۆق بهەنوون ئەو شوێنە ئیتر مووی لێ نایە.

✔ ئەگەر یەکێ خوێنی بۆق بدا لە دەموچاوی هەموو کەس خۆشی ئەوێ.

✔ ئەگەر لە شوێنێکا بۆق زۆر بوو قرە قرەکەی خەڵکەکەی وەڕەز ئەکرد بێنن تەشت وەیا جامێك بە سەر ئاوی شوێنەکەوە سەرەونخوون بکەنەوە ئیتر بۆقەکان لە قرە قرِ ئەکەون.

✔ ئەگەر لە شوێنێکا بۆق قیرە قیرِی زۆر ئەکرد بێنن چرایەك لە ناو جامێ شتێکا دابنێن و بیخەنە سەر ئاوەکە ئیتر بۆقەکان لە قیرە قیرِ ئەکەوون و دەنگ ناکەن.

✔ بۆقی زیندوو بخرێتە ناو شەرابەوە ئەمرێ، کە دەربهێنرێ و بخرێتە ناو ئاوی ڕوونەوە زیندوو ئەبێتەوە.

✔ خوێنی بۆق بخرێتە سەر پووك بە بێ‌عەزیەت ددانەکە ئەخا.

## پیرێژنەسەرە و مارمێلکە



پیرێژنەسەرەو مارمێلکە وەکوو بڵێت ئامۆزا وەیا لەیەك ڕەسەنن، هەر دووکیان لە دەشتێکی بێ‌ئاودان، هەردووکیان کلك و دەست و قاچیان وەکوو یەك وایە ئەوەندە هەیە پیرێژنەسەرە سەری پان و پۆڕترە و مارمێلکە سەری باریکە، هەردووکیان نێرەکانیان دوو کێری هەیە و مێیەکانیان دوو قوز هەردووکیان عومرێکی زۆر ئەکەن تا حەوسەد ساڵ ئەژین، هەردووکیان ئاو ناخۆنەوە، هەردووکیان بە چل ڕۆژ جارێ تنۆکێ میز ئەکەن، هەردووکیان دانیان ناکەوێ بەڵکوو

دانەكانيان هەر يەك پارچەيە، هەردووكيان گووی خۆيان ئەخۆن، هەردووكيان لەپاش كوشتنيان باسەريشيان پان بكرێتەوە هەر خوێنيان زۆرەو خوێنيان تا ماوەيەك لێ ئەڕوا تەنانەت لەوانەيە تا شەوو ڕۆژێك هەر خوێنيان لێ بێت، كە بخرێتە ناو ئاگريش لە پاش سەر بڕين هەر ئەجوولێنەوە، بەزستان لە كون دەرناچن، لەگەڵ دووپشكدا بەينيان خۆشە، كەوا بوو لێرەدا هەر وەسفێك بۆ يەكێكيان بووترێ بۆ ئەویتريشيانە.

مارمێلكە دەعبايەكی زيرەك و بێفيكرە؛ زيرەكە چونكە لەشوێنی ڕەق و سەختدا نەبێ لە ترسی ئەوە نەوەك بڕوخێ بەسەريا كون ناكا، بێفيكريشە ڕێگا ناباتەوە كونەكەی خۆی، جا لەبەر ئەمە كە ڕێگا بەرێتەوە سەری دێنێ لە پاڵ بەرد وەيا دارێكی گەورەدا كون ئەكات بۆ ئەوە ئەو دارو بەردە بكا بەنيشانە بۆ ڕێبردنەوە سەری، كە بيەوێ هێلكە بكا تا هەشتا هێلكە ئەكاو چاڵێكی بۆ هەڵئەكەنێ و ئەيانخاتە ناوی و خۆڵ ئەداتەوە بەسەريانا و بەجێيان دێڵێ تا چل ڕۆژ، جار جار هەر ئەوەندەيە دێت لەسەر خۆڵەكەوە سەيرێكيان ئەكات، هێلكەشی وەكوو هێلكە كۆتر وايە، كە بەچكەكانی هەڵاتن دەست ئەكا بە خواردنيان مەگەر ئەوانەی هەڕا بكەن و لەبەر دەستی دەرچن، كە پير بوو بەهەوا ئەژيت، ئەمە وەنەبێ هەر لەسەردەمی پيريدا بێ بەڵكوو هەر وەخت برسی بوو هيچی دەست نەكەوت ڕوو بەرووی با ئەوەستێ، ئەو بايە ئەچێ بە دەميا بەوە تێر ئەخوات.

✓ ئەگەر لەدەشتا پيرێژنەسەرە لەناو پێ پياوێكەوە تێپەڕی ئەو پياوە لە پياوەتی ئەكەوێ و ئيتر ناتوانێ بچێتە لای ئافرەت

✓ يەكێ خەمبار و تەنگەنەفەس بێ دڵی پيرێژنەسەرە بخوا خەم و تەنگەنەفەسييەكەی نامێنێ.

✓ ئەگەر يەكێ پيوی پيرێژنەسەرە بخوا زەمانێكی زۆر تينووی نابێ.

✓ ئەگەر يەكێ بە پيوی پيرێژنەسەرە دەعباكەی خۆی بهەنوێ زۆر ئەچێتە لای ئافرەت و شەهوەتی زۆر ئەبێ.

✓ ئەگەر ميچی پيرێژنەسەرە بكرێت بە ناوچاوانی ئەسپدا، ئەو ئەسپە لە غارغارێنا هيچ ئەسپێك پێشی ناكەوێ.

✓ يەكێ سپڵی ژان بكا سپڵی مارمێلكە بخوا ژانەكەی لەكۆڵ ئەكەوێ و قەت نايگرێتەوە.

✓ گۆشتی مارمێلکە هەرکەس بەسوور کراوەیی بیخوا ئەگەر نەخۆشی دائمی هەبێ لە کۆڵی ئەکەوێ، چاوی تیژ ئەبێ، لەشی بەهێز ئەبێ، شەهوەتی زیاد ئەبێ.

✓ یەکێ گونی مارمێلکەی پێ بێ خزمەتکارەکانی زۆر خۆشیان ئەوێ.

✓ پێستی مارمێلکە هەنگوینی تێ بکرێ هەرکەس لەو هەنگوینە بچێژێ شەهوەتی زۆر زۆر زیاد ئەکا.

## جاڵجاڵۆکە



جاڵجاڵۆکە دەعبایەکی بێهێزی قاچ و قول درێژە، فووی لێ کەی با ئەیبا. ئەمانەش چەند جۆرێکن؛ هەندێکیان زۆر بێهێز و پەرێشانن، ئەم جۆرە چەند لاقێکی درێژی هەیە ئەیەوێ بژیت هیچ هۆیەکیش نییە بۆ ژیان ئەوە نەبێ کە دێنێ لەبەینی درزی دیواردا بە درێژایی بە لیکەکەی چەند هەودایەك ئەهێنێتە خوارەوە، ئەمە ئەکا بەتانی تەونەکەی، پاشان بەپاناییش پیا دێتەوە ئەمەش پۆپەکەیەتی، ئەم کردەوەیە بە جۆرێکی هەندەسەیی بەبێ زیاد و کەم بەجێ دێنێ، ئەمجا لەشوێنێکەوە خۆی دائەگرێ کە مێشێ میشوولەیە شتێك کەوتە ناویەوە پەلاماری ئەدا ئەیگرێ و ئەیخوا.

هەندێکیتر لەمانە خرێکی قاچ کورتن، ئەم جۆرەیان خۆی دائەگرێ کە مێش بەنزیکیا تێپەڕی پەلاماری ئەدا بە گورجی ئەیگرێ و ئەیخوا، کاتی وا هەیە ئەمەیان لە بن میچەوە بە هەودایەکی لیکەکەی خۆی شۆڕ ئەکاتەوە، کە مێشی نزیك کەوتەوە پەلاماری ئەداو ئەیگرێ.

جۆرێکیتر هەیە شەش چاو و هەشت قاچی هەیە، کە مێشی چاو پێ کەوت خۆی ئەنووسێنێ بە ئەرزەکەوەو کوتوپڕ باز ئەدا مێشەکە ئەگرێ و ڕێش ناکەوێ لە بازەکەیا بەهەڵەدا بچێت و نەیگرێ.

جۆرێکیتر ئەمیش دێنێ شوێنێك بۆ خۆی ئەتەنێ و ئەچێتە ناوی کە مێش کەوتە

ناویـەوە پەلامـاری ئـەداو ئەیمژێ، مێشـەکە دەسـت ئـەکا بـە هـاوار هـاوارو گیزەگیـز ئەم گـوێ ناداتـێ تا چـی تەڕایـی لـە لەشـی مێشـکەدا هەیـە ئەیمژێ پاشـان قاوخەکـەی ئەبا هەڵی‌ئەگرێ پاشەکەوتی ئەکا.

جاڵجاڵۆکـە زیاتـر لـە پاش ئاوابوونـی ڕۆژ مێـش و شـتە ئەکەونە داویـەوە، جاڵجاڵۆکـە مێیەکانیـان تانەکـە ئەتەنـێ و نێـرەکان پۆیـەکـە، بەهاریکاری یەك ماڵ دروسـت ئەکەن و ئەژیـن، مێیەکـە گـەرای هەیـە. بێچوو لەگەراکـەوە دەرئەچێ وەکوو کرمێکی سپی وایە، ئـەو بێچـووە هـەر لەهێلکەکـە دەرچوو ئەزانـێ مـاڵ بتەنـێ، لـەپاش سـێ ڕۆژ ئەبـێ بـە جاڵجاڵۆکـەی تـەواو، جاڵجاڵۆکـە نێرەکە ئەپەڕێ لـە مێیەکە وەکوو گیانلەبەری‌تر، ئەویـش بەم جۆرە؛ نێرەکە هەودا ڕووبەرووی مێیەکە ئەتەنێ، مێیەکەش ڕووبەرووی نێرەکە، بەم جۆرە لەیەك نزیك ئەبنەوە تا زکیان ئەنیشێتە سەر یەك و ئیش دروست ئەبێ، ئەوانەیان کەمێـش و شـتە ئەکەوێتـە ناو داوەکەیانـەوە مێشـەکە بەهـەر لایـەکا بیەوێ بـڕواو داوەکە بـدڕێ خێـرا ئـەم پەلامـاری ئەولایە ئەداو گورج ئەیتەنێتەوە، تا بە تەواوی مێشـەکە ماندوو ئـەکاو پاشـان ڕایئەکێشـێ بـۆ ژووری ئازۆخە کە دروسـتی کـردووە، ئەم جۆرەیان قەڵشـاوی دەمـی پێچەوانـەی قەڵشـاوی دەمـی گیانلەبەرەکانی‌تـرە، ئـەم بەدرێژایـی ڕێ کەوتـووە، وەکـوو ئـەوە وایـە تـۆ هەر دوو بەرە لەپت پێکەوە بنووسێنی و پاشـان تۆزێکـی بکەیتەوە، ماڵەکەشی کە ئەیکا سـێ سـووچییە هەر بەئەندازەی ئەوەندە دروسـتی ئەکا کەجێگای خۆی تیا ببێتەوە. جۆرێکی‌تریش هەیە بەلای سـووریـدا ئەڕوانێ، نەرمە تووکێکی هەیە، لەسـەریەوە وەکـوو درك چـوار درکـی هەیـە بـەوە ئیشـی خۆی ئـەکا، ئەم جـۆرەیان تەنینی نییە بەڵکو لەناو ئەرزا چاڵ دروسـت ئەکاو ئەچێتە ناوی و بەشـەو دەرئەچێ، چاڵەکەی کـە ئەیـکا لەوێنـەی ئەنگوسـیلەی خەیاتـی دایـە، ناوەکـەی زۆر سـافە، بێنـە ئەسـپێیەك بخەرە ناویـەوە کەچی سەیر ئەکەی لە ژێرەوە وردە وردە بۆی ئەجووڵێ لە ژێـر خۆڵەکەوە دەرئەچـێ و ئەسـپێیەکە ئەباتـە ناو خۆڵەکـەوە، مەشـهوور وایـە کەمێـش زۆر تەمـاعکارە، جاڵجاڵۆکەش زۆر بەقنیاتە، کەچی ڕۆژی ئەم زۆر بەقنیاتە وا لەو زۆر تەماعکارەدا!.

✓ تەنـراوی جاڵجاڵۆکە لەگەڵ تۆوی سێوی تورشـدا بهاڕێتـەوە، ئەمە بدرێ بە لووتی هەرکەسێکا بێهۆشی ئەکا.

✓ یەکێ ئەگەر تای هەبوو جاڵجاڵۆکەیەك بخرێتە ناو پارچە قوماشێکی ڕەشەوە و بیکەنە ملی ئەو کەسە تایەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ یەکێ شەو تای هەبێ جاڵجاڵۆکەیەکی پێوە ببەستن شەو تایەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ شوێنێ خوێنی نەوەستێتەوە هەودای جاڵجاڵۆکەی بخرێتە سەر خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.

✓ جاڵجاڵۆکە لەماڵێکا بسووتێنرێ مێشوولە لەو ماڵەدا نامێنێ.

✓ زیو ئەگەر ژەنگی هەڵهێنا بوو بەتاری جاڵجاڵۆکە بیسوون ڕەنگ هەڵدێنێتەوە.

✓ ئەگەر شوێنێك جاڵجاڵۆکەی زۆر بوو گەڵای ئاسی بە تەڕی لەو شوێنەدا بسووتێنن ئیتر جاڵجاڵۆکەی نابێ.

✓ شوێنێك ئەگەر برین بوو وە ویستی بئاوسێ تەنراوی جاڵجاڵۆکەی بخرێتە سەر، نایەڵێ بئاوسێ و خوێنەکەشی ئەوەستێنێتەوە.

✓ سێبەرۆدار تەنراوی جاڵجاڵۆکە لەناو پەڕۆیەکدا لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ سێبەرۆکی لەکۆڵ ئەکەوێ.

## جەڕار



جەڕار یەکێکە لە ڕەسەنی دووپشك وەیا هەر دووپشکێکی کەمەکێ بچکۆلەیە، زەرد ڕەنگە، کلکی وەکوو دووپشك بەرز ناکاتەوە بەڵکوو هەر بەشوێن خۆیا ڕائەکێشێ، لە هەندە خاکێ کە تەبیعەتەکەی شێدار بێ پەیدا ئەبێ، لە هەندێ شوێنی کوردستانا وەکوو مەندەلی و دەورو بەری بیجاڕدا هەیە، کە پێوە ئەدا هیچ ژانی نییە، پاشان دەست ئەکا بە خوران، هەر ئەخورێ ئەخورێ هەتا گەرمایی و حەرارەتێك لە هەموو لەشیدا پەیدا ئەکا، دەعبایەکی کوشندەیە، کەم کەس هەیە پێوە بدا ڕزگاری بێ و نەمرێ، گرێگی وا ئەخاتە هەموو لەشەوە پیاو وا ئەزانێ خراوەتە ناو تەنوورێکەوە، ژانەکەی ئەو گڕەیە.

جا یەکێ جەڕار پێوە بدا ئاوی جۆ وەیا ئاوی پەنیر بخواتەوە بۆی باشە. هەروەها یەکێ

جەرار پێوە بدا سێو ورد ورد بکرێ وەیا بدرێ بەرەندەدا، پاشان لەگەڵ ئاوی ساردا تێکڵاوی کاو بیخوا بۆی باشە.

## جلە = تیمساح



جلە دەعبایەکی پیسی ئاوییە لەشکڵی مارمێلکەدایە، زۆر زل و پان و پۆرە، دەعبای ئاوی هەموو لێی ئەترسن تەنها سەگی ئاوی نەبێ ئەو مێملیەتی، لە کاتێکا کە ئەنوێ دەمی ئەکاتەوە سەگی ئاوی ئەچێ خۆی لەقوڕ هەڵئەسوێ و خۆی وشك ئەکاتەوە کوتوپڕ خۆی ئەکا بەدەمیاو ئەچێتە ناو سکی هەموو ڕیخۆڵەکانی ئەخواو لە تەنیشتیەوە کونی ئەکا و دێتە دەرەوە.

جلە دەمێکی زۆر زلی هەیە، لا شەویلکەی سەرەوەی شەست کەڵبەی پێوەیە، هی خوارەوە چل کەڵبەی پێوەیە، لە بەینی هەر دوو کەڵبەیدا لەسەرو خوارەوە دانێکی بچکۆڵەی چوار گۆشەی تێدایە کە دەمی نا بەیەکا ئەم کەڵبەو دانانە ئەنیشنە سەر یەك و جووت ئەبن دەرزی ناچێ بە بەینیانا، زمانێکی درێژی هەیە، پشتی وەکوو قاوخی کیسەڵ وایە شیر کاری تێ ناکا، چوار پێی هەیە و کلکێکی درێژ، قنگی نییە، ناکوژرێ مەگەر لە تەنیشتیەوە نەبێ چونکە هیچ شتێ کاری تێ ناکا، هاتە دەرەوە لە گوێ دەلیاکە ئەسپ بەوێدا تێ پەڕێ وەیا گا ئەیفڕێنێ و ئەیقۆزێتەوە.

نێرەکە کە بیەوێ سواری مێیەکە بێ لە ئاوەکە دێنە دەرەوە مێیەك خۆی ئەخا بەسەر پشتا نێرەکە ئەنیشێتە سەری و زکی ئەدا بەسەر سکیا، پاشان لەبەر ئەوە کە دەست و قاچی کورتە ئەگەر نێرەکە هەڵینەگێڕێتەوە ناتوانێ خۆی هەڵگەڕێنێتەوە هەڵسێ بەو جۆرە ئەمێنێتەوە تا ئەمرێ، لەو ماوەیەدا کە هێلکە بکا ئەوانەی کە ئەکەونە ناو ئاوەکە ئەبن بە جلە، ئەوەی ئەکەوێتە وشکانی ئەبێ بە دەعبایەك پێ ئەڵێن سەقەنقورو وەکوو قۆری وایە، گەلێ جار ئەم جلەیە خۆی ئەخاتە ڕۆخی ئاوەکە زەلام بەوێدا بڕوا نازانێ ئەو ئەیفڕێنێ و ئەیخوا.

تیمساح بە پێچەوانەی هەموو حەیواناتی‌تر لاشەویلکەی لای ژوورەوەی ئەجوولێ لەکاتی شت‌خواردندا، هی لای خوارووی ئێسکەکەی نووساوە بە سینگیەوەو ناجوولێ بە پێچەوانەی حەیواناتی‌تر ئەوان هەموو لای خواروویان ئەبزوێ. تیمساح لەبەر ئەوە کە کونێکی نییە بۆ ئەوە پیسایی و شتی لێ دەرچێ وەکوو هی گیانلەبەرانی‌تر، کاتێ کە خواردنی خواردو ورگی پڕ بوو سەرەی گوکردنی هات لە ئاوەکە دێتە دەرەوەو دەمی ئەکاتەوە و بەبێ هەست خۆی ئەخا، باڵندەیەك هەیە بە ئەندازەی چۆلەکەیەك، ئەوانە دێن لەبەر ئەوە بە شوێن خواردنا ئەسووڕێنەوە لێ کۆ ئەبنەوە و ئەچنە ناو دەمیەوە دەست ئەکەن بە خواردنی ئەو گەنوگوەی ناوسکی، ئەم باڵندانە هەر لەسەر ئەوە ئەژین، تیمساحەکەش ناتوانێ تا ئەوانە لە ناو سکیا بن دەم بنێ بە یەکا چونکە ئەو پەلەوەرە لەسەر سەریەوە پۆپەیەکی هەیە وەکوو دڕك وایە هەرکە تمساحەکە دەمی نا بەیەکا دڕکەکە ئەچێ بە قوڕگیا لە ترسی ئەوە ناوێرێ دەم بێنێتەوە یەك، ئەمیش بە هەموو شێنەییەکەوە تێر ئەخواو پاشان دێتە دەرەوەو تیمساحەکەش لە ئازاری گو نەکردن ڕەحەت ئەبێ، ئەڵێن تیمساح شەست دەماری هەیە، شەست ساڵ ئەژی، شەست هێلکە ئەکا، نێرەکە شەست جار ئەپەڕێ لە مێیەکە، لە ناو دەریاکەدا چوار مانگی زستان لە ژێر ئاوەکەدا ئەمێنێتەوە.

✓ یەکێ چاوی گل بکا چاوی جله بخاتە سەری گلەکەی نامێنێ، چاوی ڕاستی بۆ ڕاست و هی چەپی بۆ چەپ.

✓ پیوی جله بکرێ بە مۆم و دابگیرسێنێ و بنرێتە ئەو شوێنانە کە بۆقی زۆرە، هەر کە ئەو دەستی کرد بە سووتان بۆقەکان قڕە ناکەن.

✓ یەکێ گوێچکەی ژان بکا لە پیوی جلەی تێ تکێنێ ژانەکەی ئەشکێ و نامێنێ، خۆ ئەگەر گوێی گران بوو دەوام بکا لەسەر تێ تکاندنی گرانیەکەی لا ئەبا.

✓ ئەگەر سپیایەتی کەوتە سەرچاو زراوی جله پیا بێنن ئەو سپیاتییە ناهێڵێ.

✓ ئەگەر یەکێ لە ددانی لای ڕاستی تیمساح ببەستێ بە قاچی خۆیەوە هێزی چوونە لای ژنی زۆر زۆر ئەبێ.

✓ یەکێ لەرز بیگرێ ئەوەڵ ددانی لای چەپی تیمساح ببەسترێ بەو کەسەوە لەرزەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ فێدار جەرگی تیمساح بسووتێنرێ و دووکەڵەکەی بچێ بە سەریا فێیەکەی نامێنێ.

✓ ئەو بەرانەی کە شەڕە قۆچی پێ ئەکرێ ئەگەر پارچەیە لە پێستی تیمساح ببەستن بە ناو چاوانیەوە، لە شەڕا هیچ بەرانێ بە سەریا زاڵ نابێ.

✓ هەر جۆرە سپیاتییەك بکەوێتە سەرچاو تازە بێ یا کۆن، ئەو پیساییەی کە لەناو زکی تیمساحدایە و گووەکەیەتی بیهێنن و بهێنرێ بەو چاوەدا سپیایەتییەکەی لا ئەبا، سەیرەکەش ئەوەیە ئەوەی کە بە گووی تیمساح ناو ئەبرێ بۆی زۆر خۆشە.

## دووپشك



دووپشك دەعبایەکی پیسی دزی بەدفەساڵە، پێی ئەڵێن دمارەکۆڵ و کلاژدووم، کلکێکی درێژی هەیە ئەینێ بە نەڕەی شانیەوە، چزوەکە لەنووکی دەرزی تیژترە، ناوەکەی بۆشە، کەدای بەشتێکەوە خێرا زەهرەکەی تێ ئەڕێژێ، هەشت قاچی هەیە، دووچاوی هەیە لەسەر پشتیەوە، زۆر بەهەست و بە ئاگایە، بە مردووەوە نادا، هەروەها بەیەکێکەوە نادا کەنوستووبێ، پێوە نادا تا ئەبزوێتەوە، هەرکە جووڵایەوە چزەی لێ هەڵئەسێنێ، کە بە شتێکەوەدا لەبەر ئەوە خۆی بەتاوانبار ئەزانێ گورج هەڕا ئەکا، دووپشك لەمار پیسترە، مار هەمووی ژەهری نییە دووپشك هەمووی ژەهرداره، مار تا عەزیەتی نەدەی پێوە نادا دووپشك عەزیەتی بکەی و نەیکەی پێوە ئەدا. دووپشك گەلێ جار لەشوێنی پیسی نماوی پەیدا ئەبێ، دوو خشت بنێرە سەر یەك و شوێنەکە نمناك بێ واتە بەینی خشتەکان، پاش بەینێك بەرزیکەوە دووپشکی لێ پەیدا بووە، لەزاو زێدا بێچووی زۆر ئەبێ، دوو پشکێ کە ئاووس بێ ژارەکەی کوشندەترە، هەندێك ئەڵێن دووپشك لە دەمەوە بەچکەی ئەبێ، هەندێك ئەڵێن کە بەچکەکانی پێ گەیشتن پشتی کون ئەکەن و دێنە دەرەوە ئیتر دووپشکەکە خۆی ئەمرێ.

ئەوەی کە من بەچاوی خۆم چاوم پێ کەوت جارێك لە بەغدا دنیا نیوەڕۆ بوو، لەسەر

پێ پلیکانەکە شتێکی ڕەشم بەدی کرد، کە چاك سەیرم کرد ئەمە دووپشکێکی ڕەشە سێ بەچکەی بەسەر پشتیەوە، بەچکەکان هەر ئەوەندە سپی بوون وەکوو بەفر وابوون، باریکییان وەکوو دەزوویەکی باریك وابوون، درێژییان بە ئەندازەی چزووی دووپشکەکە ئەبوو، سەیر ئەکەم ئەمانە ئەجووڵێنەوە، زۆر سەرم سڕما، کە باش سەرم بردە پێشەوە ئەبینم ئەمانە لەسەر پشتی دایکەکەیانەوە ئەچنەوە ناو سکی و دێنەوە دەرەوە، چیلکەیەکم ژەند بە دایکەکەیانەوە سەیرم کرد هیچ ناجووڵێتەوە، گەلێك خەریك بووم کەڵکی نەگرت، پاشان هەموویانم کوشت.
هەندێ شوێن دووپشکی پیسترە لە هەندێ شوێنیتر، دووپشکی شارەزوور و «نصیبین»، وە لە شارەزووریش «عەربەت» زۆر پیسە، دووپشك ڕەشی هەیەو زەردی هەیە، زەردەکان پیس‌ترن، «حومس» ئەڵێن دووپشکی نییە، دووپشك کە بکەوێتە ناو ئاوەوە ئاوەکە ڕاوەستابێ وەیا بڕوا دووپشکەکە وشك ئەوەستێ ناتوانێ بجووڵێتەوە، کە ماری بەر چاوکەوت مارەکە وشك ڕائەوەستێ ئەمیش ئەچێ بەسەر پشتیا لەسەر کلکیەوە پیا ئەڕوا تا ئەگاتە سەر سەری ئەگەر جووڵایەوە کە گەیشتە سەری لەوێدا ئەدا بە تەپڵی سەریەوە، ئەگەر مارەکە هاتە دەست و دووپشکەکەی خوارد ئەوا ڕزگاری ئەبێ ئەگینا ئەتۆپێ، دووپشك حەز لە کوللە زۆر ئەکا جا لەکاتی ڕاوە دووپشکا دێنن کوللەیە بە دەزوویێك ئەبەستن پێوە ئەیخەنە کونە دووپشکەوە هەرکە دووپشکەکە بۆنی کرد خۆی بە کوللەکەوە هەڵئاوسێ دەزووە ڕائەکێشن ئەویش پێوە دێتە دەرەوە بەو جۆرە ئەیانکوژن، وەیا بەجۆرێکیتر بۆ ڕاوە دووپشك‌کردن، دووپشکێك دێنن دەزوویەکی پێوە ئەبەستن بەرەڵای کونەکەی ئەکەن، ئەچێتە ژوورەوە لای دووپشکەکانی‌تر، لە دەرەوە دەزووەکە ڕائەکێشن، دووپشکەکە لە ترسی خۆی چنگ ئەکا بە دووپشکێکی‌تر ئەویتر هەرچەندە جڕە ئەکاو فڕە ئەکا ئەم بەرەڵای ناکا، کە هێنایانە دەرەوە ئەو ئەکوژن و دیسان ئەم ئەخەنەوە ژوورەوە، هەر بەم جۆرە هەتا هەچ دووپشکێك لەو کونەدا بێ هەمووی ئەکوژن، لە دەشتا دووپشکگەلێ زۆرترە هەتا لە ئاوەدانیدا، دووپشك ئەدەن بە یەکیشەوە، کە دووپشك دای بە دووپشکێکی‌ترەوە پێوەدراوەکە ئەمرێ، لەگەڵ قالۆچە بەینیان زۆر خۆشە، دووپشك بە «کەوەر»یش هەر ڕاو ئەکرێ، لەبەر ئەوە کە بۆنی کەوەری پێ خۆشە بیخەنە کونەکەیەوە بە دەزووێکەوە ڕایبکێشنەوە شوێنی ئەکەوێ و دێتە دەرەوە، دووپشك لەگەڵ ئەو بچووکیەدا بدا بە فیل و حوشتر و گاجووتەوە گەلێ جاری

واهەیە ئەیانکوژێ، ئەڵێن دووپشک جۆرێکی تایبەتی هەیە کە باڵی هەیەو ئەفڕێ، ئەمانە هەر بە تەواوی کوشندەن، ئەمانە زۆرتر لە «نصیبین»دا ئەبن، جا لەو «نصیبینە»دا جۆرە مێروولەیەك هەیە دەرمانە بۆ ئەم جۆرە دووپشکانە.

✓ دووپشك کەدای بە یەکێکەوە، دووپشکەکە بگرن ڕتووبەتێکی تێدا هەیە ئەو ڕتووبەتە بدەن لە شوێنی پێوەدانەکە ژانەکەی ئەشکێ.

✓ دووپشك دای بە یەکێکەوە، هەر ئەو دووپشکە وەیا یەکێکی‌تر سکی هەڵدڕن و بینێن لە شوێنی پێوەدانەکە ژانەکەی ئەشکێنێ.

✓ کە دووپشك دای بە یەکێکەوە دووپشکەکە بسووتێنن و بیخەنە سەر شوێنەکە ژانەکەی ئەشکێنێ.

✓ یەکێ دووپشك پێوەدا، هەندێ خوێ بێنن، ئەو کەسە تۆزێکی لێ بخواو ئەویتری بخەنە سەر شوێنەکە ژانی ئەشکێ.

✓ یەکێ کە دووپشك پێوەدا خێرا شوێنی پێوەدانەکە بگرێ تون تون و ئەم لاو ئەولای بە بەنێ توند جەڕ بدا بۆ ئەوە ژارەکەی بڵاو نەبێتەوە، پاشان بە دەمە گوێزانێ شتێ شوێنی پێوەدانەکە توێ بکاتەوە، بە کەڵەشاخێ هەڵیمژن ژارەکە دەرئەچێ و ژانەکەی ئەشکێ.

✓ دووپشك دای بە یەکێکەوە ئەگەر دووپشکەکە نەکوژرا تا شەو و ڕۆژێك هەر ژان ئەکاو کابرا نارەحەت ئەکا.

✓ دووپشك بخەنە ناو گۆزەڵەیەکەوە و سەری ببەستن و گۆزەڵەکە بخەنە تەنوورەوە هەتا دووپشکەکە وا ئەسووتێ ئەبێ بەخۆڵ، ئەو کەسەی بەردی هەبێ لە میزڵداندا ئەو خۆڵە مێشە بخوا بەردەکە ورد ورد ئەبێ و دەرئەچێ.

✓ یەکێ ئیفلیج وەیا لە لەشیا هەبێ دووپشك بخاتە سەر شوێنە بە ئازارەکە بۆ ئەوە پێوە بدا ئەمە بۆ ئیفلیجی و ژان باکەی کەڵکی زۆرە.

✓ دووپشك بگرن، لە هەرماڵێکا بیسووتێنن هەچ دووپشکێك لەو ماڵەدا هەبێ یا ئەمرن یا هەموو هەڕا ئەکەن.

✓ دووپشکێکی ڕەش وشك بکرێتەوە و لەگەڵ سرکەدا بکرێ بە مەعجوون، یەکێ بەڵەك بێ و بەو مەعجوونە بیهەنوێ بەڵەکیەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ دووپشـك بسـووتێنن و خۆڵەمیشـەکەی لەگـەڵ ڕۆنـدا تێکڵاو بکـرێ، بـدرێ لەو شوێنانە کە مووی لێ نایە بدرێ لەو شوێنە و پێ بهەنوون مووی لێ دێ.

✓ ئەگـەر یەکێـك شـوێنێکی ژان و با تـێ بـداو ژان بـکا، سـێ ڕۆژ لـە مانـگ بمێنێ دووپشـك بگـرێ بیخاتـە ناو هەنـدێ ڕۆن زەیتوونـەوە بیکاتـە ناو حاجەتێکـەوە و سـەری بگـرێ و وازی لـێ بێنـێ هـەتا ڕۆن زەیتەکـە خـۆی ئەگرێتـەوە و هێز پەیـدا ئەکاتەوە، ئەو وەختە شوێنەکەی پێ بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر توور بخرێتە ناو حاجەتێکەوە دووپشك بەناویا بڕوا ئەمرێ.

✓ ئەگـەر یەکـێ دووپشـك پێوەی بدا، دووپشـکێك لەگـەڵ ڕۆنی گادا بکوڵێنـێ و بینێتە سەری چاك ئەبێتەوە. واتە پێ بهەنوێ.

✓ یەکـێ دووپشـك وەیا مـار پێوە بـدا، دە مسـقاڵ حەبـی ترنـج بێنـێ بیهاڕێتـەوە و پاشـان تێکڵاوی ئـاوی بـکاو بیخواتـەوە ژانەکـەی نامێنـێ ئەمـە تەنانـەت بۆ زەردەواڵـە و شەنگەسوورە و شتەش هەر بە کەڵکە.

✓ یەکـێ ئەگـەر دووپشـك پێوە بـدا ڕیشـەی داری زەیتوون لەسـەر سـەریەوە شـۆڕ بکرێتەوە ژانەکەی ئەشکێ.

✓ توێکڵێ توور وەیا توور لە هەر ماڵێکا هەبوو دووپشك لەو ماڵەدا هەڵدێت تا ئەو توێکڵەی تێدا بێت.

✓ ئەگەر کەرتە توورێك بخرێتە دەرگای کونی دووپشك ئەو دووپشکە ئیتر ناتوانی بێتە دەرەوە.

✓ تفی ڕۆژووەوان مارو دووپشك ئەکوژێ، واتە بکرێتە دەمیەوە.

## زەروو



ئـەم جـۆرە زەرووە کـە قسـەی لێوە ئەکەیـن ڕەشـکارە، زۆرتر لەناو کانیاوە سـاف و ساردەکانایە، ئەوانـەی کـە ئیشـیان گرتنـی ئەوانەیـە ئەچـن ئەیانگرن و ئەیانخەنە ناو گۆزەڵە وەیا شووشـەیەك ئـاوی تـێ ئەکـەن و هەڵـی ئەگرن. ئـەو خوێنـەی

کەوا خراپ و پیس بێ لە لەشدا زەرووی لێ ئەنرێ و هەڵی ئەمژێ، کە ویسترا بخرێتە سەر شوێنێکی بە ئازار مەعنای وایە ئەو شوێنە خوێنی پیسی لێیە، زەرووەکە لەسەر تۆزە قورێك دابنرێ و نزیکی شوێنەکە بخرێتەوە ئیتر خۆی پەلاماری شوێنەکە ئەداو پێوە ئەنووسێ و دەست ئەکا بە هەڵمژینی خوێنەکە، ئەو شوێنەش لە ڕواڵەتا هیچ برین و شتێکی دیار نییە بەڵام زەرووەکە ئەیناسێ، کە خوێنەکەی هەڵمژی و پڕ بوو خۆی ئەکەوێتە خوارەوە، ئەو خوێنەش کە ئەو هەڵی ئەمژێ خوێنێکی ڕەشی پیسە ئەگەر هەر بەری نەدا تۆزێ خوێی پێوە ئەکەن ئیتر بەری ئەداو ئەکەوێتە خوارەوە، ئەگەر ویسترا خوێنەکە هەڵێنێتەوە دیسان خوێی پێوە ئەکەن هەمووی هەڵدێنێتەوە.

✓ ئەم جۆرە زەرووە ئەگەر لەبەر سێبەردا وشك بکرێتەوەو لەپاشان لەگەڵ نەوشادردا بیهاڕنە وە بیدەن لەو شوێنەی لەش کە مووەکەی ئەوەرێ ئیتر ناوەرێ و مووی لێ دێتەوە.

✓ ئەگەر زەروو بخرێتە ناو گۆزەڵەیەکەوە هەتا ئەمرێت، پاشان بیهاڕنەوە، ئەو شوێنەی لەش کە مووی لێیە مووەکەی هەڵکەنن و شوێنی مووەکە بەو بهەنوون ئیتر مووی لێ نایەتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ لە کاتی ئاو خواردنەوەدا زەروو چوو بەگەروویا و لە گەرووی گیر بوو و نەئەهاتە دەرەوە، بێنن تووکی ڕێوی بسووتێنن و ئەو کەسە سەر بگرێ بە سەریا دووکەڵەکەی بچێ بە گەروویا خێرا ئیتر زەرووەکە ئەکەوێتە خوارەوە. ئەگەر ئەم ئیشە بە سم و نینۆکی حوشتریش بکا هەر چەشنی کردەوەی هەیە و ئەکەوێتە خوارەوە. وە یاخود بێنی غەرغەرە بکا بە سرکەی شەراب دیسان هەر ئەکەوێتە خوارەوەو بەری ئەدا.

## ژیشك



ژیشك کە «ژوژوو»یشی پێ ئەڵێن دەعبایەکی دڕکاوی لە قەوارەی کیسەڵدایە تۆزێ گەورەتر، هەموو لەشی هەر دڕکە، پێنج ددانی لە دەما هەیە. زۆرتر گەڕانی لە شەودایە، فرە حەزبە ترێ ئەکا،

تەنانەت ئەچێتە سەر مێو تریەکەی هەموو ئەخاتە خوارەوە و ئەمجا خۆیشی دێتە خوارەوە هەتا ئەتوانێ لێ ئەخوا و پاشان خۆی تیا ئەگەوزێنێتەوە، بۆڵەکان ئەچنە بەینی دڕکەکانیەوە و ئەیباتەوە بۆ بێچوەکانی، ئەو شوێنەی کە ئەیکا بە جێگای خۆی دوو کونی تێ ئەکا؛ یەکێ ڕوو بەرووی بای وەشت یەکێ ڕوو بەرووی بای زریان، لەگەڵ سووچڕدا هەریەك ڕەسەنن بەڵام سووچڕ گەورەترە، کە دەستی بۆ ببرێ وەیا نزیکی بکەونەوە خۆی ئەباتەوە یەك و سەریشی ئەباتەوە ناوەوە هەر وەکوو تۆپەڵە دڕکێکی لێ دێت، کە نێرو مێیەکەیان بیانەوێ جووت ببن بۆ ئیشی شەرعی نێرەکە ڕائەوەستێ و مێیەکەش هەر ڕائەوەستێ و خۆی پێوە ئەنووسێنێ بەڵام لە وەستانەکەیانا پشتی نێرەکە ئەکەوێتە بەر سکی مێیەکەوە. زۆر زۆر دوژمنی مارە، کە تووشی مار ئەبێ ئەگەر بۆی ڕێ کەوت قەپ ئەکا بە ملیا و سەر ئەباتەوە قوڵاخەکەی خۆی، ئەگەر بۆی ڕێ نەکەوت کلکی ئەگرێ و ئەیمژێ ئەویش لەتاوانا هەڵئەبلۆقێتەوە و خۆی ئەدا بە دڕکەکەیا تا ئەمرێ پاشان ئەیخوا. سووچڕیش بەلایەکە بۆ خۆی ئەم لەژیشك گەلێ گەورەترە، ئەم کاتێ کە ئەکەوێتە شەڕەوە چەکەکەی ئەو دڕکانەیەتی کە وەکوو تیر وایە، کاتێ کە یەکێ لەو دڕکە تیرانەی ئەهاوێژێ لە ڕاستیدا وەکوو تیر ئەڕوا و هیچ سەریش ناکا بچێت بەهەر لایەکی ئەو دوژمنەیا وەکوو خنجەر ئەچێتە خوارەوە.

✓ یەکێ ئەگەر گوێی گران بوو چاوی چەپی ژیشك بێنێ لە ناو زەیتدا سووری بکاتەوە، ئەمجا بە میلێك بیکاتە گوێچکەی و تێی هەڵسوێ گرانییەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ بیەوێ موو لە شوێنێکی دەرنەیەت، بێنێت لە پێشا مووەکە هەڵکێشێت پاشان بە زراوی ژیشك شوێنەکەی بهەنوێ ئیتر قەت مووی لێ نایەت.

✓ یەکێ سپڵ زۆری لێ بستێنێ سپڵی ژیشك ببرژێنێ و بیخوا بە ئەندازەی خواردنەکەی سپڵەکەی سووك ئەبێت.

✓ ئەگەر یەکێ بەگران میزی بۆ ئەکرا گورچیلەی ژیشك بێنێ و وشکی کاتەوەو بە ئەندازەی تۆزێ کەمتر لە مسقاڵێکی لەگەڵ ئاوی نۆکی ڕەش کە کوڵێنرابێت و ئاوەکەی ساف بووبێت تێکڵاوی کاو بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ سەگی هار گرتبووی خوێنی ژیشك بدا لە شوێن قەپەکەی ژانەکەی

نامێنێ و ئەمین ئەبێ لە مردنیش بەهۆی ئەو گرتنەوە.

✓ گۆشتی ژیشك خواردنی بە کەڵکە بۆ - داءالفیل - پێ ئەستوور بوون، وە منداڵێك کە میز بکاتە جێ وە بۆ پێوەدانی مێشوولەو شتە، وە نەهێشتنی بەڵەکی و سیل و بۆ شتیتریش، وەکوو لەش کرژ بوون و دەردی گورچیلە.

✓ یەکێ مووەرێزەی هەبێ - داءالثعلب - پێستی ژیشك بسووتێنێ و لەگەڵ زفت تێکڵاوی کاو پێ بهەنوێ بۆی باشە.

✓ گونی سووچڕ بکوڵێنرێ و لەگەڵ هەنگوینی سافدا تێکڵاو بکرێ، ئەگەر یەکێ بیخوا شەهوەتی زۆر بەهێز ئەبێ.

✓ یەکێ سێبەڕۆی بێ نینۆکی چەمۆڵەی ڕاستی ژیشك لە ژێر داوێنیا بسووتێنن چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی سپی بوو بێ، زراوی ژیشك بهێنێ بە چاویا سپێتیەکەی لا ئەچێ.

✓ ئەگەر یەکێ سەرەتای گولیی لێ دەرکەوت، وەیا سیسی هەبوو، وەیا سك چوونێکی بێئامانی هەبوو زراوی ژیشك بخوات بۆیان باشە.

✓ ئەگەر یەکێ لە ژن بەسترابوو بە پیو و خوێن و چەمۆڵەی ژیشك خۆی بهەنوێ ئەکرێتەوە.

یەکێ ئەگەر سپڵی هەبوو سپڵی ژیشك لەگەڵ هەنگوین تێکڵاوکاو بیکا بە وەکوو شەربەت و بیخواتەوە سپڵەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر ژیشکێك بە چەقۆیەك کە هیچ خوێنێکی نەدیبێ سەر ببڕێ، ئەو سەرەی هەڵواسرێ بە لەشی شێت وەیا فێدار وەیا یەکێ ئەقڵی تێكچوو بێ چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ لەرز و تای هەبێ هەندێ لە قاچی ڕاستی ژیشك بە زیندوێتی ببڕن هەڵیواسن بەو کەسەدا بە بێ ئەوە خۆی پێی بزانێ لەرزو تاکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ چاوی ڕاستی ژیشك لەگەڵ ڕۆنی کونجیدا بکوڵێنن و بیخەنە ناو حاجەتێکی مسی پاکەوە تا ماوەیەك، هەر کەسێك ئەمە بە میل بهێنێ بەچاویا هەموو شت بە ڕۆژ چۆن ئەبینێ بە شەویش بەو جۆرە بە ئاشکرا ئەیبینێ.

✓ ئەگەر بتەوێ یەکێك بخەوێنی بێنە چاوی چەپی ژیشك لەگەڵ ڕۆنی زەیتووندا

بکوڵێنەو بیکەوە ناو گۆزەڵەیەکەوە تا ماوەیەك، پاشان چیلکەیەك هەندێ لەوە بکە بەسەرەکەیەوە و نزیکی لووتی ئەو کەسەی بکەرەوە خەوی لێ ئەکەوێ.

✔ ئەگەر یەکێ سێبەرۆی هەبوو دڵی ژیشکی پیا هەڵواسن لە کۆڵی ئەکەوێ.



## قۆڕی

قۆڕی دەعبایەکە لە ڕەسەنی مارمێلکە و پیرێژنەسەرە، ئەوەندە هەیە ئەم گەلێ گەورەترە، نوختە نوختەی جوانی تێدا هەیە، پەنجەکانی وەکوو هی بەنیئادەم لێك کراونەتەوە، کلکێکی درێژی هەیە، هەتا بلێت گورج و بەتەوژمە، زۆر زۆر سووکە لە هەڕاکردنا، دوژمنی باوە کوشتەی مارمێلکەو پیرێژنەسەرەو مارە، ئیشی ئەم قۆڕییە ئەوەیە ئەچێ کونی مارمێلکەو مار ئەدۆزێتەوە خۆی ئەکا بە کونەکەیانا، بەزۆر کونەکەیان لێ داگیر ئەکاو خۆشیان ئەکوژێ، ئەگەر کونەکە هی مار بوو کونەکەی لێ داگیر ئەکاو مارەکە قووت ئەدا، ئەگەر هی مارمێلکە بوو هەر ئەیکوژێ و کونەکەی لێ داگیر ئەکا ئیتر نایخوا. ئەم قۆڕییە هەر چەندە چڕنووك و دەست و پلێکی لەباری هەیە بۆ کون هەڵکەندن بەڵام لەبەر ئەو تەبیعەتی ستەمە کە هەیەتی قەت کون هەڵناکەنێ ئەچێ لە پیرێژنەسەرەو ماری زەوت ئەکا، لە ناو گیانلەبەرەکانا کەم حەیوان هەیە بە ئەندازەی ئەم بیەرێ.

✔ خواردنی گۆشت و پیوی قۆڕی بۆ ژن قەڵەوی ئەکاتەوە.

✔ مووی قۆڕی ئەگەر ژنێك بیبەستێ بە قۆڵیەوە تا پێی بێ زکی پڕ نابێ.

✔ ئەگەر دڕك وەیا دەرزی چوو بە شوێنێکاو دەرنەئەهات گۆشت و پیوی قۆڕی پێکەوە بکوتن و بیخەنە سەری ڕایئەکێشێ.

✔ ئەگەر یەکێ ئەندامێ لە ئەندامەکانی لەشی سستی بەسەر هاتبوو خاو بووبووەوە پێستی قۆڕی بسووتێنێ، خۆڵەکەی لەگەڵ ڕۆنی زەیتووندا تێکڵاو بکاو بیخاتە سەری چاك ئەبێتەوە.

## کرم



کرم گەلێ جۆری هەیە؛ مۆرانە، کرمی ناو سرکە، کرمی میوە، کرمی پیسایی، کرمی ئاوریشم، کرمێ کە لەسکی ئینسانا پەیدا ئەبێ. کرمی میوە کە هەر لە میوەکە پەیدا ئەبێ و بەرە بەرە ئەو میوەیە پەك ئەخا، کرمی ناو سرکە لە بەڵخی سرکەکەو کەرووی ترێیە تورشاوەکە پەیدا ئەبێ، کە سرکەکە بە تەواوی پێ گەیشت و بوو بە سرکە کرمەکەش وردە وردە لە ناو ئەچێ، کرمێ کە لەسکی ئینسانا پەیدا ئەبێ ئەمەش دوو جۆرە؛ جۆرێکی پێ ئەڵێن سەفی ئەمە هەر یەك کرمە بەڵام کرمێکی بەڵایە ئینسانەکە هەر شتێك ئەخوا ئەو ئەیقۆزێتەوەو ئەیخوا، ئەمەیان بەرە بەرە زل ئەبێ، ئەبێ بە خەتەر لەسەر ئینسانەکە، جۆرەکەی تریان وردە کرمە ئەمەیان لەوانەیە لەگەڵ پیساییدا دەرچێ بەڵام لەبەر ئەوە کە زۆرە دوایی نایەت، ئەو کەسەی کرمی هەبێ دائما ڕەنگ زەردو بێتاقەتە، ئەم جۆرە کرمە ئەگەر یەکێ هەیبوو لە ناشتا چەند ڕۆژێك خورما بخوا کرمەکەی ئەخا. هەروەها ئەگەر یەکێ کرمی هەبوو گەڵای قۆخ ـ هەشتاڵوو ـ بنێ لە ئەژنۆی و بیبەستێ کرمەکەی ئەخا. ئەو کرمانەی کە لەناو شیاکەو شتا پەیدا ئەبن ئەگەر بهێنرین لەگەڵ ڕۆنی زەیتدا بیکوڵێنن جوان جوان تا ئەبێ بە مەعجوون، پاشان ئەگەر یەکێ مووەڕێزەی هەبێ ئەو شوێنی پێ بهەنوون مووەڕێزەکەی نامێنێ، مووەڕێزە ـ داء الثعلب.

کرمێکی تر کە هەیەو کرمی ئاوریشم، ئەمە زۆر سەیرە، سەرەتا ئەمە کرم نییە بەڵکوو بە ئەندازەی ناوکی هەنجیر وەیا ئەو تۆوانە کە لەناو هەنجیردایە، لە سەرەتای بەهارا ئەم تۆوە دێنن و ئەیکەنە ناو پارچە شتێکەوە، لە شوێنێکی نە ساردو نە گەرمدا دایئەنێن، ئەگەر نەبوو ئافرەت پارچەکە ئەخاتە ژێر مەمکیەوە تا حەفتەیەك ئەو گەرماییە پێکی دێنێ. کە هەڵهات لە گەورەیی و ڕەنگیا وەکوو گاڵ وایە، کە گیانی تێ کەوت گەڵای داری تووی سپی بۆ ورد ئەکەن و ئەیخەنە بەری ئەیخوا، وردە وردە گەورە ئەبێ تا ئەبێ بە ئەندازەی پەنجەیەك، سەرەتا ڕەشە پاشان سپی هەڵئەگەڕێ، ئەمە تا ماوەی شەست ڕۆژێکی پێ ئەچێ، ئەمجا ئەکەوێتە تەنین، بە لیکێ کە لە دەمیەوە دەرئەچێ هەموو

دەورو بەری خۆی وەکوو جاڵجاڵۆکە ئەتەنێ، تا ئەوەی لە سکیایە تەواو ئەبێ، ماڵەکەش کە لەم ماوەیەدا دروستی ئەکا ئەبێ بە ئەندازەی گوێزێك، ئیتر خۆی تیا بەند ئەبێ و ڕێگای دەرچوونی نامێنێ، تا دە ڕۆژێك وا ئەمێنێتەوە، پاشان بۆ ئەوە خۆی ڕزگار کا ماڵەکە کون ئەکا، بە جووڵە جووڵ دەرئەچێ، دوو باڵی لێ پەیدا ئەبێ، لەم کاتەدا نێرو مێیەکە جووت ئەبن، نێرەکە کلکی ئەنووسێنێ بەکلکی مێیەکەوەو ماوەیەك ئەمێنێتەوە پاشان لە یەك جیا ئەبنەوە، مێیەکە تۆوەکە پەیدا ئەکاو شتێکیان لە ژێرا ڕائەخەن تۆوەکە ئەکاتە سەر ئەوە، پاشان ئەمرن، ئەمە ئەگەر تۆویان لێ بویسترێ ئاوایە، خۆ ئەگەر ئاوریشم بویسترێ کە لە تەنین بوونەوە لەپاش دە ڕۆژ ئەیخەنە بەر هەتاو، بە ماوەی ڕۆژێك یا کەمتر ئەمرن و لە تەنراوەکە حەریرو شتە دروست ئەکرێ.

ئەم کرمی ئاوریشمە لە دەنگی هەور، تەقەی تەشت و شتە، زرنگەی ئاوەنی، بۆنی سرکە، دووکەڵ ئەمرێت، ئەبێ لە مشك، چۆلەکە، مێروولە، مارمێلکە بپارێزرێ، هەروەها شوێنەکەی ئەبێ نە زۆر گەرم بێ نە زۆر سارد.

✓ یەکێ مارو دووپشك وەیا جڕوجانەوەریتر پێوە بدا، کرمی ئاوریشم لەگەڵ زەیتدا بسوونەوە لێی دەن چاك ئەبێتەوە، ئەم کرمی ئاوریشمە ئەگەر دەربهێنرێ و بدرێ بە مریشك ئەوەندە قەڵەو ئەبێتەوە هەر نەبێ.

## کوله



کولە دەعبایەکە لە هەموو دەعباو گیانلەبەرێك ترسێنەرترو سەیرترە، گەلێ جۆری هەیە؛ گەورە، بچووك، سوور، زەرد، سپی لە زمانی کوردیدا شتێك کە باسی زۆریەتی بکەن ئەڵێن «ئەڵەی کولەیە ئەوەندە زۆرە». هەندێکیان ئەفڕن سوارەن، هەندێکیان بەسەر زەویدا ئەڕۆن پیادەن، گەلێ جار وابووە کە چوون بە ئاسمانا بەری ڕۆژیان گرتووە. کولە شەش پێی هەیە، دوانی لای سینگیەوەیەتی، دوانی لە ناوەڕاستیەوە، دوانی لە دوایەوە، پێیەکانی وەکوو هەرە

وانە، دوو باڵیشـی هەیە، کولە لەو حەیواناتەیە کە سـەر بۆ سـەرۆکی خۆی دائەنەوێنێ، کـە سـەرۆك و سـەرەتاکەی چـوون بە شـوێنێکا ئەوانی‌تر ئیتر شـوێنیان ئەکـەون، ئاو بێ ئاگر بێ هەر شتێك بێ بەسەریا ئەڕۆن، لیکێکی هەیە ئەم لیکەی زەهرێکی تەواوە بۆ گژوگیا، بەتایبەتی دەغڵ و دان هەر بکەوێتە سەری لەناوی ئەبا.

کولە گەرای هەیە لەکاتی بەهارانا بەدەم گەڕانەوە شـوێنێکی سـەختی ڕەقی بەرداوی ئەبینێتەوە لە ئەرزاو لە سەری ئەنیشێتەوە، کلکی ئەباتە ناو ئەرزەکەو گەراکەی لێ ئەخا، ئەم گەرایە لەناو قاوخێکایە، نەوەدو نۆ دانەیە، ئیتر بەجێی دێڵێت، کە هەوا خۆشی کرد گەرایەکـە ئەژێتـەوەو وردە وردە سـەرئەکەوێ، سـەرەتا وەکـوو مێشـێکی پچکۆلـە، پاشـان وەکـوو کـرم، ئەمجا شـکڵی کولـەی لـێ ئەنیشـێ و لەو ناوەدا دەسـت ئەکا بـە خواردنی گژوگیـای ئـەو ناوە، پاشـان باڵی لێ پەیدا ئەبێ و ئەکەوێتە ئاسـمان. ئـەو گەرایانەش کە بوون بە کولە ئەوانیش وەکوو پێشینەکانی خۆیان گەرا دائەنێن هەر یەکە نەوەدو نۆ گەرا.

ئـەو ئـەرزەش کـە گەراکـەی تیا دائەنێن ئەوەندە سـەختە پاچ و بێڵ بە زەحمەت کاری تـێ ئـەکا کەچـی ئـەو بەکلکـی کونـی ئـەکا. ئەم گـەرا کولانە کـە ئەژێنەوە تەنها دوو شـتی تەبێعی هەیە کە لەناویان بەرێ؛ سەرماو باڵندە. هەندێ کولەی زلیش هەیە پێیان ئەڵێن شێرە کولە ئەمانە دڕن. کەم حەیوان هەیە دوژمنی خواردەمەنی ئینسان بێ وەکوو کولە.

لە کولەدا شـتی زۆر سـەیر هەیە، لەگەڵ ئەوەدا کە گیانلەبەرێکی بچووك و بە تەنیا خـۆی بێ‌هێـزە لـە دروسـت بوونەکـەیا لـە دە گیانلەبەری هـەرە بەهێزی حەیوانات شـتی وەرگرتووە و لەوان دروسـت بووە: لە سـەرو ڕوومەتا سـەرو شـکڵی لە ئەسـپ وەرگرتووە، دوو چاوەکانـی لەفیـل وەرگرتـووە، گـەردەن و ملـی لـە گا وەرگرتـووە، شـاخەکانی لە کەڵە کێوی وەرگرتووە، سینگ و بەرۆکی لە شێر وەرگرتووە، سکی لە دووپشك وەرگرتووە، دوو باڵەکانی لە «پیرۆزە - نەسر» وەرگرتووە، هەر دوو ڕانی لە حوشتر وەرگرتووە، هەر دوو پێ لە حوشتر مورغ وەرگرتووە، کلکیشی لە مار وەرگرتووە!...

✓ کولـە ئەگـەر ڕووی کـردە گوندێـك خەڵکـی گوندەکـە لـە پێش هاتنـی کولەکـەدا گوندەکـە چـۆڵ بکـەن و بەجێـی بێڵن بـە جۆرێکی وا کەسـیان نەمێننـەوە، کولەکان کە هاتـن و کەسـیان نـەدی ئیتـر لانادەن و زیان بـەو دێ ناگات، وەیا بێنـن هەندێکیـان لـێ

بسووتێنن ئەوانی‌تر کە بۆنیان کرد لانادەن و ئەڕۆن وەیا ئەکەون و ئەمرن.

✔ ئەگەر یەکێ سێبەڕۆی هەبوو لەو کولە مل درێـژەکان وەیا قاچ درێژەکان بگرێ و بیکا بە خۆیا سێبەڕۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✔ یەکێ بالووکی هەبوو بە قاچی کولە بیهەنوێ نامێنێ.

✔ یەکێ ئەگەر مایەسیری هەبوو وەیا بە زەحمەت میزی ئەکرد کولە بێنێ بیسووتێنێ و ناو گەڵی بگرێ بە دووکەڵەکەیا چاك ئەبێتەوە.

✔ یەکێ ئیسقای هەبوو دوانزە کولە بێنێ ملی هەڵکێشێ و قاچ و باڵ و شتەکەی لێ بکاتەوە، پاشان لەگەڵ هەندێ «ئاس»ی وشکدا تێکڵاوی بکاو بیخوا ئیسقاکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

## كێچ



کێچ دەعبایەکی بێ‌فەڕی بە عەزیەتە، زۆرتر کە پەیدا ئەبێ لە شوێنی تاریك و نمناك ئەبێ، لە ئاخری زستان و سەرەتای بەهارا زیاتر پەرە ئەستێنێ، شکڵی وەکوو فیل هەڵکەوتووە، دانی هەیە قەپی پێ ئەگرێ، لووتێکی درێـژی هەیە وەکوو خورتوومی فیل خوێنی پێ ئەمژێ. ڕەنگی ڕەشکارە، پشتی کۆماوەتەوە، بەلاواز دیارە، ئەچێتە ناو جلوبەرگی ئینسان و لەوێوە ئەچێتە سەر گۆشتەکە، زیاتر لە دەورگەڵ و قنگی ئینسانا هەڵئەخاتەوە، زۆر زۆر ئازایە بۆ بازبردن، کە ئینسان چاوی پێ کەوت وەیا هەستی پێ کرد بۆی دەرئەچێ، قەت ڕووەو پێشەوە باز نادا، بەم لاو بەولاو بەدواوە ئەڕوا بۆ ئەوە سەر لە ئینسان تێك بدا، پێنج ڕۆژ عومر ئەکا، ئەسپێ کە لە لەشا بێ ئەیخوا، گەرا دائەنێ و بەچکەشی ئەبێ، کێچ یەکێکە لەو جانەوەرانە کە زۆر ئەپەڕێ، هەندێك ئەڵێن کێچ لە ئەنجاما ئەبێ بە مێشوولە، هیچ شتێك وەکوو کێچ خەو تێك‌دەر نییە، مەگەر من خۆم بزانم کێچی شارەزوور چی کردووە پێم، ئەچوومە سەرکەپریش هەر خەوی لێ هەراسان ئەکردم، بەڵام کە بۆنی ژاڵە بکا ئەمرێ. لەناو کورددا ئەڵێن کێچ هەتیوو بازە!...

✓ ئەگەر لە ماڵێکا کیژ زۆر بوو چاڵێکی تیا هەڵکەنن و ژاڵە بخەن بەسەریا هەموو کێچەکان ئەچنە ناو ئەو چاڵەوەو ئەمرن.

✓ ئەگەر «ڕەشکە - سیاوڵە» بکوڵێنن و ئاوەکەی بپرژێنن بە ناو ئەو ماڵەدا کە کێچی هەیە هەموو کێچەکان ئەکوژێ.

✓ ئەگەر یەکێ کێچ چووە گوێچکەی ڕاستیەوە بە دەستی ڕاستی هێلکە گونی چەپی خۆی بگرێ، ئەگەر چووە گوێچکەی چەپییەوە بەدەستی چەپی هێلکە گونی ڕاستی بگرێ کێچەکە دێتە دەرەوە.

## کیسەڵ



کیسەڵ دەعبایەکی سەیرە، قاوخێکی کۆماوەی زۆر قایمی هەیە کە بەم قاوخەی ئاگاداری خۆی پێ ئەکا، کە بریندارش ببێ خوێنی لێ دێ، لە چوار لاوە چوار چەمۆڵەکەی دەردێنێ لەگەڵ ملیاو وردە وردە ئەکەوێتە ڕێ بەرەو ناو باخەکان، هیچ عەزیەتی خۆی لە ڕۆیشتنا نادات، کیسەڵ لە وشکانیا هێلکە ئەکا ئەوەی بکەوێتە ناو ئاوەوە ئەبێ بە «رەقە» ئەویش هەر لە وشکانیا بمێنێ ئەبێ بە کیسەڵ.

کیسەڵ لەبەر ئەوە ژێر سکی ڕەقەو گەرمایی نییە بە کەڵکی ئەوە نایە وەکوو گیانلەبەری‌تر لەسەر هێلکە دانیشێ و هەڵی‌بێنێ، هەڵهێنانی ئەم بە سەیرکردنە، هێلکەکە ئەکاو چاوی تێ ئەبڕێ زۆر بە تیژی بەم جۆرە هێلکەکەی هەڵدێ، لەکاتی جووت‌بوونی نێرەکە لەگەڵ مێیەکەدا زۆر زۆری پیوە ئەبن، بە دەم ڕێگەشەوە هەر خەریکن، ئەگەر مێیەکە مل‌نەداتە بەرەوە بۆ نێرەکە، نێرەکە گیایەك هەیە ئەچێ ئەو گیایە ئەگرێ بە دەمەوەو ڕوو بە ڕووی مێیەکە دێت ئیتر مێیەکە بەرهەڵستی ناکا، نێرەکەیان دوو کێری هەیەو مێیەکەش دوو قوز، کیسەڵ مێملی مارە، مارەکە ئەگرێ لە کلکیەوەو سەر ئەباتەوە قاوخەکەی خۆی و ئەیمژێ، مارەکەش ئەوەندە خۆی ئەدا بە عەرزەکەدا هەتا ئەتۆپێ و پاشان ئەیخوا.

کیسەڵ تریٚ خۆریشە، چ کیسەڵ و چ ڕەقە هی وایان هەیە ئەوەندە زل ئەبێ هەر بە دوویان ئەبن بە باری گوێ درێژێك ئەگەر ژاری مار کاری تێ کرد گیای «سقر» ئەخوا ئیتر هیچی پێ نایە.

ڕەقەکانیش بەشی خۆیان شت ئەزانن، لەناو ئاوەکە دێنە ئەو شوێنانە کە تەیرو تیوور ئەچن بۆ ئاوخواردنەوە، خۆیان ئەپلکنن لە لمەکەوەو بە هەست لەو ناوەدا خۆیان ئەخەن، ڕەنگیان وەکوو ڕەنگی بەردێکی سەر ئەرزەکەی لێ دێ، مەلەکە ئەچێ بەلایا نازانێ لەناکاو ئەویش پەلاماری ئەدا کوێی بەردەم کەوت ئەیگرێ و ئەیباتەوە ناو ئاوەکە تا ئەخنکێ پاشان ئەیخوا. کیسەڵ زۆر گێل گەوجیشە.

✓ ئەگەر سەرمایەکی زۆر دای بەسەر شوێنێکاو خەڵکەکە ئەترسان ئەو سەرمایە زیان بە شوێنەکە بگەیەنێ، کیسەڵێك بێنن بیخەنە سەر پشت بە جۆرێك کە دەست و قاچی ڕووەو ئاسمان بوەستێ، ئەو سەرمایە ئیتر زیان بەو ناگەیەنێ.

✓ ئەگەر جومگەی ئینسان هاتە ژان بەخوێنی کیسەڵ بیهەنوێ ژانەکەی ناهێڵێ.

✓ ئەگەر یەکێ دەستی وەیا قاچی دەمارەکانی لەبەر سەرما وەیا گەرما هاتنەوە یەك کووڕ بوون و لەوانە بوو ڕەپ ببێ هەموو جار بەخوێنی کیسەڵ بیهەنوێ تا ماوەیەك چاك ئەبنەوە. هەروەها خواردنی گۆشتەکەشی ئەو ئیشە ئەکا.

✓ ئەگەر یەکێ هەرکام لە ئەندامەکانی لەشی دایە ژان ئەو ئەندامەی کیسەڵ بخاتە سەری چاك ئەبێتەوە.

✓ خوێنی کیسەڵ بهێنرێ وشك بکرێتەوەو پاشان بیهاڕنەوە، چرا وەیا پیر سۆزێکی پێ بهەنوون، هەرکەس ئەو چرایە داگیرسێنێ دەست ئەکا بە تڕ کەندن!

✓ نێری کیسەڵ لەو کاتەدا کە دێتە جۆش ئەگەر یەکێك تۆزێ لە کێرەکەی ببڕێ و لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ ئەویش هێزی چوونە لای ژنی زۆر ئەبێ.

✓ ئەگەر یەکێ فێی هەبوو زراوی کیسەڵ بدرێ بە لووتیا فێکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ هێلکەی کیسەڵ بەکەڵکە بۆ کۆکەی مناڵ و بۆ فێدار.

✓ ئەگەر لە پێستی کیسەڵ سەرە دیزەیەك دروست بکرێ و بخرێتە سەر مەنجەڵ وەیا دیزەیەك، هەرچەندە ئاگر لەژێر ئەو دیزەیەدا بسووتێنن هەر نایەتە کوڵ.

✓ ئەگەر یەکێ ئاوساوی کەوتە جومگەو پەنجەکانی پێی، کە پێ ئەڵێن «نقرس» قاچی کیسەڵی پێوە ببەستێ چاك ئەبێتەوە، ڕاست بۆ ڕاست و چەپ بۆ چەپ.

## قالۆچە



قالۆچە کە قۆلانجەشی پێ ئەڵێن دەعبایەکی زۆر ڕەشی مەیلەو خڕی قاچ زۆرە، ئەم قالۆچەیە دوو جۆرە؛ قالۆچەیەك هەیە هەروەها لەکەلێن و قوشبنی ئاوەداندا هەیەو لە دەشتیشا هەیە، ئەمەیان زۆرتر لە گەوڕی گاو ڕەشەوڵاخا ئەبێ بەلای ئەوانا ئەڕوا، عادەتی وایە شیاکەو شتە کۆ ئەکاتەوەو هەڵیئەگرێ، لەگەڵ دووپشکدا دۆستایەتیان خۆشە، ئەمە ئەچێ قەپ ئەگرێ لە زەهای ئەو ماڵاتانە کە لەگەڵیانا ئەژیت، ئەوانیش ناچار لە دەستی هەڵدێن. ئەمانە نێرەکانیان شاخیان هەیە، سەرەتا خۆیشیان لە شوێنی سەنێراوی و نمناکیدا پەیدا ئەبن. ئەم جۆرە ئەگەر بیانگری و بیانخەیتە شوێنێکی پاك و بۆن خۆش ئەمرن، کە بیانخەیتەوە شوێنە پیسەکە زیندوو ئەبنەوە. ئەم جۆرە قالۆچەیە کە لەدەشتا هەبوو هەر لەم ڕەسەنەن بەڵام ئەوان شەش قاچیان هەیە، پشتیان قوتە، دووباڵیان هەیە لە ڕواڵەتا هیچ دریار نییە بەڵام کەبیەوێ بفڕێ خۆی فش ئەکاتەوە باڵەکانی دەرئەکەوێ، لە ڕۆیشتنیا بەرەو دوا ئەڕوا، واتە پاشەو پاش ئەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەوەشا ئەزانێ بچێتەوە کونەکەی خۆی و لێی ون نابێ، ئەگەر ئینسانێك لە دەشتا بخەوێ ئەو پاسەوانی ئەکا، ئەو کەسە ئەگەر هەستا بچێ بۆ سەر ئاودەست ئەو شوێنی ئەکەوێ بۆ ئەوە پیساییەکەی بخوا. ئا ئەم جۆرە قالۆچەیە ئەگەر یەکێ دووپشك پێوە بدا قالۆچەیەك لەمانە بهێنرێ هەر وا بە ساغی وشك بکرێتەوەو بەبێ ئەوە تێکڵاو بەهیچ شتێکی‌تر بکرێ، بخورێ بۆ نەمانی ژانی دووپشکەکەو بڵاوبوونەوەی ژارەکەی قازانجی زۆرە. ئەم جۆرە قالۆچەیە دەشتەکییە لەو دەشتەدا پەین و شیاکە کۆ ئەکاتەوەو وەکوو هەڵمات خڕی ئەکاتەوەو خۆی پێوە ئەگلێنێ و ئەڕواو ناشزانێ بۆ کوێ ئەڕوا!

جۆرەکەی‌تری قالۆچە، قالۆچە بۆگەنکەی پێ ئەڵێن، ئەمە هەر لە دەشتایە، بۆنێکی پیسی لێ دێ، بەتایبەتی کە دەستی پێوە بدرێ ئەتسێ ئەو ناوە پڕ ئەکا لە بۆگەن، بەینی ئەم جۆرەیان لەگەڵ دووپشکدا گەلێ خۆشترە لەوی‌تر، ئەم ئەچێتە کوڵی دووپشك و دووپشکیش ئەچێتە کوڵی ئەم، ئینسان بیەوێ ئەم جۆرە قاڵۆچەیە لە شوێنێك نەبێ کەرەوز بخاتە ئەو ناوە ئەوان هەڵدێن. ئەم جۆرە هەر بە تەواوی لە شیاکەو تەرسی ڕەشەوڵاغ پەیدا ئەبێ.

✓ یەکێ مایەسیری هەبێ ئەم قالۆچە بۆگەنکەیە لەناو ڕۆنی زەیتدا بکوڵێنێ و بیهێنێ بە مایەسیریەکەیا نامێنێ و لائەبا.

✓ یەکێ چاوی زۆر ژان بکا یەکێ لەم قۆلانچانە بینێ بیکا بە دوو کەرتەوە، میلێك بێنێ بەو ڕتووبەتەیدا کە لە ناویایەو میلەکە بهێنێ بە چاویا چاوێشەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ گوێچکەی زۆر گران بێ قالۆچەیەك لەگەڵ ڕۆندا بکوڵێنێ و لێی بتکێنێتە گوێچکەی کەڕیەکەی نامێنێ.

✓ هەندێ برین هەیە زۆر پیسەو علاجی نایەت، ئەم قالۆچە بۆگەنکەیە وشك بکرێتەوەو پیایا بپرژێنرێت برینەکە چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر سەری ئەم قالۆچە بۆگەنکەیە لە شارە کۆترا دابنرێ کۆترێکی زۆر لەو شوێنە کۆ ئەبێتەوە.

✓ ئەو ڕتووبەتەی کە لە ناوسکی ئەم قالۆچەیەدایە یەکێ بیهێنێ بەچاویا چاوی تیژ ئەبێ، تاریکایی نامێنێ، ئاو بکا ئاوەکەی نامێنێ.

✓ گوێچکە کە ژان بکا قالۆچە بۆگەنکەیەك لەگەڵ ڕۆنی کونجیدا بکوڵێنرێ و تێی بکرێ هیچ ژانێکی تیا نایەڵێ.

✓ یەکێ دووپشك پێوەی بدا یەکێ لەم قالۆچانە زك هەڵبدڕن و بیخەنە سەری ژانەکەی ئەشکێنێ.

✓ برین کە هەبوو قالۆچە بۆگەنکە بسووتێنن و خۆڵەمێشەکەی پێوەکەن خۆش ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ بە ڕێکەوت یەکێ لەم قالۆچە بۆگەنکانە بخواو پێی نەزانێ دیارە، قالۆچەکە تا چووە ناوسکی هەر زیندوو بوو، هەر خێرا ئەو کەسە ئەکوژێ و ئەمرێ.



## قرژاڵ

قرژاڵ کە قرژانگیشی پێ ئەڵێن دەعبایەکە لە ئاوو لە وشکانیا ئەژی، ئاو و هەوا پێکەوە وەرئەگرێ، تیژ ئەڕوا، دوو سەری هەیە، چنگ و نینۆکی تیژی هەیە، ددانی زۆری هەیە، هەموو لەشی ڕەقە بە تایبەتی پشتی، کە تۆ سەیری ئەکەی وا ئەزانی ئەمە دەعبایەکە نە سەری هەیە و نە کلك، هەیە و نە کلك، دوو چاوی گەشی ڕووناکی هەیە وا لەسەر شانیەوە، تەنانەت کورد کە باسی سافی و بێ خەوشی شتێك ئەکا بە تایبەتی ئاو ئەڵێ: «ئەڵێی چاوی قرژانگە». دەمی وا لەسەر سینەوەیە، لە هەردوو لاوە لاشەویلکەکانی هەڵدڕاون، هەشت پێی هەیە، لەسەر یەك لا ئەڕوا، کە قەپی گرت لەیەکێ بەزەحمەت بەرەڵای ئەکا.

کورد لەسەر ئەمە قسەیەکی هەیە ئەڵێ: «کە قرژاڵ گازی لە یەکێ گرت تا کەر لەبەغدا نەزەڕێنێ بەرەڵای ناکا!.» ساڵێ شەش جار پێست ئەخا، دوو دەرگا بۆ کونەکەی ئەکا، یەکێ لە لای ئاووە یەکێ لە لای وشکانیەوە، کە پێستی خست کونی لای ئاوەکە ئەگرێ لە ترسی ئەوە نەوەك ماسی و شتە بێن بیخۆن، کونی لای وشکانیەکەی بەرەڵا ئەکا تا هەوا لێداو تۆزێ توند ئەبێتەوەو خۆی ئەگرێ ئەوجا لای ئاوەکەش بەرەڵا ئەکاتەوە.

قرژاڵ وەنەبێ لە زاوزێوە پەیدا ببێ بەڵکوو بەهۆی سەدەفەوە پەیدا ئەبێ، واتە قاوخێکی سەدەفەو شتێك لە ناویا پەیدا ئەبێ و ئەبێ بە قرژاڵ، قرژاڵ لە ئاو خێراترە تا وشکانی.

✓ ئەگەر لە شوێنێکا قرژاڵێکی مردوو دۆزرایەوەو ئەو قرژاڵە لەسەر پشت کەوتبوو ئەڵێن ئەو ناوچەیە کە ئەو قرژاڵەی لێ کەوتووە دوور ئەبێ لە ئافاتی ئاسمانی.

✓ قرژاڵ هەڵبواسرێ بە داری بەردارا ئەو دارە بەری زۆر ئەبێ وە ئەوەی پێوە ئەبێ بێوەی ئەبێ.

✓ ئەگەر شوێنێك دەرزی وەیا دڕکێکی وای پیا چوو بوو دەر نەئەهات قرژاڵێك سەر ببڕن و لێ بنێن ئەیکێشێ و دەری ئەهێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ سیلی هەبوو گۆشتی قرژاڵ بخوا بۆی باشە ئەگەر لەگەڵ شیری ماکەردا بێ باشترە.

✓ ئەگەر یەکێ پشتی ژان بکا قرژاڵ بخوا ژانەکەی نامێنێ و پشتیشی توند ئەبێتەوە.

✓ یەکێ مایەسیری هەبوو قرژاڵ بسووتێنن و بە خۆڵەمێشەکەی شوێنی مایەسیریەکە پڕکەنەوە مایەسیریەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ مار وەیا دووپشك پێوە بدا قرژاڵی لەسەر دانێن ژانەکەی ئەشکێ و نامێنێ.

✓ ئەڵێن ئەگەر مانگ لەدەوری ئاخریا بوو یەکێ سەری قرژاڵ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ خەوی لێ ناکەوێ، ئەگەر خۆ لە دەوری ئەوەڵیا بوو خەوی لێ ئەکەوێ.

✓ ئەگەر یەکێك چاوی قرژاڵ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ، کە بنوێ خەوی باش باش ئەبینێ، وە ئەگەر چاویشی ژان بکا ژانەکەشی نامێنێ.

✓ ئەڵێن ئەگەر یەکێ قاچی قرژاڵی پێ بێ  بەراز توخنی ناکەوێ.



## مار

مار ترسێنەرترو بەسامتر گیانلەبەرێکە کە هەیە، هیچ حەیوانێك لەو گەورەترو بە ترسترو بە تەمەنتر نییە، مار تا سەدو پەنجا جۆری هەیە، سی پەراسووی هەیە، هیچ حەیوانێکی تریش نییە کوشندەتر بێ بە خێرایی وەکوو مار، هیچ حەیوانێکی تریش نییە بە ئەندازەی ئەو بێ دەسەڵات بێ لە ڕاکردنا، مەبەست ئەوە نییە کە ڕاناکا، هەڕا ئەکا بەڵام دەوامی لەسەر ئەو هەڕاکردنە نییە، جا چەکی ئەو کە خۆی پێ بپارێزی ئەو ترسەیەتی کە نیشتۆتە دڵی خەڵك، دیسان ئەگەر لەبەر ددانەکانی نەبوایە هەموو منداڵێك ئەیگرت و یاریی پێ ئەکرد. جووتبوونی مار وەکوو دەرکەوتووە وەنەبێ لەو ڕێگایەوە بێ کە حەیواناتی تر هەیانە بەڵکوو ئەمان هەر ئەوەیە نێر و مێ کە خۆیان ئەپێچن بە یەکا، ئەم خۆ پێچانە شوێنی جووتبوونیان ئەگرێ، گەلێ جار بینراوە جووتە مارێك خۆیان پێچاندووە بە

یەکاو لەناو کورددا پیان ئەڵێن عاشقەو ماشقە، ئەگەر یەکێ لەو عاشقەو ماشقەیە یەکێ کوشتی ئەویتر واز نایەنی ئەگەر سەد ساڵیشی پێ چووە تۆڵەی هاوڕێکەی ئەستێنێ لەو کەسە، ئەو کەسە وەختێ دڵنیا ئەبێ مەگەر بۆی ڕێکەوێ بیکوژێ. مار سێ هێلکە ئەکا، نێرەکە لەشوێنی ڕاناوەستێ ئەمەیە کە ئەڵێن مار جێگای بۆ نییە بەڵام مێیەکە لەسەر هێلکەکان ئەوەستێ تا هەڵدێن و بێچووەکانی ئەکەونە گەڕان و لەوانە ئەبن کە ئیتر خۆیان بەخێو کەن، ئەو کاتە دایکەکەیان ئەڕواو بەجێیان دێڵێ، ئەم هێلکانەش کەمیان دێنە ئەنجام چونکە مێشوولە و مێرووڵە پێی فێر ئەبن ئەیانخۆن. هێلکەی مار درێژکۆڵە و ڕەنگیان جیایە، هەیە لێڵە، هەیە سپییە، هەیە سەوزە، هەیە ڕەشە، هەیە نوختە نوختەیە، ئەوانەی کە سپین تیشکێکیان تیا هەیە، لەناو هێلکەکەی شتێك هەیە وەکوو چڵك وەکوو درێژی هێلکەکە بە خەتێك درێژ بووەتەوە، ئەڵێن ئەگەر مووی سەری ئافرەت کەوتە ئاو پاشان هەتاو کاری تێ کرد ئەویش ئەبێ بە مار.

مار تا هەزار ساڵ عومر ئەکا، هەر ساڵێش نوختەیەکی لێ پەیدا ئەبێ بەو نوختانەدا ئینسان ئەزانێ چەندی عومر کردووە، هەر ساڵێ کاژێکیش فڕێ ئەدا، کە لە عومردا زۆر گەورە بوو بە لەش پچووك ئەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشا ماری وا هەیە لە گەورەییدا هیچ حەیوانێك بەقەد ئەو زل نابێ، ئەمانە ئەژدەها گەورەکانن کە لە مێرگەکانا ئەبن، مار زمانی دوو فاقە، کە پێوە ئەدا خۆی هەڵئەگێڕێتەوە، وا دیارە ئەمە لەبەر ئەوەیە ددانەکانی چەوتە دەرنایەن تا خۆی هەڵنەگێڕێتەوە، وە ناوی ددانەکانیشی بۆشە، ژارەکە تلۆقێکە لەبن ددانەکانیەوە، لەو کاتەدا کە خۆی هەڵئەگێڕێتەوە زەهرەکە ئەڕژێتە ناو گۆشتی کەسەکەوە، کە وابوو خۆ هەڵگێڕانەوەکەی لەبەر ڕزگارکردنی خۆیەتی نەوەك لەبەر پێوەدان، مار هەردوو چاوی وەکوو مێخ داکوتراوە بە سەریا، وەکوو کولە وایە، وەنەبێ وەکوو گیانلەبەریتر چاوی بگێڕێت و بسووڕێتەوە، مار ئەگەر چاوی دەرێنن چاوی دێتەوە، هەروەها ئەڵێن ددانیشی هەڵکیشن ئەویش لە پاش سێ ڕۆژ دێتەوە، کلکیشی کە ببڕن ئەویش هەر دێتەوە. مار کە کوێر بوو لەکون بە کوێرە کوێر دێتە دەرەوە و ئەگەڕێ بە شوێن ڕازیانەدا، ڕازیانەی کێوی ئەدۆزێتەوە و چاوی پیا ئەماڵێ ڕووناکیی تێ ئەکەوێتەوە، ئەگەر بەدارێك لێی درا ئەو دارە عەرەقی ئەسپی پێوە بوو ئەتۆپێ. سەیر ئەوەیە مار کە چاوی بە ئینسانی ڕووت

بکەوێ هەڵدێت و هەڕا ئەکا، چاوی بە ئاگرو ڕووناکیی ئاگر بکەوێ بە لایەوە سەیرە ئەچێ بۆلای، شیری ماڵاتی زۆر پێ خۆشە، گەلێ جار لە گوندەکان هەل دەست خۆی ئەخا ئەچێتە سەر مەنجەڵە شیرو تێری لێ ئەخوا، ماستیشی هەر پێ خۆشە.

بینراوە کە منداڵ ماستی بۆ کراوەتە کاسەیەك و نراوەتە بەردەمی دەستی کردووە بە خواردنی و کەسی بەلاوە نەبووە، لەو کاتەدا مار چووە لەگەڵی دەستی کردووە بە خواردن و سەری خستۆتە کاسەکەوە، منداڵەکەش بە دەستەکانی هەر نەیهێشتووەو پێی وتووە بەشەکەی منت خوارد، لە ئەنجاما منداڵەکە سەری مارەکەی گرتووەو کردوویە بە ماستەکەداو بردوویە بۆ دەمی و لێستوویەتەوە، مارەکەش هیچ دەنگی نەکردووە، لەو کاتەدا دایکی منداڵەکە چووە بەسەراو ئەمەی دیوە شڵەژاوەو نەیزانیوە چی بکا، خەڵکیتر هاتوون بەسەراو بڕیاریان داوە وازی لێ بێنن تا منداڵەکەی تێر ئەخواو مارەکە بەرەڵا ئەکا، وایان کردووە لە پاشا کە منداڵەکە مارەکەی بەرەڵا کردووە مارە بۆ خۆی لێی داوە ڕۆیشتووە.

مار لە بناغەداو سەردەمی زۆر کۆن ئاوی بووە، پاشان زەمان هاتووە بەسەراو وشکانی لە ئاو پەیدا بووە و بووە بە دێمی. مار لە بارێکا سێ جۆرە؛ جۆرێکیان ئەوەندە کوشندەیە بە هیچ جۆر دەرمانی نییەو هەر ئەبێ پێوەدراوەکە بکوژێ، جۆرێکیان دەرمان بۆ ژارەکەی هەیەو چار ئەکرێ، جۆری سێیەم هەر ژاری نییە، ئەگەر پێوەدا پێوەدراوەکە لە ترسا ئەمرێ وە نەبێ لەبەر زەهری مارەکە بێ، وا دیارە ئەو ترسە کە ئەچێتە دڵی ئیشێکی وا ئەکا کونە بچکۆلەکانی پێستی ئەکاتەوەو ڕێگا بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو زەهرە نەبووەی مارەکە بەرەڵا ئەکا، وەیا دەمارەکان ئەو ترس و سامە لە حاڵی تەبیعی خۆیان لا ئەداو ورەی کابرا نامێنێ.

هیچ شتێك نییە لە گیانلەبەرەکان بە ئەندازەی مار بەهێزو بەتوانا بێت، ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ ئەگەر هاتو چووە کونەوەو هەندێکی بە دەرەوە ماو ویسترا بکێشرێتە دەرەوە هێز نییە بتوانێ دەری بێنی حەز ئەکا جووتە گایەکیش ڕایکێشێ، یا ئەپچڕێ یا نایەتە.دەرەوە. مار وەکوو ئەزانرێ نە پێی هەیە وە نە نینۆك و چنگی هەیە تا خۆی پێ بگرێتەوە بەڵکوو ئەم هێزەی وا لە پشتیاو وا لە پەراسووەکانیا، هەر لەسەر سەریەوە تا لای کلکی سی پەراسووی هەیە، کە خۆی بەسەر زکا ئەخشێنێ پەراسووەکانی هەموو

ئەکەونە جوولەو پاڵی پێوە ئەنێن بۆ ڕۆیشتن، جا ئەگەر ویسترا لە کون دەربهێنرێ ئەبێ بیگرێت و دەستی بۆ شل کەی، لەو کاتەدا ئەویش خۆی شل ئەکاتەوەو ئەیەوێ بچێ بۆ پێشەوە ئەم خێرا تۆزێ ڕایکێشێ، مارەکەی خۆی ئەگرێتەوەو خۆی توند ئەکاتەوەو، ئیتر ئەم واز بێنێ لە ڕاکێشانی دیسان شلی کاتەوەو وەکوو جاری یەکەم. بەم جۆرە ئەتوانێ لە کونەکەی دەربێنێ بەلام کە گەیشتە نزیکی دەرهێنانی ئەبێ ئاگادار بێ ئەگینا ئەگەر هاتە دەرەوە ئەو پەلاماری ئەم ئەدا خۆی تێ ئەئاڵێنێ و پێوە ئەدا. گەیشتە نزیکی مل و سەری ئەم وریا ئەبێ، ئەمەش بەوەدا ئەزانرێ کە نزیکی سەرو ملی بووەوە باریك ئەبێتەوە چونکە لای مل و سەری باریکە، وردە وردە وا ئەزانێ نزیکی سەری بووەتەوەو لەوانەیە دوایی بێ، ئەبێ لەو کاتەدا زۆر تەڕدەست بێ هەر کە دەری کرد ماوەی ئەوە نەدا مارەکە بکەوێتە خۆی، ئەم ئەوا کلکی بە دەستیەوەیەتی، ئەو کلکەی کە گرتوویەتی و بیسووڕێنێتەوە بە دەور سەریا و گورج بیدا بە عەرزەکەدا بۆ ئەمە بپڕۆکێ جا ئەو وەختە پەلاماری بداو سەری پان کاتەوە. لەو وەختەشا کە دەری ئەکێشێ ئەو کلکەی کە گرتوویەتی نابێ دەستی بگوێزێتەوە چونکە ئەگەر لە کاتێکا کە دەری ئەکێشێ دەستی بگوێزێتەوە بەلای کونەکەوە ئەو مقدارەی کە ئەکەوێتە ئەم لای دەستیەوە خۆی ئەئاڵێنێ بە دەستیاو دەستی بێ‌هێز ئەکاتەوە کە بتوانێ دەری بکێشێ، ئەمجا بە شێنەیی مارە سەر دێنێتە دەرەوەو پێوە ئەدا.

مار ئەگەر خواردنی دەست نەکەوت بە با ئەژی و بە خۆڵ، بەو جۆرە ئەتوانێ ماوەیەکی زۆر خۆی ڕاگرێ، مار گۆشت ئەخوا بەلام گۆشتی زیندەوەری زیندوو نەبێ نایخوا، کە زیندەوەرێکی دەست کەوت هەڵی‌ئەلووشێ و قووتی ئەدا، ئەگەر ئەو زیندەوەرە ئێسکی تێدا بوو ئەچێ خۆی ئەپێچێ بە دار وەیا تاوێرێکاو هێز ئەداتە خۆی تا هەموو ئێسکەکان ورد ئەبن لە ناو سکیا. دیسان مار ئاویشی ناوێ و بە تایبەتیش ناچێتە سەر ئاو بۆ ئاوخواردنەوە، بەلام ئەگەر بۆنی ئاوی کرد ناتوانێ خۆێ ڕابگرێ لە نەخواردنەوەی ئەو وەختە ئەچێ دەمی تێ ئەنێ و ئەوەندە ئەخواتەوە هەتا پێی سەرخۆش ئەبێ وەیا ناتوانێ ئیتر بجووڵێ، گەلێ جار ئەم ئاو زۆرخواردنەوەی ئەبێتە هۆی تۆپینی، زۆر جوانیش ئاو ئەخواتەوە. مار کە دووپشك پێوە بدا ئەگەر خوێ وەیا شوێنێکی خوێیاوی

دەست کەوت بەسەریا بکەوێ ڕزگاری ئەبێ ئەگەر دەستی نەکەوت ئەتۆپێ.

مار لە بارێکی‌ترا گەلێ جۆری هەیە، لەناو کوردا ئەوانەی کە زۆر ناویان هەبێ ڕەشمار، کەوەمار، کوڵەمار، سوجەمار، بۆرەمار، تووڵەمارە، کەوەمار زۆر پیسە. هەندێ مار هەیە هیچ عەزیەت نادا، هەندێکی‌تر هەیە تا پێی پیا نەنی عەزیەت نادا، هەندێکی‌تر هەیە تا پێی بە هێلکە و بەچکەیا نەنێ عەزیەت نادا، هەندێکی‌تر هەیە هەر هیچ عەزیەتی نییە هەر مارێ هەڵسێ ئەیخوا، ماری وا هەیە سەرەتا بۆی ڕێ کەوتووە داویە بە یەکێکەوە وەیا شتێکی خواردووە، ئەوە ئەو مارە چەشە ئەبێ و ڕێ بە ڕێبوار ئەگرێ و شەڕی لەگەڵ ئەکا، گەلێ لەو جۆرانە ڕێگایان بردۆتە بەست و ئیشێکی وایان کردووە کە ڕێبوارو سوار ئەو ڕێگایە تەرك کات. ساڵێك من خۆم لە شارەزوور تووشی شتێکی وابووم.

لەگەڵ مامە شامار بووم، مامە شامار پیاوێکی پیری بەساڵاچووی نوورانی بوو، باسکەکانی وەکوو باسکی پاڵەوان وابوو، چاویشی زۆر کز بوو، نزیکی «قاینەجە» بووینەوە، ئاوێکی تەنکی زۆر پان هەبوو دامان لە ئاوەکە، بە ئەندازەی دوو سێ هەنگاوێکمان مابوو لە ئاوەکە بپەڕینەوە ڕاست لەسەر چەقی ڕێگاکەدا من سەیرم کرد مارێکی گەورە بە قەد دەستەکێك ئەبوو سەری ناوەتە ناو ئاوەکە ئاو ئەخواتەوە، من وتم ئەوە مارە، مامە شامار لەبەر ئەوە چاوەکانی کز بوو وتی دارە، دنیاش بەهارەو ڕۆژ چێشتەنگاوە، لە ئەنجاما بە مامە شامارم سەلمان کە مارەو دار نییە، ڕێگای گەڕانەوەشمان نییە، مامە شامار وتی تۆ لە لایەکی‌ترەوە دەرچۆ لە ئاوەکە من مارەکە فڕێ ئەدەم، مارەکەش کەوە مار بوو، لەولاوە لە ئاوەکە دەرچووم و بەردێکی گەورەم هەڵگرت، مامە شامار بە گاڵۆکە ئەستوورەکەی دەستی کرد بە ژێر مارەکەدا هەرچەندی کرد بۆی ڕاست نەبووەوە، دەستەکەی‌تری هێنایە یارمەتی بە هەر جۆر بوو بەرزی کردەوە، شەلم کوێرم نا پارێزم ماری فڕێ دا، مار بۆچ نەیە لە تەنیشت منەوە بکەوێ، کە کەوت پەلاماری دام بەڵام لەبەر ئەوە ئاوێکی زۆری خواردبووەوە زۆر بە گوڕ نەبوو، منیش هەڕام کرد، کە تۆزێ لێی دوور کەوتمەوە بۆی گەڕامەوەو بەردەکەم بۆ هاویشت، بەرد بۆ نەچێ بنووسێ بە تەپڵی سەریەوە، مار پەپکەی خواردو ئاڵا بە دەردی خۆیەوە، پاشان مامە شاماریش هات ئەو بە گاڵۆکە زلەکەی و من بە بەرد مارەکەمان داگرت و کوشتمان.

پاشان چووینە ئاواییەکە ـ ئاوایی قاینەجە ـ ئیتر ئاگامان لە هیچ نییە، خەڵکەکە وتیان ئەوە لە کوێوە هاتوون؟ وتمان لەو ڕێگەیەوە، زۆر سەریان سڕ ما، وتیان ئەی چۆن مارەکە هێشتی بێن؟ وتمان ماری چی نازانین، ئەوەندە هەیە ئێمە مارێکمان کوشت، وتیان مارێك لەو ڕێگادایە ئەمە دوو مانگ ڕێگاکەی گرتووە نایەڵێ کەس بەویدا بڕوا، کە گوێیان لە کوشتنی مارێك بوو زۆر گەشانەوەو بە شەوقەوە چوون بۆ سەری، سەیریان کرد ئەو مارەیە کە ڕێگای گرتووە، زەلامێك مارەکەی خستە سەر شانی و هێنایەوە بۆ ئاوایی، مارەکە لەم لاو لەولای پیاوەکەوە نزیك بوو سەرو کلکی بگاتە زەوی، ئیتر زۆریش ڕێزیان لە ئێمە گرت بەو بۆنەوە.

جۆرە مارێکی‌تر هەیە درێژیەکەی هەر بستێك وەیا تۆزێ زیاتر ئەبێ، ئەم جۆرەیان بەلایە، لەسەر سەریەوە چەند خەتێکی سپی هەیە وەکوو تاج وایە بۆی، ئەم جۆرەیان بەسەر هەر ئەرزێکا ڕۆیشت چی تێدا هەبێ لە گیاندار و بێ‌گیانی دار و دەوەن ئەیسووتێنێ، ئەگەر پەلەوەرێ بەسەر سەریا تێ پەڕێ لە تاوانا ئەکەوێتە خوارەوە، کە بەرێ ئەکەوێت و ئەڕوا هەرچی گیانلەبەرە لەبەری هەڵدێت، کە ئەهووشێنێ هەر دەعبایەك گوێ لە هووشەکەی بێ ئەمرێ، وە نەبێ هەر بە مردنەکەش لێ بێتەوە بەڵکوو دەکا و چڵ و خوێن لە لەشی دێت[١]، ئەگەر حەیوانێکی‌تریش لەو مردارەوە بووە بخوات ئەویش ئەمرێت، تەنانەت ئەگەر سوارێك بە لاشیا بڕوا سوارەکە دارێکی تێوە بژەنێت خۆی و ئەسپەکەش ئەمرن. هەروەها ئەم جۆرە مارە ئەگەر هەرکەس لە دووریشەوە چاوی پێ بکەوێ ئەمرێ.

جۆرە مارێکی‌تر هەیە هەر چاوی بە ئینسان بکەوێ ئینسانەکە ئەمرێ، جۆرێکی‌تر هەیە ئەگەر هەر ئادەمیزادێك گوێ لە دەنگی بێ ئادەمیزادەکە ئەمرێ. جۆرێکی‌تر هەیە لەسەر سەریەوە سێ گۆپکە هەیە وەکوو تاج وایە بۆی، جۆرێکی‌تر هەیە شاخی هەیە، جۆرێکی‌تر هەیە تووکی هەیە، ئەمانە ئەبن بە ئەژدەها، لەنزیکی کون و شوێنی ئەمانەوە لەبەر گەرمایی هەناسەیان هیچ دارو دەوەن و گیایەك ناڕوێت. گەرمایی

١. [پێدەچێ، ئەم ڕستەیە هەندێکی لێ داکەوتبێ؛ چونکە مانای تەواو نادات بە دەستەوە، وە ئەم داکەوتنەش ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خودی مامۆستا سەججادی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان]

هەناسەیان وەکوو گەرمایی تەنوور وایە. جۆرە مارێکی‌تر هەیە لە دەشتە گەرمەکانا کە لمەکە وەکوو ئاگری لێ دێ ئەچێ لەو دەشتەدا کلکی لە ناو لمەکە توند ئەکاو وەکوو دارێکی ڕاست ڕائەوەستێ، تەیرو تیور دێن وا ئەزانن دارە لەبەر گەرمایی لمەکە نانیشنەوە بەسەر ئەرزەکەدا ئەنیشنەوە بەسەر ئەوەوە، ئەویش پەلاماریان ئەدا ئەیانگرێ و ئەیانخوا، جۆرێکی‌تر هەیە شەڕ لەگەڵ ئینسانا ئەکا، گوڕی خۆی ئەبەستێتەوەو وەکوو تیر خۆی ئەهاوێژێ بۆ ئینسانەکە، ئەگەر بەری بکەوێ وەکوو تیر کونی ئەکا. باسی مارو ژن قەت لەدوایی هاتن نایەت، هەتا قسەی لێوە بکەیت زیاتر قسەی لێ ئەبێتەوە!.

✓ مار کە زانی ئەوا ئەکوژرێ پەپکە ئەخواو ئاگاداری سەری خۆی ئەکاو لەشی خۆی ئەکا بە قەڵغانی سەری، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تا سەری پان نەکرێتەوە ناتۆپێ، لەدوای سەرپان کردنەوەشی تا شەو و ڕۆژێك هەر جووڵەی تیا ئەمێنێ.

✓ ددانی مار لەو سەردەمەدا کە مارەکە زیندووە و ددانەکەی هەڵئەکەنرێ، یەکێ ئەگەر سێبەرۆی هەبێ لەگەڵ خۆی هەڵی‌بگرێ سێبەڕۆکەی نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر ئیسقای بێ، بێنێ گۆشتی مارێك کە چەند ساڵ ژیابی بیخوا ئیسقاکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

✓ پیوی مار بتوێنرێتەوەو لەگەڵ خوێ بدرێ لە مایەسیری، کابرا ڕزگاری ئەبێ لە مایەسیریەکەی.

✓ کاژی مار لەگەڵ سرکەدا بکوڵێنرێ ئەو کەسەی کە ددانی ژان ئەکا قومە قومی پێ بکا لەدەمیا ژانی دانەکەی ئەشکێ.

✓ ئەگەر یەکێ ددانی ژان بکا دانی مار لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ژانەکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ ددانی کرمێ بێ و ژان بکا، کاژی مار بسووتێنێ و خۆڵەمێشەکەی بە ڕۆنی یەکێ لە بۆن خۆشەکانی ـ وەکوو مێخەك بەوێنە ـ بکا بە مەعجوون و بیخاتە سەری ژانەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ ئەگەر بالووکی هەبوو کاژی مار لەگەڵ سێ خورمادا تێکڵاو بکاو بیانکا بە وەکوو هەویرو بیخوا بالووکەکانی نامێنێ. خۆ ئەگەر یەکێ بالووکی نەبێ و ئەمە بخوا قەت دەری ناکا.

✓ ددانی مار کە هەڵکەنرابێ لەکاتی زیندوێتی مارەکەدا هەرکەس پێ بێ، بەهێز ئەبێ، حەواسەکانی ئەپارێزێ، ئاگاداری گەنجێتی ئەکاو بە کەڵکیشە بۆ نەهێشتنی گولی.

✓ خواردنی گۆشتی مار ئەو کەسە ئەپارێزێ لە نەخۆشیە گرانەکان.

✓ کاژی مار لەناو حاجەتێکی مسدا بسووتێنرێ و ئەو خۆڵەی بهێنرێ بە چاودا هەر ژانێك لەو چاوەدا بێ لای ئەباو ئەگەر چاوەکەش شین بێ ڕەشی ئەکاتەوە.

✓ ئافرەتێك بەگران منالی ئەبوو کاژی ماری پیا هەڵواسن زوو منالەکەی لێ ئەبێتەوە.

✓ پێستی مار بسووتێنرێ خۆڵەکەی بهێنرێ بەچاودا، ئەو چاوەی کە تاریکایی و پەردەی لەسەرەو ئاو ئەکا هیچی ناهێڵێ.

✓ گۆشتی مار بکوڵێنرێ و بە ئاوو گۆشتەوە بخورێ چاو تیژ ئەکا.

✓ کاژی مار بخرێتە ناو جل مۆرانە تێی نادا.

✓ یەکی مووەرێـزەی هەبوو (داءالثعلب) مار بە سەرەکەیەوە بکوتێ و بیکا بە مەعجوون و بیخاتە سەر شوێنەکە مووی لێ ئەڕوێت.

## مشك



مشك جانەوەرێکی زیانـدەری بێئامانە، هەرچەندە مشکە بچکۆلەکان لە ڕواڵەتا جوانن، بەڵام بەڵا لە فەسالی خۆیان و جوانیان بدا چونکە زیانەکەیان لە ئەندازە بە دەرە، هەموو جۆرە فڕوفێڵێکی هەیە بۆ ئەوە زیان بگەیەنێ، ئەوەندە بەڵایە ئەچێ فتیلە لەناو چرادا دەردێنێ، ئەوا ئەو سەرەکەی ئەسووتێ ئەم ڕایئەکێشێ بە هۆیەوە خانوو دەغڵ و دان و گیانلەبەری ئەو شوێنە هەموو ئەسووتێ، تووشی کاغەزو دەفتەرو کتێبی نایاب و هەموو جۆرە شتی بەنرخی وا ئەبێ ئەیخواو ئەیقرتێنێ و لەکەڵکی ئەخا، جلوبەرگ و کوننەو کەنوو هەموو یەك ئەخا. خۆی ئەخاتە ناو ڕۆن و هەنگوین و دۆشاوو شتی تەڕی بە کەڵکەوە تیایا ئەتۆپێ و ئەو شتانە هەموو عەدم ئەکا. ئەوەندە بەڵایە ئەگەر یەکێ بریـنداری چنگی

پڵنگ بوو، وەیا گەستراوی دەمی سەگی هار بوو هەر بە دەوریا خولەی دێ، ئەوەی کە پڵنگ بریـنداری کردووە ئەچێ خۆڵ ئەپژێنێ بەسەریا، کە پژاندی بریـندارەکە ئەمرێ، وە یا ئـەوەی سـەگی هـار گرتوویەتی میزی پیا ئەکاو ئەو کەسـەش ئەمـرێ، وەیا مارەنگاز لەو کاتەدا کە کابرا بە دەردی خۆیەوە ئەتلێتەوە ئەم ئەچێ باز ئەدا بەسەریا، کە بازی دا کابرا ئەمرێ. ئەمانە هەموو لەزیانی مشکن.

ئـەم زیانانـەی هەیـە کـە چی بێ فیکریشـە؛ ئەبینی ئـەوا لە کونەکەیایە، سـەر دێنێتە دەرەوە پشیلەیەك لەوێدایە و چاوی پێ ئەکەوێ سـەر ئەباتەوە کونەکەی خۆی، زۆری پێ ناچێ قوت سـەر دەردێنێتەوە لە بیری چووەتەوە کە پشیلەکە لەوێدایە، لە ئەنجاما خۆی ئـەکا بـە نێچیری پشیلەکە! لەگەڵ ئەمەشا ئەوەندە فێڵبازە حسابی ژیانی خۆی چاك ئەزانێ، ئەوا لە دەشتەوە ئەزانێ زستان بەسەرا دێت و ئیتر شتی دەست ناکەوێ بیخوا، لـە هاویـنـانا بـەر ئەبێتە خەرمانـەکان هەر لێ ئـەباو ئەیکا بە ئازۆخەی زستانی و خەرمان بە قوڕ ئەگرێ. وەیا ئەچێتە سەر کۆپەڵە ڕۆنی شتێك کە زانی سەری پیا ناچێ کلکی شۆڕ ئەکاتەوە ناوی و ئەیژەنێ بە ڕۆنەکەداو دەری ئەهێنێتەوەو ئەیلێسێتەوە، بەو جۆرە هەمـووی ئەخوا. وەیا لەناو شتێکا خواردەمەنیەکـی تەڕ هەیەو ئەو دەمی نایگاتێ، ئەچـێ وردە بـەرد دێنـێ ئەیخاتە ناوی بۆ ئەوە بـەو هۆیـەوە خواردەمەنیە تەڕەکە بکەوێتە سـەر بەردەکـەو ئـەم دەمـی بیگاتێ. وەیا ئەگـەر بیـەوێ هێلکـەیـەك وەیا گوێزێك بەرێ، ئەزانـێ بـەو جـۆرە بـۆی نابـرێ دێنـێ ئەیگرێتـە باوەش و دەسـت و قاچـی تـێ ئەئاڵێنـی، مشکێکی‌تر دێ کلکی ئەم ڕائەکێشێ و بەو جۆرە ئەیبەنە کونەکەوە!

وەیا ئەگـەر هاتـوو یەکێکیـان کـەوتـە ناو ئاوی شـتێکەوە لە حاجەتێکا، یەکێکی‌تر دێ ئەزانێ ئەگەر بۆی بچێ بۆی دەرنایە، دێنێ دەستی خۆی لە ڕۆخی حاجەتەکە قایم ئەکاو کلکـی شـۆڕ ئەکاتـەوە، ئـەوی ناو ئاوەکە کلکی ئـەم ئەگرێ، ئەمیش تـەکان ئەداتە خۆی ڕزگاری ئەکا. ئەمانە هەموو لە فڕوفێڵی مشکن بۆ مانەوەی لە ژیاندا.

مشك‌گەلێ جۆری هەیە؛ ئەم مشکە بچکۆلانەی کە لەناو ماڵەکاندان و بۆرکارن، جۆرە مشکێکی‌تر هەیە هەر بە قەد ئەمانەن بەڵام سپی سپی ئەڵێی کلۆی بەفرن، جۆرێکی‌تر هەیـە مشـکە زلەکانـن، ئەمانـە بـە ڕزق ناو ئەبرێن، زۆر دڕن کـەم پشـیلە پێیـان ئەوێرێ.

جارێك من تەڵەم نابووەوە تەڵەکە یەکێ لەم ڕزقانەی گرتبوو، ئەمەی کە گرتبووی مێنگە بوو، نێرەکەی دەردێکی دامێ دەردی وا بە کەس نادرێ، جارێ نەئەچوو بەلای تەڵەکەدا، لە کاتێکا من چاوم لێ بوایە ئەچوو بەلای تەڵەکەدا بە کلك تەڵەکەی ئەتەقان و ئەچوو لەولاوە قوت ڕائەوەستاو سەیری ئەکردم، کە ئەچوومە دەرەوە تا ئەهاتمەوە سەیر ئەکەم کەوتۆتە ناو کاغەزو کتێب و قەڵەم هەر یەکەی بەلایەکدا فڕێ داوەو کاغەزەکانی هەموو قرتاندووە، جارێکی تر کە ئەهاتمەوە کەوتۆتە ناو لێفەو جلوبەرگ هەمووی شڕو وڕ کردووە، کە دائەنیشتم ئەهات بە بەردەمما هەڕای ئەکرد و پەلاماری شتێکی ئەداو تۆزێ دوور ئەکەوتەوە ڕائەوەستا سەیری ئەکردم وەکوو بڵێت پێ ئەوتم ئاوات لێ ئەکەم، منیش هەرچەندم ئەکرد چارم نەئەکرد، تەڵەم بۆ دائەنا تەڵەکەی بە کلك ئەتەقان و هیچ، زەهرم بۆ دائەنا نەئەچوو بەلایا، خۆم پەلامارم ئەدا هەڕای ئەکرد.

شەوێك نووستبووم هات گازێکی گرت لە پەنجەی پێم، بڕوات بێ ئەگەر خێرا ڕانەپەڕیمایە لەوانە بوو پێم بخوا، گەلێ جاریش کە سەیرم ئەکرد لمۆزی ئەجووڵانەوەو جیکەیەکی ئەکردو بۆی دەرئەچوو، ئەو ڕزقە تا چل ڕۆژێك بەم جۆرە عەزیەتی دام، لە ئەنجاما ئەو تەڵەیە کە مێیەکەی پێوە بوو ئەمیشی پێوە بوو ڕزگارم بوو لە دەستی بەڵام زیانێکی زرۆی لێ دام لە کتێب و جلوبەرگ و لێفەو نوێن. ئەم ڕزقانە فرسەت دێنن پارەی زێڕو زیویش ئەدزن و ئەیبەنە کونەکەیانەوە، کە دنیایان بە چۆڵ زانی یەکەیەکە ئەیهێننە دەرەوە خۆیانی لەگەڵا ئەگەوزێننەوەو یاری پێ ئەکەن و پاشان ئەیبەنەوە کونەکەیان.

شەڕی مارو پشیلە زۆر خۆشە بەڵام شەڕی مشك لەبەینی یەکا خۆشترو سەیرترە، لەشکر لەیەك ئەکەن و پەلاماری یەك ئەدەن، بەتایبەتی بێنە دوو لەو ڕزقانە دەزوویەك سەرێکی ببەستە بە کلکی یەکێکیانەوەو ئەو سەرەکەی ببەستە بە کلکی ئەویتریانەوە، ئەمانە ئەبێ بە شەڕیان، مۆڕ ئەبنەوە لە یەك، پەلاماری یەك ئەدەن و یەکتری ئەخلۆێننەوە، ئەزریکێنن لە یەك و ئەجیکێنن، پاشان کە دەزووەکەت پچڕی هەریەکە ڕوو ئەکەن بەلایەکداو ملی ڕێ ئەگرن و ئەڕۆن. ئەم مشکە زلانە مشکی دەشتیشی پێ ئەڵێن.

جۆرە مشکێکی تر هەیە عەرەب پێ ئەڵێ «یەربوع» و ئەیخوا، ئەمانە دەستیان کورت و قاچیان درێژە، تا ئەندازەیەکیش گەورەن، گوێیان گوێن و سمێڵ فشن، کە

کون ئەکەن لە ناوەکەیا بە گەلێ لاوە ئەیەن و دەری ئەکەن، بەلای ڕاست، چەپ، سەرەوخوار و سەرەوژوور، واتە بە هەموو لایەکدا کارێز لێ ئەدەن، ئەمەش بۆ ئەوە ئەکەن قۆڕی و شتە ڕاویان نەکەن. ئەم جۆرە مشکانە سەرۆکیان هەیە و شوێن سەرۆکەکانیان ئەکەوون ئەم سەرۆکە لە پێشا لە کونەکە دێتە دەرەوە سەیرێکی دنیا ئەکا، ئەگەر هەستی بە دوژمن نەکرد جیکەیەکی بەرز ئەکا هەموو مشکەکان دێنە دەرەوە، ئەگەر خۆ دوژمنی بەرچاو کەوت ئەگەڕێتەوە و ئەوان ئاگادار ئەکا کە دەرنەچن، لەو کاتەدا کە هەموو دەرئەچن سەرۆکەکە لەسەر بەرزاییەك بۆ خۆی دائەنیشێ و ئەوان ئەچن خواردەمەنی پەیدا ئەکەن و بۆ ئەمیش دێنن، بەڵام ئەگەر هاتوو لەو کاتەدا کە لە دەرەوەن دوژمن هات و ئەم ئاگای لێ نەبوو بۆ ئەوە خەبەر بەوان بدا، دوژمنەکە کەوتە ناو مشکەکان، ئەوانەی کە لە دەست ئەو دوژمنە ڕزگاریان ئەبێ پاشان پەلاماری سەرۆکەکە ئەدەن ئەیکوژن و ئەیخۆن.

جۆرە مشکێکیتر هەیە مشکی میسکی پێ ئەڵێن، ئەمانە پاش ئەوە کە ڕاوچی ڕاویان ئەکا ناوکیان ئەبەستێ خوێنەکە لەوێدا کۆ ئەبێتەوە، ئەم خوێنە لەوێدا ئەبێ بەمیسك، بۆنی ئەم میسکە گەلێ خۆشترە لە بۆنی میسکی ناوکی ئاهوو.

جۆرە مشکێکیتر هەیە پیان ئەڵێن مشکی کەمەرە لەمل، ئەمانە نوختە نوختەی سپییان تێدایە و لای سەرەوەیان ڕەشە، تووکەکە هاتۆتەوە بە سەریا، وەکوو کچێك کراسێکی درێژ لەبەر کاو پشتێنێك ببەستێ و یەلەکێك لە ڕەنگێکیتر بکا بە سەریاو پشتێنەکە داپۆشێ، دیمەنی ئەوەش وەکوو دیمەنی ئەمە وایە.

جۆرە مشکێکیتر هەیە خواردنی هیچ نییە تەنها ئەو گیایە نەبێ کە ژارە، بەڵام ئەم ژارە کار لەو ناکا. ئەم مشکە ڕاوی ئەکەن و ئەیکەن بە دەرمان بۆ ئەو کەسانە کە زەهر کاری تێ کردوون.

جۆرە مشکێکیتر هەیە پێی ئەڵێن مشکەکوێرە، ئەم جۆرە هەر لە بناغەدا چاوی نییە، هیچ حەیوانێك نییە چاوی نەبێ تەنها ئەم مشکەکوێرەیە نەبێ، ئەم جۆرە مشکە بەرانبەر بەبێ چاویەکە هەستی بۆنکردنی هەیە، چاو چەندە کار ئەکاو تا چ ماوەیەك شت ئەبینێ بۆنکردنی ئەمیش ئەوەندە کار ئەکا، وەکوو چۆن ماسی لەناو ئاودایە و

خواردنی لەناو ئاوەکەدایە، ئەمیش هەر لەناو ئەرزدایەو خواردنی لەژێر ئەو زەوییەدایە، هەندێ جاریش وا ڕێئەکەوێ دێتە دەرەوە بۆ خواردەمەنی، ئەو کاتانەش ئەو وەختەیە کە مێشوولە و شتە زۆرە، دێتە دەرەوە دەمی ئەکاتەوە، مێش و مێشوولە و شتە ئەنیشن بە ناو دەمیەوە، پاشان دەمی ئەداتەوە بەیەکاو ئەمە ئەبێ بە خواردەمەنی بۆی و ئەچێتە ژوورەوە. ڕاوکردنیشی بەو چەشنە ئەبێ ئەچن ئەسپێیەك لەبەر کونەکەیا دائەنێن، کە هەستی کرد بە ئەسپێیەکە بۆی دێتە دەرەوە، کە هاتە دەرەوە ئەیگرن. هەروەها بۆنی کەوەر و پیازی پێ خۆشە، ئەوانەش لەبەر کونەکەیا دائەنێن، کە بۆنی کردن بۆیان دێتە دەرەوە، کە هاتە دەرەوە ئەیگرن. بۆنی خۆشیشی پێ ناخۆشە و لێی هەڵدێت.

✓ خوێنی مشکەکوێرە بهێنرێ بەچاودا ئەو چاوە ئەگەر ژانی هەبێ لایئەبا.

✓ ئەو خوێنەی کە لە کلکی مشکەکوێرەدا هەیە ئەو برینە کە پێ ئەڵێن خەنازیر پێی بهەنوون چاك ئەبێتەوە.

✓ یەکێ سێبەڕۆی هەبێ لێوی سەرووی مشکەکوێرە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ لە پێش ئەوەدا ڕۆژ دەرچێ و هەڵبێت گۆشتی مشکە کوێرە ببرژێنێت و بیخوا هەموو شت ئەزانێ.

✓ مێشکی مشکەکوێرە لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا بکرێتە ناو حاجەتێك باش تێکڵاو بکرێ، بەمە گەڕی و ئەو دەردانە کە لە پێست پەیدا ئەبێ بهەنوورێ هەمووی لائەبا و نایهێڵێ.

✓ یەکێ جومگەکانی دەست و قاچی ئەستوور بێ، ئەو خۆڵەی کە مشکەکوێرە دەری ئەدا لە کونەکەی بە ئاو تەڕ بکرێ و شوێنەکەی پێ بهەنوون چاك ئەبێتەوە.

✓ ئەگەر مشکەکوێرەیەك بخرێتە ناو هەندێ ئاو، ئاوەکە بە ئەندازەی دوو سەد و حەفتا مسقاڵ بێ، لە ناو ئاوەکەدا بخنکێ و بئاوسێ، پاشان ئاوەکە ساف بکرێ، پاشان یەکێ بیخواتەوە تا چل و دوو ڕۆژ هەر پرسیارێکی لێ بکرێ بە بێقسە وەڵامی ئەداتەوە.

✓ ئەگەر یەکێ ژانەسەری لەگەڵ هەبوو سەری مشك بخاتە ناو پارچە کەتانێك و هەڵیواسێ بە سەریا ژانەسەرەکەی نامێنێ. بۆ فێداریش هەر وایە.

✓ ئەگەر یەکێ چاوی مشك بکا بە کڵاوەکەیا لە ڕێگا ڕۆیشتنا زۆر خێرا ئەڕوا.

✓ لە هەر ماڵێکا گووی سەگ وەیا گورگ بسووتێنرێ مشك لەو ماڵەدا نامێنێ.

✓ ڕیقنەی کۆتر لەگەڵ ئارددا تێکلاو بکرێ و بکرێ بە هەویر مشك ئەو هەویرە بخوا ئەتۆپێ، تەنانەت حەیوانیتریش بیخوا هەر ئەمرێ.

✓ پیازەخووگانە لەبەر کونی مشکدا دابنرێ، هەر مشکێ بۆنی بچێ بەسەریا ئەتۆپێ.

✓ لوولاقی حوشتر جوان جوان ورد بکرێ، پاشان بکرێتە ناو ئاو بیرێژن بەسەر کونە مشکا هەچ مشکێك لەو کونەدا بێ ئەتۆپێ.

✓ ئەگەر مشکێك بگرن و کلکی ببڕن، لەهەر ماڵێکا ئەو مشکە کلك بڕاوە بخەنە چاڵ مشکیتر ئیتر ڕوو ناکا بەو ماڵەدا.

✓ سمی ئێستری ڕەش لەهەر ماڵێکا بسووتێنرێ هەچ مشکێك لەو ماڵەدا هەبێ هەمووی هەڵدێت.

✓ ئەگەر یەکێ سێبەرۆی هەبوو چاوی مشکی پیا هەڵواسرێ سێبەرۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ یەکێ ئەگەر بێنێ کلکی مشك بخاتە ناو تۆزێ پێستی کەرەوەو پاشان بیانخاتە ناو پارچە حەریرێکەوە و بیبەستێ بە دەستی چەپیەوە، ئەو کەسە چووە لای هەر پیاوە گەورە و کەسێکیتر بۆ هەر ئیشێك دەست نانێ بە ڕوویەوە و ئیشەکەی بۆ جێ بەجێ ئەبێ.

✓ نووسراوێك ئەگەر میزی مشکی بکرێ بەسەرا هیچ شوێنێك لەو نووسراوە نامێنێ، میزەکەش بەو جۆرە ئەگیرێ؛ بهێنرێ مشکێك لەناو تەڵە گومەزیەکانا بێ هەر جارە پشیلەیەکی پیشان دەی مشکەکە لەتاوانا دەست ئەکا بە میزکردن، قوتولەیەکیش لە عاستیا ڕابگری بۆ ئەوە میزەکە بچێتە ناو ئەو قوتوولەیەوە.

✓.ئەگەر لەو مشکە دەشتییەکان مشکێك بهێنرێ، نێرەیەك کلکی بقرتێنن و گونی دەرێنن پاشان بەرەڵای کەن، ئەم مشکە ئەچێ هەموو مشکەکانیتر ئەخوا و ئەیانکوژێ، چونکە زۆر زۆر بەهێز ئەبێ لەبەر خەسانەکەی هیچ مشکێکیتر پێی

ناوێرێ وە لەبەر کللكقرتانەکەشی لێی ئەترسێ، ئەم فێڵە بۆ خاوەن جووخێن و دەغڵ و دان زۆر بە کەڵکە.

✓ ئاسن وەیا پارچە دارو درکێك چوو بوو بە شوێنێکی ئینسانا و دەر نەئەهات، مشکێك هەڵدڕن و بیخەنە سەری ڕای‌ئەکێشێ.

✓ شوێنێك لە لەشی ئینسانا وەیا سەرێ مووی لێ نەئەهات، مشکێك بسووتێنن و خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ ڕۆندا تێکڵاو کەن و شوێنەکەی پێ بهەنوون مووی لێ دێت.

✓ چاوی مشك یەکێ بیکا بە کڵاوەکەیا چووە هەر کۆڕێکەوە زۆرتر لە کۆڕەکە لێی بێ ئاگا ئەبن.

✓ بە خوێنی مشك هەر شوێنێکی نازك لە لەشدا بهەنوون موو لەو شوێنە نایەتەوە بەڵام لە پاش هەڵکەندنی مووەکەی.

✓ مناڵێك لیك لەدەمی نەئەبڕا پیوی مشك بتوێننەوە لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا، بیدەنێ ئیتر لیکی لێ نایە.

✓ گونی نێرە مشك هەر ژنێك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ تا پێی بێ سکی پڕ نابێ.

✓ پێستی مشك پڕ بکرێ لە کا، لە هەر ماڵێکا هەڵواسرێ مشك ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە.

✓ هەر سەرێك مووەکەی ئەوەرا گووی مشك لەگەڵ ڕۆنی زەیتدا تێکڵاو بکرێ و لێی بدرێ ئیتر مووەکەی هەڵناوەرێ.

✓ ئەسپ ئەگەر تانە بەسەر چاویەوە هەبوو، گووی مشك لەگەڵ هەنگوینىدا تێکڵاو بکرێ پوخت، پاشان بیهێنن بە چاوەکەدا تانەکەی لائەبا. هەروەها مناڵێك کە بەرد لە میزڵدانیا بێ ئەوەی بدرێتێ بەردەکە ناهێڵێ. یەکێکیش ئەگەر بەگران میزی ئەکرد بیخوا چاك ئەبێتەوە.

✓ شتێك کە مشك دەمی تێ نابێ، خواردنی ئەو شتە کەم فیکری دێنێ.

✓ ئەڵێن چاوێك تانەو سپیاتی بەسەرەوە بوو گووی مشکی پیا بهێنرێ لای ئەبا.

✓ ئەگەر یەکێك مار پێوەی بدا مشك بەسەریا باز بدا کابرا ئەمرێ، ئەم پەندە لەسەر ئەوە هاتووە ئەڵێ: «مار بە گازو مشك بە باز».



## مووشی خورما

مووشی خورما دەعبایەکی باریکی درێژکۆلەیە، ڕەنگی پێست و شتەکەی وەکوو ڕەنگی مشك وایە، زۆر زۆر دوژمنی مشکە، لەبەر ئەمە کە ئەمیش باریکەو ئەتوانێ بچێ بە کونی مشکدا ئەگەڕێ بە شوێنیا و کوناو کون بە شوێنیا ئەگەڕێ دەری ئەهێنێ ئەیکوژێ وەیا ئەیخوا، زوویش کەوی ئەبێ، لە ماڵان ڕایئەگرن ئەویش وا گورۆ ئەبێت دێتە سەرشانی ئینسان و سەردەستی. مشك لێی ئەترسن زۆر بەڵام نەوەك ئەو ترسەی کە لە پشیلە هەیەتی، ئەم مووشی خورمایە دوژمنی ماریشە و ماریش ئەکوژێ، کە نەخۆش بکەوێ هێلکەی مریشك ئەخوا چاك ئەبێتەوە. هەروەها مێملی تمساحیشە، تمساح دەمی ئەکاتەوە ئەم لە ناکاو خۆی ئەکا بە دەمیا و ئەچێتە ناو سکیەوە هەموو ڕیخۆڵە و شتەکەی ئەخواو پاشان دێتە دەرەوە. زۆر دڵی بە خشڵ و ئاڵتوون و شتەوەیە وەکوو ڕزق ئەیدزێ و ئەچێ گەمەی پێ ئەکا.

✓ ئەگەر یەکێ تەم لەسەر چاوی بێ مێشکی مووشی خورما بێنێ بە چاویا تەمەکەی نامێنێ.

✓ یەکێ فێدار بوو مێشکی مووشی خورما وشك بکرێتەوە و لەگەڵ سرکەدا بیخوا فێکەی نامێنێ.

✓ ئەگەر یەکێ جومگەکانی لەشی ژانی ئەکرد گۆشتی مووشی خورما بخاتە سەری ژانی نامێنێ.

✓ ددانێ کە یەکێ بیەوێ بیخا بە پیوی مووشی خورما بیهەنوێ خێرا ئەکەوێ.

✓ یەکێ لوو لە مل وەیا لە لەشیا هەبوو بە خوێنی مووشی خورما بیهەنوێ و دەستی پیا بێنێ ئەیرەوێنێتەوە.

✓ خوێنی مووشی خورما و خوێنی مشك تێکڵاو بکرێ و بکرێتە ناو ئاو، ئەو ئاوە بپرژێنرێتە هەر ماڵێك هەرا لەو ماڵەدا پەیدا ئەبێ.

✓ گووی مووشی خورما بکرێ بە برینەوە خوێنەکەی ئەوەستێنێتەوە.
✓ هەر ژنێك دوو دەستی مووشی خورمای پێ بێ سکی پڕ نابێ تا پێی بێ.

## مێروولە



مێروولە دەعبایەکی بەهەستی سەیرە، لە هەموو گیانلەبەرێك بەتەماعترە، چوار حەیوان ئازۆخە هەڵئەگرێ؛ ئینسان، قشقەرە، مشك، چوارەمیان مێروولەیە، ئەڵێن بولبولیش ئازۆخە ئەخا. مێروولە جووتی لە بەینی نێر و مێدا نییە، واتە ژن و ژن‌خوازی وەکوو لەبەینی هەموو گیانلەبەرێکا هەیە بەڵکوو ئەم گەرایەکی وردی سپی لێ ئەکەوێتە خوارەوە و ئەم گەرایە ئەبێ بە بەچکەی و خزمەتی ئەکاو لە پاشان ئەبێ بە مێروولە، زۆریش بە پەرۆشە بۆی، ئەگەر زانی شارەکەی تاوانێك رووی تێ کرد ئەو گەرا سپیانە ئەگرێ بە دەمەوە، و ئەیانگوێزێتەوە.

مێروولە دەسەڵاتێکی بە هێزی هەیە بۆ شت کۆکردنەوە و بۆ کۆڵ نەدان، تا ئەندازەی سێ بارسایی خۆی هەڵئەگرێ، کە شتێکی بینی هەندێکی لێ هەڵئەگرێ و ئەچێ خەبەر بەوانی‌تر ئەدا زۆری پێ ناچێ لێی کۆ ئەبنەوە و ئەیکێشن، کە نەیتوانی خۆی بە تەنها شتەکە هەڵگرێ خەبەری مێروولەی‌تر ئەدا بە هەرەوەزی ئەیبەن و ڕای‌ئەکێشن. مێروولە، کە رووی کردە گیانلەبەرێك بۆ خواردنی، گیانلەبەرەکە با بیشجووڵێتەوە ئەو، ئەو هەستەی هەیە، کە ئەم سەری تێ کرد ئەو ناتوانێ بەر هەڵستی ئەم بکات. گیانلەبەرێکی جووڵاوە ئەو ئەزانێ جارێ وەختی ئەوەی ماوە کە ئەم پێی نەوێرێ لەبەر ئەوە وازی لێ دێنێ تا وەختی دێت ئەو وەختە خۆی بۆ خۆش ئەکا.

### مێروولە زۆرتر سێ جۆرە:

جۆرێکیان هەرەگەورەکانن، کە ئەمانە لە رووەوە شکڵیان لە شێر ئەچێ، ئەمانە زۆر نین، جۆرێکی‌تریان مێروولە هەرە وردە سوورەکانن کە ئەمانە زۆر زۆرن، جۆرێکیان مام

ناونجین له بەینی ئەم دوو جۆرەدا، ئەمانە لە جۆری یەکەم زۆرتر و لە جۆری دووهەم کەمترن، دوژمنایەتی هەیە لە بەینی هەر سێ جۆرەکەدا، جۆرێ سێیەمەکە بە لەش لەجۆری یەکەم بچووکتر و لە جۆری دووهەم گەلێ گەورەترە، ئەم دوو جۆرە گەورەیە خۆیان زۆر ئەپارێزن لە بچووکەکان، مێرووله بە هەموو جۆرەکانیەوە خاوەنی شەش پێیە، بەو پێیانەی ئەرز هەڵئەکۆڵێ و شار بۆ خۆی دروست ئەکا، شارەکەیان لە ناوەوە پێچەڵ پڵووچ و ژوور ژوورە، ژووری گەراکەیان جیایە، ژوورەکانیتر هی ئازۆخەن، دەغڵودان ئەبنە ئەو ژوورانە، کە گەنم و جۆ و شتە ئەبەن لە ژوورەوە ئەیکەن بە دوو کەرتەوە بۆ ئەوە ئیتر هێزی سەوزبوونی تیا نەمێنێ، پەرشە توێکەکەی لێ ئەگرنەوە، نۆك و نیسك و شتە ئەکەن بە چوار کەرت و زیاترەوە ئەمانە هەموو لەبەر ئەوەیە کە ئیتر نەڕوێنەوە و چەکەرە نەکەن لە کاتێکا کە زستان هات و شوێنەکەیان شێی هەڵهێنا، ئەگەر زانیان وا ئەو ئازۆخەیە خەریکە بۆن ئەکاو عەدم ئەبێ ئەیکێشنە دەرەوە و ئەیدەن بە هەوادا، زۆرتریش ئەمە بە شەوی مانگەشەو ئەکەن، کە هەستیان بەوە کرد بارانێ شتێك ئەبارێ خێرا ئەیکێشنەوە ژوورەوە، هیچ نیشانەی هەور و شتەش لە ئاسمانەوە دیار نییە بەڵام ئەوان بە بۆنی هەواکەدا ئەزانن باران ئەبێ یا نابێ ئەکەونە خۆیان.

مێرووله ناوقەدی باریکە و ورگ و ڕیخۆڵە و شتەی نییە، خواردن ناخوا بەڵکوو خواردنی ئەو بۆنکردنی ئەو خواردەمەنیەیەتی ئەیگرێ بە دەمەوە، شکاندنەکەی و کەرتکردنەکەی بۆی ئەبێ بە هەڵمژین و بەخواردن، دوو چاوی هەیە، لە ناو دەمیا دوو ددانی تیژی هەیە، هەست و بۆنکردنی لە هەموو دەعبایەك بە هێزترە، شوێنێك کە دەستی ئادەمیزادی تێ کەوت بۆ ئاوەدانکردنەوە لە پاش ماوەیەك سەیر ئەکەی مێرووڵەی تێدا پەیدا ئەبێ، مێرووله لەگەڵ ئەوەدا کە لە ساڵێك زیاتر ناژیت خواردەمەنی چەند ساڵ کۆ ئەکاتەوە، مێرووله گەورەکان مردنیان بەوەیە باڵیان لێ پەیدا ئەبێ، لە شارەکەی خۆیان دەرئەچن ئەکەونە ئاسمان باڵندە و شتە ئەیانخوات، پەندی پێشینانی کوردی لەسەر ئەمە ئەڵێت:

**«مێرووله خوا غەزەبی لێ بگرێ باڵی لێ پەیدا ئەکا».**

لە ڕۆیشتناو ئەو ڕێچکەیە کە ئەیگرن ئەزانن چ ڕێگایەك بە کەڵکی ئەوان دێت و

چ ڕێگایەك بە كەڵكیان نایەت، قەت لەو ڕێگایە لانادەن، ئەگەر مێروولەیەك هەڵبگری و لە ڕێگا گشتییەكە لای دەی و دووری خەیتەوە خێرا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێگاكە با خۆیشی لە تەنیشت شارەكەیەوە بێت، وەختی وا هەیە مێروولە گەورە و ناونجییەكانیش بەتایبەتی ناونجییەكان لەم ڕێبازە گشتییەدا تێكڵاوی بچووكەكان ئەبن بەڵام نابێ لاقەی بچووكەكان بكەن، ئەگەر لاقەیان بكەن وەیا شتیان لێ بسێنن بە هەموویانەوە تێی‌ئەورووكێن ئەیكوژن. جارێك من ئەمەم بەچاوی خۆم چاو پێ كەوت، سەیرم كرد وا لە ڕێبازی مێروولە وردەكانا مێروولەی ناونجیش هەیە و بە هەموویانەوە شت ئەكێشن بۆ شارەكەیان، یەكێ لەو مێروولە ناونجیانە پەلاماری دەنكە گەنمێكی دا كە دوو مێروولەی بچووك ڕایان‌ئەكێشا، ئەمانیش نەیان‌ئەدایە، لەو ڕاكێشان، لەمان ڕاكێشان، هەندێ جار ئەو ئەیبرد هەندێ جار ئەمان، هەر ئەیانویست لە دەستی دەركەن و دەرباز ببن، وەكوو بڵێیت خۆیان لێ ئەپاراست قایل بوون بەوە كە دەنكە گەنمەكە بەرن و بڕۆن بەڵام ئەو هەر وازی نەئەهێنا. لە ئەنجاما كە ئیتر بچووكەكان لە وزەیانا نەما وازیان لە دەنكە گەنم هێناو بەربوونە مێروولە گەورەكە، هەر خێرا مێروولەی‌تر هاتن و بچووكەكان زۆر بوون و لە گەورەكە ئاڵان، گەورەش وازی لە دەنكە گەنم هێناو خەریكی پاراستنی خۆی بوو بەڵام كەڵكی نەگرت بەهەر لایەكدا هەڕای ئەكرد مێروولە بچووكەكان ڕێگاكەیان لێ ئەگرت و تێی ئەئاڵان، یەكی گازی لەم قاچی ئەگرت، یەكێ لەو قاچی، یەكێ لەناو قەدی، یەكێ لە لای چاوی، ئەویش خۆی گرتمۆڵكە ئەكرد و لە پڕ خۆی ئەكردەوە و تەكانی ئەدا هەمووی فڕێ ئەدان، دیسانەوە ئەمان تێی ئەئاڵانەوە، لە ئاخرا هەر وازیان لێ نەهێنا تا لە ناو قەدەكەیەوە كردیان بە دووكەرتەوە، هەر دەستەیەك كەرتێكیان كردە كێش و بردنیان، دەنكە گەنمەكەش ئەوە هەر وەختی خۆی دوو مێروولەی‌تر هەڵیان‌گرت و بردیان بۆ شارەكەیان. مێروولە ئیشی سەیری هەیە، دوو سێ ئەوەندەی بارسایی خۆی شت هەڵئەگرێ، سەد ئەوەندەی قەبارەكەی خۆی هەستی بۆن‌كردنی هەیە، شتێك لە دەستی ئینسان دائەكەوێ، ئەوا هیچ مێروولە دیار نییە، كەچی زۆری پێ ناچێ سەیر ئەكەی ڕێچكەی مێروولەی بۆ پەیدا ئەبێ، ئاو ئەخواتەوە، توخنی قالۆچە و كولە و دووپشك ناكەوێ با مردوویش بن بەڵام ئەگەر

بریندار بوون وەیا قاچێ دەستێ شتێکیان لێ کرایەوە تێ ئەورووکێن با زیندوویش بن.

✓ مێرووله لەشوێنێك بسووتێنرێ مێرووله‌کانی‌تر هەموو هەڵدێن.

✓ ئەگەر نزیکەی مسقاڵێ لە گەرای مێرووله بدرێ بە هەرکەس ئەو کەسە ئیتر دوای خۆی ناگرێ و هەر ئەترێ. تەنانەت خواردنی مێرووله خۆیشی هەر وایە.

✓ گەرای مێرووله بپژێنرێتە بەینی هەر دەستە و تایەفە و ماڵێکا ئەو ماڵ و تایەفەیە پەرش و بڵاو ئەبنەوە.

✓ گووی پشیله نرایە بەر دەرگای شارە مێرووله، مێرووله شارەکە بەجێ دێڵن.

✓ ئەگەر زیرە بخرێتە بەر کونی شارە مێرووله‌وە مێرووله‌کان ئیتر نایەنە دەرەوە.

✓ پەڕۆی ئافرەتی حەیزدار بکرێ بەسەر هەر شتێکا مێرووله نزیکی ئەو شتە ناکەوێ.

✓ نەوت بکرێ بە شارە مێرووله‌دا مێرووله‌کان هەموو ئەمرن. لەگەڵ ئەمانەشا تێکدانی شارە مێرووله لە ئاوەدانیدا بەوە نەوتی پیاکەی وەیا شتێکی‌تر یومنێکی باشی نابێت و ئەو شوێنەش لە ئەنجاما وێران و چۆڵ ئەبێت.

✓ گەرای مێرووله بسوورێتەوە، بدرێ لەهەر شوێنێك ئەو شوێنە ئیتر مووی لێ ناڕوێت.

✓ شیاکەی گا هەڵبسوون بەکونی شارە مێرووله‌دا ئیتر مێرووله‌کان لەو کونەوە نایەنە دەرەوە، یا هەڵدێن یا لە لایەکی‌ترەوە کون ئەکەن.

## مێش



مێش کە مەگەزیشی پێ ئەڵێن دەعبایەکە هەموو جۆرە زیان و نەخۆشییەکی لێ پەیدا ئەبێ چونکە ئەنیشێ بە هەموو شتێکەوە، زۆر کەریشە خۆی ئەخاتە هەموو تاوانێکەوە، هەروەها بێ‌شەرمیشە هەر دەری ئەکەی دێتەوە مەگەر بە جۆرێك نەبێ؛ کە نیشتە شتێکەوە جاری یەکەم دەریکە دێتەوە، تۆ دەستت لامەبە، دیسان دەریکەوە، هەم دێتەوە، دەستت لامەبە دەریکەوە ئیتر نایەتەوە بەڵام بەو مەرجە هەرسێ جارەکە لەسەر یەك بێ، خۆ ئەگەر لە جاری

یەکەما دەستت لێ کەوت ئیتر نایەتەوە. مێش سەرەتا لە پیسی پەیدا ئەبێ پاشان لە جووت بوونی نێرو مێیەکەش، نێرەکە تا ڕۆژێك بەسەر مێکەوە ئەبێت و هەڵیش ئەفرن پێکەوە، مێش چەند جۆرێکی هەیە؛ ئەم جۆرەی کە لەناو مەردم و ئاوەدانیدا هەیە چل ڕۆژ عومر ئەکا، جۆرێکی‌تری ئەوانە زۆر زلن زۆرتر ئەنیشن بە کەرو گاوە، بە تایبەتی لە بەهارانا کە ئەنیشێ بەبن کلکی گاو مانگاوە ئەیخاتە جانبازە، جۆرێکی‌تری مێشێکە هەر وەکوو ئەم مێشانە و لەژێر ئەرزدایە، ڕەنگی سەوزکارە، جۆرێکی‌تری مێشە سەگانەیە، ئەوە وەکوو ئەمانە نییە، شکڵی وەکوو کیسەڵ وایە و بە سەگەوە ئەنیشێ، جۆرێکی‌تری مێشە شێرانەیە، ئەم جۆرەیان هەر بە شێرەوە ئەنیشێ، ئەگەر سەیری کرد شێرەکە بریندار بووە وەیا ڕووکاوە پێوە ئەنیشێ، بە برینەکە وازی لێ نایەنێ تا لە ئەنجاما شێرەکە ئەکوژێ. مێش ئەگەر نیشت بەبرینی حەیواناتەوە ئەگەر ئەو حەیوانە دەمی نەگەیشت بە برینەکەی ئەو مێشە ئەو حەیوانە ئەکوژێت، چونکە جگە لەوە کە خوێنەکەی ئەمژێت گوویش ئەکاتە ناو برینەکەی، ئەو گووەی زەهرە.

مێش ناتوانێ بڕوا بەرێگادا چونکە جومگە لە لەشیا نییە، سەری قاچەکانی زبرە بۆ ئەوە ئەگەر نیشت بەسەر شتی لووسەوە خۆی پێ بگرێتەوە، دوو چاوی بچکۆلەی قیتی هەیە، برژانگی نییە لەبەر ئەمە هەموو جار بە دوو دەستەکەی پێشەوەی مشت و ماڵی چاوەکانی ئەداو پاکیانی ئەکاتەوە، کە ڕەشەبای نەرم و بای گەرمی هات مێش زۆر ئەبێت، کە بای شەماڵی هات کەم ئەبێتەوە، مێش مێشوولە ئەخوا لەبەر ئەوە مێشوولە ناتوانێ ئەوەندە بەرۆژدا دەرکەوێ، پاقلەی تەڕیش ئەگەر بەرەڵای بکەن و وازی لێ بێنن لە ئەنجاما هەمووی ئەبێ بەمێش. ئەمیش وەکوو مێشوولە لووتێکی درێژ وەیا بڵێین خورتوومی هەیە، کە بەشتەوە ئەنیشێ خورتوومەکەی دەرئەکێشێ و ئەیچەقێنێ بە شتەکەدا و ئەیمژێ، کە تێری خوارد دەری ئەهێنێتەوە و لە لەشی خۆیشیا ئەیکاتەوە بە شوێنی خۆیا، مێش لە هاوینا ئەبێت، بە هەموو شتێکە ئەنیشێ بە کوولەکەوە نەبێ، ئەو دەنگە دەنگ و گیزەگیزەی کە لێوە دێت لە زکیەوە دێت، گوو مێش بکەوێتە سەر شتی سپی بە ڕەش دەرئەکەوێ، بکەوێتە سەر شتی ڕەش بە سپی دەرئەکەوێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە گووەکەی وەکوو ڕیقنەی چۆلەکە دوو ڕەنگە؛ سپی و ڕەشە، بکەوێتە سەر هەر شتێك ڕەنگەکەی‌تری دەرئەکەوێ.

✓ یەکێ ئەگەر زەردەواڵە پێوەی‌دا مێشێك بێنێ سەرەکەی لێ بکاتەوە و بەلەشەکەی جوان جوان شوێنی پێوەدانەکە بهەنوێ ژانەکەی نامێنێ.

✓ مێش بسووتێنرێ و خۆڵەکەی لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو بکرێ، بدرێ لەو شوێنە کە مووەرێزە «داءالثعلب»ی هەیە مووی لێ دێتەوە و هەڵناوەرێ.

✓ مێش ببرژێنرێ و بخورێ بەردی میزڵدان ورد ئەکاو ئەیخا.

✓ یەکێ چاوی ژانی لێ بێ مێش وشك بکاتەوە و لەگەڵ کلدا بیسوێتەوە و بیهێنێ بە چاویا ژانی نامێنێ و چاویشی تیژ ئەبێ و برژانگەکانیشی پێ زیاد ئەکا و نایەڵێ بکەوێ.

✓ یەکێ دووپشك پێوە بدا مێش لە ناو شیردا بکوتێ و تێکڵاوی کاو شوێنەکەی پێ بهەنوێ ژانی نامێنێ.

✓ گەڵای کوولەکە لە ماڵێکا بسووتێنرێ و دووکەڵ بکا، مێش لەو ماڵەدا نامێنێ.

✓ چاوێك کە مووی لێ دێت، خەرەنگەزە وەیا مێشێکی گەورە بێنن سەرەکەی لێ بکەنەوە، بە لەشەکەی شوێنی مووەکە بە توندی بهەنوون ئیتر ئەو مووە لەو شوێنەدا نایەتەوە.

✓ ئەو کەسەی کاکیلەی ژان ئەکا مێشێکی زیندووی پیا هەڵواسن ژانەکەی ئەشکێ و نامێنێ.

✓ یەکێ چاوی ژان بکا، مێشێك بگرن بیخەنە ناو کیسەیەکی بچکۆلەوە و سەری کیسەکە بە دەزوویێك ببەستن و دەزووەکە شۆڕ بێتەوە، پاشان کیسەکە هەڵواسن بەو کەسەدا، ژانەکەی نامێنێ.

## مێشووله



مێشووله کە «تۆفانە»شی پێ ئەڵێن گیانلەبەرێکی زۆر سەیری سەرسامکەرە، زۆر بچووکە کەچی هەموو جۆرە هەستێکی هەیە. مێشووله چەند جۆرێکی هەیە، جۆرێکی ئەم مێشوولانەیە کە لە هەموو لایەك هەیە، جۆرێکی‌تر پێی ئەڵێن هوورە، جۆرێکی‌تر هرمس. ئەم هرمسەیانە زۆر وردە،

هووڕە زۆر دڕە، پەیدابوونی مێشوولە لە شوێنی پیسایییەك کە نمناك بێ پەیدا ئەبێ و شوێنەکە هەڵی دێنێ، هەروەها شوێنێکیش کە سەوزەلانی و دارستانێکی فرە بڵاو نەبێ ئەبێت، لەگەڵ ئەمانەشا بە بەچکەکردن خۆیشیان ئەبن. دارێك هەیە پێی ئەڵێن دار تۆفانە، ئەم دارە بەرێکی هەیە وەکوو دەلوبییەرە گەورەکان، لەناو ئەم بەرەدا تۆوێك هەیە وردو بێ‌هێزە، کە بەرەکە تۆزێ زل بوو تۆوەکانیش زل ئەبن، لە ئەنجاما ئەو بەرە ئەتەقێ و کونی تێ ئەبێ، ئەو تۆوانە هەموو ئەبن بە مێشوولە و دێنە دەرەوە و بڵاو ئەبنەوە، خواردەمەنی و هۆی ژیانی گەلێ لە تەیر و تیوور و گیانلەبەر مێشوولەیە، ئەگەر ئەم نەبێ ئەوان ناژین چونکە خواردەمەنییان نابێ.

مێشوولە بەو بچووکیە لەسەر شکڵی فیلە بەو زلیە لەگەڵ ئەمەشا ئەم لە فیل ئەندامی زیاتر هەیە؛ فیل چوار پێ، کلك و خورتوومی هەیە، مێشوولە ئەمانەی هەیە لەگەڵ دوو پێی تر و چوار باڵیشا. خورتوومی فیل بتەوە کەچی هی مێشوولە ناوەکەی بۆشە، چزوێکی تیژی درێژ لەسەریەوەیە، ئەم چزوەی ئەنێ بەلەشی ئینسانەوە خوێنەکەی هەڵئەمژێ، وەکوو بۆڕیە ئەیدا بە ناوسکی، لەناو سکیشا ورگ و ڕیخۆڵە و هەموو شتێکی هەیە، ئەم خورتوومە بۆ ئەم وەکوو گەروو وایە بۆ گیانلەبەری‌تر. مێشوولە کە نیشت بەئینسانەوە ئەگەڕێ بۆ ئەو شوێنانە کە کونە هەرە بچکۆلەکانی پێستن و پیان ئەڵێن «مسام»، ئەزانێ ئەوێ بێ‌عەزیەتترە بۆی،چزووی لووتەکەی تێ ئەچەقێنێ، دەست ئەکا بەخوێن هەڵمژین، زۆر تەماعکاریشە ئەوەندە هەڵئەمژێ یا لێك ئەبێتەوە وەیا ئیتر ناتوانی بفڕێ ئەبێتە هۆی کوشتنی. گەلێ جاری وابووە مێشوولە فیل و حوشتری کوشتووە، فیل زۆر لێی ئەترسێ، لە دەشتا ئەگەر مێشوولە حەیوانێکی کوشت، باڵندە و دڕندە گۆشت‌خۆرەکان لە لاشەکە کۆ ئەبنەوە هەر لەگەڵ ئەوە لەو لاشەیان خوارد خێرا ئەوانیش ئەمرن.

مێشوولە لەگەڵ ئەو بچووکیەدا هەموو ئەندامێکی وەکوو حەیوانێکی گەورەو هەموو هەستێکی پۆشراوی «حس»ی باتنی وەکوو ئینسان هەیە، سەری زۆر بچووکەو جیایە لە لەشی کەچی هێزی بینین و بیستنی تێدا هەیە، مێشکی ئەبێ لەچاو ئەو سەرە بچووکەدا چی بێ کەچی هەر پێنج هێزە پۆشراوەکە لەناو ئەو تۆزە مێشکەدا هەیە!.

«حس»ی «مشترك»ی تێدایە چونکە گیانلەبەر و شتی بەهەست ئەبینێ ئەچێ

بۆلای، خەیاڵی تێدا هەیە چونکە کە کەوتە سەر گیانلەبەرێك خورتوومەکەی تێ ئەچەقێنێ کەچی ئەگەر بکەوێتە سەر دیوار وەیا بێگیانێکی ڕەق هیچ گوێ ناداتێ. وەهمی تێدا هەیە چونکە هەست ئەکا لە بەینی ئەو کەسەدا کە پەلاماری ئەدا سەیر ئەکەی هەڵدێت، وە لەبەینی ئەو کەسەدا کە گوێی ناداتێ هیچ هەڵنایەت و خۆی ناشڵەژێنێ. «حافظە»ی هەیە چونکە هەر کە خوێنی کەسەکەی مژی کۆششی ئەوە ئەکا کە هەڕاکا ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەزانێ عەزیەتی ئەو کەسەی کردووەو ئەو کەسەش وازی لێ ناهێنێ دێنێ خۆی دەرباز ئەکا.

«مفکرە»ی هەیە چونکە هەرکە هەستی کرد بەوە کە دەستی ئینسانەکە جووڵایەوە هەڵدێت ئەزانێ خەتەر پەیدا بوو، کە دەستەکە لە جووڵان وەستایەوە ئەویش دێتەوە ئەزانێ خەتەرەکە نەما. ئەمە بەم جۆرە هەستە پۆشراوەکانی هەبوو، ئەندامی ڕواڵەتیشی هەموو لە شوێنی خۆیا هەیەو هیچی ناتەواو نییە، فیل و گامێش لەترسی ئەمە خۆیان ئەخەنە ناو ئاوا!. برام شتێکی وا بچووك ئەم هەموو هەست و ئەندامانەی هەبێ بڕوا ناکرێ ئەمە پاشماوەی ڕێکەوت بێ، ئەبێ هێزێك هەبێ بەم ڕێکوپێکییە ئەمەی دروست کردبێ، ئەو هێزەش کورد پێ ئەڵێ خوا.

✓ ئەگەر یەکێ سێبەرۆی هەبێ هەندێ جەوی بێنێ، بیکا بە سێ بەشەوە، دیارە بچووك، بچووك، خڕی بکاتەوەو وەکوو نیسکی لێ بکا، هەر حەبێکی مێشوولەیەکی تێخا، ئەو ڕۆژە کە نۆرەی تا گرتنی سێبەرووەکەیەتی، هەر سێ حەبەکە بخوا پێ نەخاتە سەر زەوی سێبەرۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

✓ لە شوێنێکا دووکەڵی تەپاڵە و شیاکە بکرێ مێشوولەکان هەڵدێن.

✓ گەڵای گیای قانگ وەیا قانگەکە خۆی یەکێ ئەگەر لە ژوور سەر وەیا لەلای پێیەوە داینێ لەکاتی نووستنا مێشوولە نایە بەلایا.

✓ داری سەرو لەشوێنێك بسووتێنرێ مێشوولەی ناهێڵێ.

✓ گەڵای زیرە وەیا زیرەکە خۆی بسووتێنرێ دووکەڵەکەی مێشوولەکان ئەتارێنێ.

◈◈◈

# دار و درەخت

## بادام



بادام بکرێ بە هەنگویندا و پاشان بنێژرێ کە بوو بەدار ئەو دارە بەرێکی باش و خۆشی ئەبێ. ئەگەر بویسترێ بادام ناوکێکی پڕو قەڵەوی هەبێ دەنکە بادامێ بهێنرێ توێکڵەکەی لێ بکرێتەوە بەڵام بەجۆرێك کە ناوکەکەی هیچ بریندار نەبێ ئەمجا بەکاغەزێك وەیاپەڕۆیەك وەیا گەڵامێوێکدا دابنرێ و بپێچێنرێتەوە و بنێژرێ و سەرەکەی بەخۆڵە مێش داپۆشرێ، ئەو ناوکە کە بوو بە دار، بادامی بەری ئەو دارە گۆشتن و توێکڵێکی نازکی ئەبێ. ئەگەر بتەوێ باخی بادام هیچی لێ هەڵنەوەرێ و نەکەوێ سەری کەرێك لە ناو لقی دارێکیانا هەڵواسە ئیتر هچی لێ ناکەوێ.

خواردنی بادامی شیرین بۆ نەمانی کۆکەو ساف‌کردنی سینگ زۆر باشە، بە تایبەتی ئەگەر لەگەڵ هەنجیردا بخورێ پیاو قەڵەو ئەکاتەوە، چاو تیژ ئەکا، کۆڵنج لائەبا، هەروەها بۆ یەکێکیش باشە کە سەگی هار گرتبێتی... بادامی تاڵیش بکوڵێنرێ و بنرێ لەو بەڵەکیە کە لە ڕوومەتا پەیدا ئەبێ لای ئەبا، بنرێ لە کۆڵنج ئەیڕەوێنێتەوە. هەروەها بادامی تاڵ لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو بکرێ یەکێ کۆڵنجی هەبێ بیخوا بۆی باشە.

خواردنی بادام بۆ نەهێشتنی گەڕی زۆر نایابە. یەکێ ئەگەر بیەوێ مەستیی شەراب کاری تێ نەکاو سەرخۆش نەبێ حەو دەنك بادام لە ناشتا بخواو پێش خواردنی عەرەقەکەش پێنج دەنك بخوا ئەو شەرابە ئیتر کاری تێ ناکا بۆ سەرخۆشبوونێکی زیاد.



## بەڕوو

بەڕوو لەو دارانەیە کە لە کێوەکان ئەڕوێن، بە تایبەتی لە وڵاتی کوردەواری زۆرە، بە تەبێعەت خۆی بەخۆی ئەبێ نەوەك بەچاندنی ئینسان، ئاگر و پشکۆیەکی زۆر تیژ و قایمی هەیە، بەری داری بەڕوو کە پێی ئەڵێن بەڕوو ئەیبرژێنن و ئەیخۆن، ساڵێ کە قات و قڕ بێ ئەیهاڕن و ئەیکەن بەنان، بەڕوو بۆ برژاندن بخرێتە ناو ئاگرەوە ئەگەر سەرەکەی نەکرێ کە تەقیەوە بدا لە هەرکەس وەکوو گوللە وایە. لەگەلێ شوێن لە کوێستانەکانا کەڵکێکی زۆر لەبەڕوو وەر ئەگرن؛ خودی بەڕووەکە ئەخۆن، گەڵاکەی ئەکەن بە گەڵ بۆ ماڵات، لە دارەکەی گەلێ شت دروست ئەکەن. داری بەڕوو جەوتیش ئەگرێ.

گەڵای دار بەڕوو ئەگەر بخرێ بەسەر ماردا ئیتر ناتوانێ باش بڕوا. هەروەها مار و دووپشك و شتە وەیا لە خشۆکەکان شتێك دای بە ئینسانەوە، وەیا شوێنێك خوێنی نەئەوەستایەوە گەڵای دار بەڕووی بخرێتە سەر بەکەڵکە بۆ هەمووی. خۆڵەمێشی داربەڕوو لەلای کونی مشکی دەشتی ـ مشکە زلەکان ـ ڕۆ بکرێ مشکەکان گەڕ ئەبن و ئەوەشێنە یەك یەکتری ئەکوژن.



## بەهێ

داری بەهێ دارێکی جوانە، خۆڵەمێشی دارەکەی و گەڵاکەی، «کل» چ کارێکی هەیە بۆ چاو ئەویش ئەو کارەی هەیە، گوڵی بەهێ مێشك زۆر بەهێز ئەکا، داری بەهێ زیاتر لەو شوێنانە ئەبێ کەفێنك ئەبێ.

خواردنی بەهێ دڵ بەهێز ئەکا، زەردو لاوازی لە ئینسانا ناهێڵێ، منالیش لە زکا جوان ئەکا، خواردنی بەهێ لەسەر تێری باشە چونکە ئەو خواردنەی کە لە زکایە هەزمی ئەکا.

کورد ئەڵێ: «بەهێ بەتێری و سێو بە برسێتی».

بەهێ ئەگەر بە چەقۆ کەرت بکرێ تام و ئاوی نامێنێ و تاڵ ئەبێ بەڵام ئەگەر بەخۆی کەرت بکرێ و بشکێنرێ پێچەوانەی ئەوە ئەبێ.

خواردنی بەهێ تینوێتی ئەشکێنێ و مایە - معدە - بەهێز ئەکات. ئافرەتی سك پڕ ئەگەر دەوام لەسەر بەهێ خواردن بکا بەتایبەتی لەمانگی سێیەمی سکەکەیا منداڵەکەی جوان ئەبێ. ئەگەر شیر لەمەمکی ئافرەتا وەستاو نەئەهات، بەهێ لەگەڵ هەنگوین بکوڵێنن و لێی بنێنن ژان و ئاوسایێ کە هەبێ لای ئەباو پاشان بە ئاسانی ئیتر شیری دێت. ئەو شوێنەی ترێی لێ دانراوە ئەگەر بەهێشی لێ دانێن تریەکە خراپ ئەکا. هەر ژوور و شوێنێك میوەی ترێ لێ بوو ئەگەر بەهێشی لێ بێ هەموو میوەکان خراپ ئەکا و لەکەڵك ئەکەون. بەهێ لەناو کا وەیا ئاردە هەڕەدا دابنرێ ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە.

## داری بی



داری بی ئەمیش زۆرتر لە وڵاتی فێنکا ئەبێ و بە تایبەتی لە شوێنی ئاوەدارا، دارەکەی زۆر سووکە، کە سووتێنرا زوو ئەبێ بە بووڵ، گەڵاکەی لەسەر شکڵی خنجەرە و زۆر تاڵە.

هەر لە ڕەسەنی بییە شۆڕەبی وە یا شەنگە بی، ئەمەیان زۆر جوانە لقەکانی هەموو لووت ئەنێنە زەوی، تووڵەکانی ناسکە، دیمەنی تێکڕای دارەکە وەکوو دیمەنی چەتر وایە، نووستن لە سێبەری داری بیدا خۆشە.

خواردن و جوینی گەڵای داری بی مێشك بەهێز ئەکا. ئەگەر یەکێ زەهر کاری تێ کردبێ گەڵای داری بی بخرێتە ناو نوێنەکەیەوە بۆی باشە، خوێنی شوێنێك، کە نەوەستایەوە گەڵای داری بی بە تەڕی بخرێتە سەری ئەوەستێتەوە. گەڵای داری بی بسووتێنرێ، خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ سرکەدا تێکڵاو بکرێ و بنرێ لە باڵووك هەڵی ئەکەنێ، وە ئەو شوێنەی لە لەشا مێروولە بکا ئەو سرکەو خۆڵەمێشەی لێ بنرێ چاکی ئەکاتەوە. گوڵی داری بی بۆنخۆشە و مێشك بەهێز ئەکا. ئاوی گەڵای داری بێ بۆ سەرێشە باشە و لای ئەبا.

## پستە = فستق



داری پستە خۆی لەخۆیا دارێکی سەیرە، زۆر چەورە، بخرێتە ناو ئاگر ئەسووتێ بەبێ ئەوە دووکەڵ بکا، ئەمە لەهیچ دارێکیترا نییە، وەکوو ئەڵێن داری پستە سەرەتا قەزوانە و موتوربە لە بادام کراوە.

پستە خۆی واتە بەرەکە خواردنی بۆ ئەو کەسە کە جرِوجانەوەر پێوە داوە زۆر بەکەڵکە، یەکێ کۆکەی هەبێ لەگەڵ بەڵغەمدا پستە بخوا بۆی باشە. دیسان هێزێکی زۆر ئەدا بەو کەسانەی، کە هێزی شەهوانیەتیان کەم بووەتەوە. یەکێ تانە وەیا تاریکایی لە چاویا هەبوو ڕۆنی پستە بکاتە چاوی بەڵام دەوامی لەسەر بکا هیچ ئەلەمێك لەچاویا ناهێڵێ.

## پەڵك



پەڵك کە سپی داریشی پێ ئەڵێن دارێکی زۆر گەورەیە، دارێکە زۆر بەخۆی ئەنازێ، ئەم دارەش شوێنی فێنکی ئەوێ، لە وڵاتی گەرمەسێر کەمتر ئەبێ، بەری نییە.

پەڵك لە دارەکەی بسووتێنرێ خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ سرکەدا تێکڵاو بکرێ و وەکوو مەعجوونی لێ بکرێ بنرێ لە بالووك لای ئەبا. لە داری پەڵك بکوترێ و تێکڵاو بکرێ بە خەنە و وسمە و بدرێ لە موو زۆر بەکەڵکە... گەڵای پەڵك بکوترێ و بنرێ لەبرینی تەڕ زۆر بەکەڵکە.

یەکێ ئەگەر زەروو بچێت بە گەروویا و دەر نەئەهات گەڵای پەڵك بکوتێ و ئاوەکەی بخواتەوە زەرووەکە ئەکوژێ و فرێی ئەدا. یەکێ تاریکایی کەوتبووە سەرچاوی گوڵی داری پەڵك بخوا بۆ نەهێشتنی ئەو تاریکاییە باشە. هەروەها خواردنی جەویەکەشی بۆ نەهێشتنی ئەو تاریکاییە. وەکوو ئەڵێن داری پەڵك کەڵکی زۆری هەیە بەڵام بە تەواوی هێشتا هەمووی دەرنەکەوتووە، مەگەر پاشەڕۆژ دەری خا.



## ترنج

ترنج که «کەبات»یشی پێ ئەڵێن دارەکەی زۆرتر شوێنی گەرمەسێری ئەوێ، بەرەکەشی هەر ترنج - ی پێ ئەڵێن، ترنج تا بە ئەندازەی گرکەیەك ئەبێ، توێکڵەکەی زەردە و ئەستوورە، ئەم ترنجە زۆرتر ئەکرێ بە مرەبا، لەکاتی خۆیا تۆوەکەی لەوڵاتی ئێرانەوە کەوتۆتە وڵاتی ڕۆژئاوا. خۆڵەمێشی کوولەکە بکرێتە بن داری ترنج بۆی ئەبێ بە کووت و دارەکە بەرێکی زۆر ئەداو هیچیشی لێ هەڵناوەرێ.

یەکێ بۆنی دەمی هەبێ وەیا سیر و پیازی خواردبێ گەڵای ترنج بجوێ هەچ بۆنێك لەدەمیا بێ لای ئەبا. داری ترنج ئەگەر لە گەچ بگیرێ بەرەکەی بەدرێژایی ساڵ پێوە ئەمێنێ و هیچی بەسەریا نایە و خراپ نابێ. هەروەها ئەگەر خودی ترنجەکە لە دارەکە کرایەوە بخرێتە ناو جۆ ماوەیەکی زۆر ئەمێنێ. توێکڵی ترنج یەکێ بیخاتە دەمی و ڕاییگرێ ئەگەر بۆنی دەمی بێت لای ئەبا و بۆ ئیفلیجیش باشە.

یەکێ مار پێوەی بدا توێکڵی ترنج بگوشن و ئەو ئاوە بخواتەوە ژاری مارەکە ناهێڵێ، هەروەها ئەگەر خودی توێکڵەکەشی بخەنە سەر هەر باشە. وەیا ئەگەر یەکێ بەڵەکی هەبوو بە توێکڵی ترنج بیهەنوون بۆی باشە. توێکڵی ترنج بخرێتە ناو جلوبەرگەوە مۆرانە لێی نادا. ترنج لە هەر ژوورو شوێنێکا بوو بۆنەکەی هەوای فاسدی ئەو شوێنە و هەوای تاعوون لائەباو نایهێڵێ. خواردنی ئەسڵی گۆشتەکەی ئەبێتە هۆی پەیدابوونی کۆڵنج، دیارە زیادخواردنی ئەو شتەی کە لەناو گۆشتەکەیایە وەکوو ناوك وایە بۆی، خواردنی ئەوە چاو ڕووناك ئەکاتەوە و ئەو ڕەشییەی کە لەسەر ڕوومەتا پەیدا ئەبێ «کلف» ئەوەش لائەبا، ئافرەتێکیش کە زۆر شەهوانی بێ بیخوا شەهوەتەکەی کەم ئەبێتەوە.

تۆوی ترنج بکوترێ و بنرێتە سەر پێوەدانی دووپشك ژانەکەی ناهێڵێ. هەر ئەو تۆیە ئافرەت بیبەستێ بە قۆڵیەوە سکی پڕ نابێ. ناوکی ناوکەکەی بگوشرێ ئەو ئاوەی بدرێ لە مەرەکەبی سەر کاغەز لای ئەباو کاغەزەکە بەسپیەتی ئەمێنێتەوە.



## توو

داری توو دارێکی گەورەو بەدیمەنە، لەشوێنی کوێستانی و فێنکا ئەبێ، بەرەکەشی کە هەر پێی ئەڵێن «توو». دوو جۆرە: تووە سپی، تووە ڕەشە وەیا شاتوو. سپیەکە وردی هەیەو درشتیشی هەیە، هەر لەم سپیە هەندێکی گەورەیە بەئەندازەی دەنکە خورمایەك، وەکوو بڵێیت سپی و سوورە، تووە سپی زۆر شیرینە، وشکیش ئەکرێتەوە، هەروەها ئەیهاڕنەوەو لەناو مەشکەدا دایئەگرن پێ ئەڵێن «ئاردەتوو». ڕەشەکەشی خڕو دەنك گەورەیە. گەڵای داری توو کرمی ئاوریشمی پێ بەخێو ئەکرێ ئەگەر لە ژێر داری تووداپیازەخووگانە بچێنن دارەکە بەهێز و زۆر گەورە ئەبێ. داری توو تا موتوربە نەکرێ بەرنادا. گەڵای تووی شیرین و گەڵای مێوو گەڵای هەنجیری ڕەش لەگەڵ ئاوی بارانا پێکەوە بکوڵێنرێ و بدرێ لەموو زۆر زۆر مووەکە ڕەش ئەکا. یەکێ دانی ژان بکا گەڵای تووی مزری لەسەر دانێ ژانەکەی ئەشکێ. یەکێ دووپشك پێوەی بدا تووی ڕەشی لەسەر دانێن ژانەکەی ئەشکێنێ.



## داری تۆفانە

دارتۆفانە دارێکی گەورەی بەتەن و مەنە، لە شوێنی فێنکدا ئەبێ، زۆرتر حەز بە تەنیایی ئەکا، واتە لەگەڵ داری غەیری خۆیدا کەمتر ئەبێ، دارێکیشە وەنەبێ بەقەڵەم وەیا بەتۆو ئینسان بینێژێ بەڵکوو لەداری کێوی ئەژمێررێ. بەرەکەی شتێکە لەوێنەی بیبارێکی گەورەدا خڕو گۆشتنە، ناوەکەی پڕیە لەتۆوی وردە وردە تۆوەکەشی هەر وەکوو دەنکی ناو بیبار وایە، ئەم ناوکانە زۆر زۆرن، لەپاش ماوەیەك ئەمانە گیانیان تێ ئەکەوێ و دەست ئەکەن بەجووڵە جووڵ وەکوو کرمی زۆر ورد ئەکەون بەسەر یەکا، خواردنیان دیوی ناوەوەی

قاوخه‌که‌یه‌، که‌ تۆزێ گه‌وره‌تر بوون باڵیان لێ په‌یدا ئه‌بێ، تا ئه‌گه‌نه‌ ئه‌م پله‌یه‌ به‌ هۆی خواردنیان قاوخه‌که‌شی کون ئه‌بێ ئه‌مجا دێنه‌ ده‌ره‌وه‌ و باڵ ئه‌گرنه‌وه‌و پێیان ئه‌ڵێن مێشووله‌و ئه‌بن به‌ خۆراکی ته‌یرو باڵنده‌ مێشووله‌ خۆره‌کان.

شوێنێك له‌ له‌شا ئێسقانه‌که‌ی سست و بێ‌هێز بووبێ وه‌یا درزی بردبێ گه‌ڵای دارتۆفانه‌ی پیا پێچن چاکی ئه‌کاته‌وه‌ و ئه‌یگرێته‌وه‌. ئه‌و قاوخانه‌ که‌ تۆفانه‌که‌ی تیایه‌ بدرێ له‌ده‌م و چاو جوانیه‌کی‌تری ئه‌داتێ. توێکڵی قاوخه‌کان به‌ ته‌ڕی له‌گه‌ڵ سرکه‌دا تێکڵاو بکرێ و بدرێ له‌ به‌ڵه‌کی لای ئه‌با هه‌روه‌ها بدرێ له‌ برینیش چاکی ئه‌کاته‌وه‌.



## سووره‌چنار

سووره‌چنار له‌ هه‌موو دارێك گه‌وره‌تره‌و به‌رزتر و به‌ ته‌مه‌نتره‌، گه‌ڵاکه‌ی پان و گۆشه‌گۆشه‌و گه‌وره‌یه‌ له‌وێنه‌ی گه‌ڵای مێودایه‌، ئه‌م داره‌ که‌ زۆر پیرو کۆن بوو ناوه‌که‌ی بۆش ئه‌بێته‌وه‌ و ئه‌پوێ هه‌ر ئه‌مێنێته‌وه‌ توێکڵه‌که‌ی جروجانه‌وه‌رو باڵنده‌ ئه‌چن هێلانه‌ی تیا ئه‌که‌ن.زۆر جار باڵنده‌کان ئه‌چن گه‌ڵای ئه‌م سووره‌ چناره‌ ئه‌به‌نه‌ هێلانه‌که‌ی خۆیان بۆ ئه‌وه‌ قالۆچه‌ نه‌چێ به‌لایانا، چونکه‌ قالۆچه‌ له‌ گه‌ڵاکه‌ی هه‌ڵدێت.

چاوێك که‌ ئاو بکاو ناساز بێ گه‌ڵای سووره‌چنار بشوونه‌وه‌ و بیکوڵێنن و پاشان بیخه‌نه‌ سه‌رچاوه‌که‌ ئه‌و ئازارانه‌ی ناهێڵێ. شوێنێك له‌ له‌شا که‌ سووتابێ وه‌یا ددانێك ژان بکا توێکڵی داری سووره‌چنار له‌گه‌ڵ سرکه‌دا بکوڵێنن بیخه‌نه‌ سه‌ری ژانه‌که‌ی ئه‌شکێ. به‌ری ئه‌م داری سووره‌ چناره‌ له‌گه‌ڵ پیودا بکرێ به‌ مه‌عجوون و بنرێته‌ سه‌ر پێوه‌دانی جروجانه‌وه‌ر زۆر بۆی باشه‌.



## داری خورما

داری خورما داریێکی ڕاستی جوانی بەرزە، لە وڵاتی گەرمەسێردا نەبێ نابێ، تا نەوەدو شەش جۆری هەیە، لە زۆر شتیا لە ڕەوشتی ئینساندایە؛ لە ڕاستی باڵایا، لە جیابوونەوەی نێر و مێکەیدا، لەوەدا کە تا ئەو نێرو مێیە یەك نەگرن وەیا بۆنی یەك نەکەن نایەنە بەر، مەڕ لە وڵاتی کوێستانا چ کەڵکێکی هەیە، خورماش لەوڵاتی گەرمیانا ئاوایە، چۆن مەڕ هەرچی شتیەتی تەنانەت قشپڵەکەشی بەکەڵکە و هیچ شتێکی بە خۆڕایی ناڕوا داری خورماش ئاوایە، کورد بە دارەکەو بە بەرەکەی هەر ئەڵێ خورما، بەش بەش گەڵا دەر ئەکاو وشك ئەبێ شوێنەکەی ئەبێ بە قەفی دارەکە تا تەواو بەرز ئەبێتەوە، ئەمجا لە سەرەوە گەڵاکانی ئەمێنێ و بەر ئەدا، بەرەکەی وەکوو ترێ بەهێشـۆیە بەڵام هێشـۆی ئەم زۆر گەورەیە، قەفەکەش زۆر بەرز ئەبێتەوە.

لەسەر ئەمە ئەڵێ جارێك دوو کورد ڕێگایان ئەکەوێتە ئەو وڵاتی عەرەبستانەو چاویان بە دار خورما ئەکەوێ کە زۆر بەرزە، یەکێکیان بەویکەیان ئەڵێ: ئەرێ برا ئەوە دار خورما بۆچ خوا ئەوەندە بەرزی دروست کردووە؟ ئەوی کەشیان وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێ: «برا لە ترسی حوشترا!».

داری خورما ئەگەر سەرەکەی ببڕن دارەکە ئەمرێ و وشك ئەبێ، «تەلع»ەکەی بۆنی مەنی لێ دێت، بەرگێکی هەیە بەسەریەوە وەکوو ئەو پێستەیە کە منداڵی تێدایە لە کاتی بوونەکەیا، ئەگەر لقێکی بڕا ئیتر دەرناچێتەوە وەکوو ئەندامی ئادەمیزاد، لیفێکی بەسەرەوەیە وەکوو موو وایە بەسەری ئینسانەوە، ئەگەر نێر و مێکەی لە ناشتنا لێکەوە نزیك بن بەری زۆر ئەدا، ئەگەر یەکێکیان بڕان ئەویتریان بەرنادا، ئەگەر نێرێك لەناو مێکانا نێژرا، «با» هەڵیکرد بۆنی «تەلع»ەکە لە ناو مێکانا بڵاو ئەکاتەوە، بەو بۆنە مێکان دێنەبەر.

«تەلع» دوو شتە وەکوو نەعل وایە کە خرابنە سەر یەك و جووت کرابن، ئەمە لە دار خورماکە دەرئەچێ. دار خورما پیوێکی هەیە لەسەرەوە ئەگەر ئەو پیوە فەوتا دارەکە

ئەمرێ، وەکوو مێشك وایە بۆ ئینسان کە فەوتا هەمووی ئەفەوتێ.

داری خورما تا زیاتر لە سەد ساڵ ئەژی، لە ساڵی شەشەما دێتە بەر.

داری خورما کە سووتێنراو سووتا خەڵووزی نییە، ئەگەر هەروا بەساغی بکرێ بە دارەڕای خانوو گورج ئەشکێ، خۆ ئەگەر بە درێژایی بکرێ بە دوو کەرتەوە و پشتیان بکرێتە یەك کە کرانە دارەڕا ماوەیەکی زۆر ئەمێنێ.

لە بابەت خورما و دار خورماوە داستانێك هەیە ئەڵێن:

داری خورما بە تایبەتی و هەر دارێکی بەرداری تریش ئەگەر بەری نەدا یەکێك تەورێك بگرێ بەدەستەوەو بچێ بەلایەوە، یەکێکی تریشی لەگەڵا بێ، بەو یەکە بڵێ: لەبەر ئەوە ئەم دارە بەر نادا ئەمەوێ بیبڕمەوە، ئەویش بڵێ: بابە مەیبڕەوە ئیمساڵ بەر ئەدا، ئەویش بڵێ بابە بەری چی؟ کوا بەر نادا و نایەتە بەر، بێنێ بە «مۆ»ی تەورەکە دوو سێ تەوری پیاکێشێ، کابرای‌تر بێنێ دەستی بگرێ بڵێ: برام مەیبڕەوە داری چاکە، ئیمساڵیش لێی گەڕێ، ئەگەر ئیمساڵ بەری نەدا ئەو وەختە بیبڕەوە ئەڵێن کە ئەم ئیشە کرا ئەو ساڵە ئیتر دارەکە دێتە بەر.

خورما وەکوو ترێ دۆشاوی لێ ئەکرێ، شەرابی لێ ئەکرێ. یەکێ سیر بخوا پاشان خورما بخوا بەسەریا بۆنی سیرەکە نایەڵێ.

ئەو ژنەی کە مناڵی بووەو زەیسانە خورما خواردن بۆ ئەو زۆر باشە.

خورما وەکوو کورد ئەڵێ: کوردە کوژەکەی تەبێعەت نەرم ئەکا، ئاوی پیاو زیاد ئەکا «مەنی». بەتایبەتی خواردنی ئەم جۆرەیان لەگەڵ خەیارو کاهوودا پیاو قەڵەو ئەکاتەوە.

## زەیتوون



زەیتوون دارێکە کە گەڵایەکی سەوزی تەڕی ئاوداری هەیە، بەرەکەشی هەر پێی ئەڵێن زەیتوون، سەوز ڕەنگ و خڕە ئەخورێ و ڕۆنی لێ ئەگرن و زۆر بەکەڵکە، داری زەیتوون زۆر درەنگ دێتە بەر، لەوانەیە ئەگەر یەکێ بینێژێ کوڕی ئەو کەسە

بەرەکەی ئەخوا. وەکوو ئەڵێن دارەکەی تا هەزار ساڵ ئەژی. شوێنی فێنك بۆی باشە. دارەکەی کە بسووتێنرێ دووکەڵ ناکا وەکوو ڕۆنەکەی، ڕۆنەکەی بۆ گەلێ دەرمان بەکار ئەهێنرێ.

داری زەیتوون بۆ بێ‌ئاوی ماوەیەکی زۆر خۆی ئەگرێ، ئەگەر لەداری بەڕوو سنگ دروست بکرێ و بکوترێ بە چوار دەوری ئەو زەوییەدا کە داری زەیتوونی لێیە، ئەو زەیتوونە بەهێزو بەرێکی زۆری ئەبێ.

ڕیشەی داری زەیتوون بکرێتە ئەستۆی ئەو کەسە کە دووپشك پێوەی داوە هەر خێرا ژانەکەی ئەشکێ. گەڵای داری زەیتوون بەسەوزی و تەڕی لەگەڵ ئاودا بیکوڵێنن و ئاوەکە بپرژێنی بەناو ماڵدا مێش لەو ماڵەدا نامێنێ.

یەکێ دانی ژان بکا گەڵای زەیتوون لەگەڵ سرکەدا بکوڵێنێ و بیخاتە سەری ژانەکەی نامێنێ. هەر ئەو گەڵایە لەگەڵ ئاوی هەنگویندا بکوڵێنرێ، بنرێتە سەر ددانێ کە کرم خواردوویەتی هەر خێرا هەڵی ئەکەنێ. جەوی داری زەیتوون بنرێ لە مایەسیری بۆی باشە. هەر جەوی داری زەیتوون بکرێتە ناو ئاوو تیایا بتوێتەوە، نان بژەنن بەو ئاوەدا و داینێن بۆ مشك، کە خواردی ئەتۆپێ.

جەوی داری زەیتوونی دەشتەکی بۆ گەڕی زۆر بەکەڵکە، هەروەها ددانێ کە کرمێ بووبێت پێ پڕ کەنەوە بۆی باشە. زەیتوون بەرەکەی خواردنەکەی تاڵیی دەم ناهێڵێ، بەڵغەم لائەبا، دەمار بەهێز ئەکا، ماندوێتی ناهێڵێ، ڕەوشت و ئەخلاق باش ئەکا، خۆشییەك ئەدا بە نەفس، خەم ناهێڵێ، ڕۆنی زەیتوونی دەشتەکی بۆ ژانەسەر باشە، پۆکێك کەفش بووبێتەوە، وە ددانێك کە لەق بووبێت بدرێ بە دەمدا هەمووی چاك و بەهێز ئەکاتەوە.

یەکێ ددانی ژان بکا دەمی بگرێ بە دووکەڵی ناوکەکەیا ژانەکەی نامێنێ، هەروەها دووکەڵی ئەو ناوکەی بۆ یەکێ کە «سی» ژان بکا بۆی باشە.



## داری سەرو

سەرو دارێکە لە وێنەی کەللە شەکردا، گەڵاکەی وردو هەموو دەم بەزستان و هاوین سەوزە، قەفێکی ئەستووری هەیە ڕاست چووە بە ئاسمانا، هەموو جار باڵای نەونەمامان ئەکەن بەو.

دووکەڵی داری سەرو کە بسووتێنرێ مێشوولە لەو دەورەدا ناهێڵێ. گەڵای سەرو بەتەڕی و سەوزی بیکوتی و بینێ لەبرین گۆشتەو زوونی پێ دێنێتەوە. خۆڵەمێشی گەڵاکەی بکرێ بەسەر سووتاوی ئاگردا بۆی باشە، هەروەها بۆ برینی تریش باشە، بەرەکەی بکوڵێنرێ لەگەڵ سرکەدا و بنرێ لە ددانێ کە ژان بکا بۆی باشە.



## داری سماق

سماق دارێکی مامناونجیە بە ئەندازەی داری هەنار، لە شوێنی فێنك و کوێستانیدا ئەبێ، بەرەکەی هێشو هێشوە، دەنکەکەی وردە، پێستێکی تەنکی بەسەرەوەیە، تامەکەی تورشێکی بەلەزەتە ئەسوورێتەوەو لە خواردەمەنیدابەکار ئەهێنرێ، ئەم سماقە مایە بەهێز ئەکاو سەفرا ئەهێنێ، واتە کۆی ئەکاتەوە. شوێنێ لە لەشا لێی درابێ وەیا کوترابێ سماقی لێ بنێن نایەڵێ بئاوسێ، جەویی دارەکەی لەسەر ددانێ کە ژان بکا داینێن ژانەکەی ئەشکێنێ.



## سنەوبەر = کاژ

سنەوبەر دارێکی گەورەی بە دیمەنی وەکوو چنار وایە، گەڵاکەی پان و سەوزێکی تاریکە، بەرێکی هەیە لەوێنەی دڵی مەڕدا پاش ئەوە کە پێ ئەگاو وشك ئەبێتەوە لێك ئەبێتەوە ئەقەڵشێتەوە، نە ناوکی

هەیە وە نە ئەشخورێ، سنەوبەریش لەبەین خۆیا دوو سێ جۆرە قەتران لەو وەرئەگیرێ، ڕۆنی هەیە، ئەگەر بە تەڕیش بسووتێنرێ هەر دووکەڵی نییە، لەپاش ئەوە کە توێکڵەکەی گیرایەوە نزیکی ئاگر ئەخرێتەوە وەیا ئەگیرێ بە ئاگردا ئەو زەیچکاوەی کە لێی دەرئەچێ ئەوە قەترانە.

داری سنەوبەر بسووتێنرێ و خۆڵەمێشەکەی لەهەر شوێنێکا بڵاو بکرێتەوە جرو جانەوەر نایەڵێ. بەتایبەتی ئەگەر خۆڵەمێشەکەی بکرێتە ناو حاجەتێك و لە شوێنێکا دابنرێ ئەوانەی دانیشتوون بێترس ئەبن لە هاتنی جروجانەوەر. وردە گەڵا لەداری سنەوبەرا پەیدا ئەبێ وەکوو ڕیش وایە، جا یەکێ دانی ژان بکا ئەو ڕیشە بێنێ لەگەڵ سرکەدا بیدا بە دەمیا ژانی ددانەکەی ئەشکێ. گەڵای سنەوبەر بنرێ لەبرین ئەیهێنێتەوە یەك.

بەری داری سنەوبەر کە پێی ئەڵێن گوێزەك، بۆ قۆڕی، ژانی دەمار، شلەپەتەیی و بزووتنی شەهوەت باشە، ئەگەر ئەو بەرە لەگەڵ هەنجیردا بیکوتن و بینێن لە شوێن پێوەدانی دووپشك ژانەکەی ناهێڵێ. یەکێ کۆکە پیرەی هەبێ، واتە کۆکەیەکی وای هەبێ کە لێی پیر کردبێ، بەری سنەوبەر و خورما بخوا بۆی باشە.



## سەندەرووس

داری سەندەرووس کە بە کوردی سەندەنووسی پێ ئەڵێن دارێکە لە هێند زۆرە، ڕۆنی ئەم دارە ئەگیرێ و لە مشتومالّ بریسکەی ئەو شتانە کە لە دار دروست ئەکرێن بەکار ئەهێنرێ، دارەکە ڕەنگی زەردە، وەکوو کارەبا کا ئەفڕێنێ، ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەم بسووتێنرێ بۆنێکی ناخۆشی لێ پەیدا ئەبێ، کارەبا بۆنی خۆشە.

ئەم داری سەندەنووسە ڕۆنەکەی ئەگیررێ، ئەم ڕۆنە زۆران بازەکان ئەیدەن لە لەشیان وەیا بیدەن لە لەشیان، لەشیان نەرم ئەبێ و بەهێز ئەبن لەسەر زۆرانبازی. ڕۆنی سەندەنووس مایەسیری پێ بماڵن زۆر باشە بۆی و وشکی ئەکاتەوە. دووکەڵەکەی بۆ نەهێشتنی ئاوی چاو، دیسان بۆ مایەسیری، بۆ دانێشە باشە کە خۆی پیاگرێ، هەروەها بۆ تەنگەنەفەسی و بزووتنی شەهوەتیش بەکەڵکە.



## داری سێو

سێو وەکوو ناوە بۆ بەرەکە ناوە بۆ دارەکەشی، سێو گەلێ جۆری هەیە هەمووی بەکەڵکە، دارەکەی زۆرتر شوێنی فێنکی ئەوێ، بەقەڵەم ئەنێژرێ، لەو کاتەدا کە ئەینێژن ئەگەر پیازە خووگانە بنێژن بە دەوریا کرم ناداتە بەرەکەی، ئەڵێن ئەگەر گوڵی سوور لە بنەکەیا بنێژرێ سێوەکە سوور دەرئەچێ. ئەگەر بتەوێ زۆر سێوەکە بمێنێتەوەو خراپ نەبێ بیهێنە سێوەکە بپێچێنە لەگەڵای داری زەیتوون وەیا لە گەڵای داری گوێزەوەو بیخەرە بن زەوی، وەیا بیخەرە ناو قوڕەوە ئیتر ئەو سێوە زۆر ئەمێنێتەوە.

ئەگەر منالّ تووشی سکچوون بوو ئاوی سێوی بدرێتێ بۆی باشەو ئەیوەستێنێتەوە.

یەکێ زەهری خواردبوو، وەیا ژاری ژاردارێك کاری تێ کردبوو، گەڵای داری سێو بگوشرێ و ئاوەکەی بگیرێ ئەو کەسە ئەو ئاوە بخواتەوە زەهرەکە کاری تێ ناکا. گوڵی داری سێو یەکێ بیخوا مێشکی زۆر بەهێز ئەکا. سێوخواردن خۆی زۆر بەکەڵکە بەلام دەوامکردن لەسەر خواردنی سێوی بەهاری لەوانەیە دەمارەکان بێنێتە ژان. بۆنکردنی سێوو خواردنەکەی دڵ بەهێز ئەکا. بەتایبەتی خواردنی سێوی کاڵ بۆ نەهێشتنی ژاری دووپشك و هەموو زەهرێکی تری گەرم باشە.

## شلّانە



شلّانە کە قەیسییە، بە دارو بە بەرەکەی ئەڵێن قەیسی وەیا شلّانە، دارێکی بەدیمەنە، بەرێکی زۆر ئەدا، زیاتر لە وڵاتی فێنکدا ئەبێت، بەری هیچ دارێك نییە ئەو بەرە خۆی و ناوکەکەی بخورێ تەنیا قەیسی نەبێ، ڕەنگی دارەکەشی مەیلەو سوورە، دارەکە جەوی دەرئەکا، شلّانە

کە پێش ئەوە بە تەواوی پێ بگا ڕەنگەکەی سەوزێکی قەرسیلیەو پێی ئەڵێن چەقاڵە، کە پێ گەیشت ڕەنگی زەرد زەرد هەڵئەگەڕێ، جۆرێکی هەیە کە زۆر باشە ڕەنگەکەی لە بەینی سپی و زەرددایە. ناوکەکەی خۆشەی هەیەو تاڵیشی هەیە، تاڵەکەی ئەیشکێنن و بە هۆی خوێیەوە خۆشەی ئەکەن.

خواردنی چەقاڵەی قەیسی "تا" لە لەشا پەیدا ئەکا. ئەگەر یەکێ ددانی ئاڵ بووەوە گەڵای داری قەیسی بجوێ ئاڵیەکەی نامێنێ. ڕۆنی ناوکی قەیسی بەکەڵکە بۆ مایەسیری.

ناوکە تاڵەی قەیسی بکوڵێنرێ و لەسەر ئەو لکانە دانرێ کە لە دەموچاودا پەیدا ئەبێ لای ئەبا، هەروەها کۆڵنجیش ئەکاتەوە.



## شیلان

شیلان دارێکە لە وێنەی تووترکدا، بەرێکی هەیە سووری بۆنخۆش، پێستەکەی سوورە ئەخورێ، ناوکەکەی زۆر سەختە، چ بە تەڕی چ بە وشك کراوەیی ئەخورێت.

ئەگەر چاو بەهۆی گەرماوە تێك چوو گەڵای شیلانی بخرێتە سەر بۆی چاکە. بەری شیلان واتە ئەسڵی شیلانەکە خواردنی بۆ جموجووڵ کردنی خوێن لە لەشا باش نیە، کەواتە ئینسان خۆی لێ بپارێزێ.



## عەرعەر

داری عەرعەر سەروی کێویە، هەر وەکوو سەرو وایە بەڵام کورتترە، بەرێکی هەیە بە ئەندازەی پستەیەك ئەبێ، زانیاری پزیشکی زۆر کەڵکی لێ وەرئەگرێ.

دووکەڵی هەر شتێك لە داری عەرعەر جڕوجانەوەر ئەتارێنێ. ئەو بەرەی کە هەیەتی وەکوو گوێز وەیا پستە وایە ئەگەر لەگەڵ ڕۆنی کونجیدا بکوڵێنرێ بەڵام لەناو

تاوەیەکی مسدا هەتا وای لێ دێت دەنکەکان ڕەش ئەبنەوە، پاشان ئەوە بکرێتە گوێچکەی پیاوی کەڕەوە چاك ئەبێتەوە.

ئافرەتی زك پڕ ئەگەر بەری عەرعەر بخوا بەرەکەی ئەخا، هەروەها ئەگەر وەکوو شاف هەڵیشی‌گرێ هەروایە بۆی.



## فنق

فنق وەیا فندق دارێکی کورتە، کە تۆزێ بەرز بووەوە لەزەوی ئەو وەختە لق دەرئەکاو ئەو لقانە بڵاو ئەبنەوە، گەڵاکەی قەراخەکەی هەموو وەکوو لەلە کرابێ وایە، بەرێکی هەیە ئەم دارە بەرەکەشی هەر فنقی پێ ئەڵێن ورد و خڕە، گەلێ بچووکترە لە گوێز، پێستەکەی سەختە، خۆی لە چەرەزات و ئاجیلێکی بەلەزەتە.

ئەگەر بەچیلکەیەك لەداری فنق جغزێك بەدەورەی دووپشکدا بکێشرێ ئەو دووپشکە ناتوانی ئیتر لەو جغزە دەرچێت.

فنق خواردن مێشك زۆر بەهێز ئەکات... ئەگەر منالێ چاوەکانی شین بوو بە فنق فریشکی بهەنوون ئەو چاوشینیەی نامێنێ و ڕەش ئەبێت.. فنق هەرکەس لەگەڵ خۆی هەڵی‌بگرێ دووپشك پێوە ناداو ئەمین ئەبێ لێ.. ئەگەر یەکێ مووەرێزە (داءالثعلب)ی بوو، فنق بسووتێنێ و بیهاڕێتەوەو بیکا بەو شوێنەوە مووی لێ دێتەوەو ئیتر هەڵناوەرێ.. فنق بکوترێ و لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو بکرێ و بخورێ بۆ نەهێشتنی کۆکەپیرە، واتە کۆکەی کۆن باشە... خواردنی فنق زەین تیژ ئەکا کە دەوامی لەسەر بکا. توێکڵی فنق بسووتێنرێ و بیهاڕێتەوەو لەگەڵ ڕۆنی زەیتا تێکڵاو بکرێ و بدرێ بە منالی چاوشین شینی چاوەکەی نامێنێ.



## گزك چار

گزك چار وەیا گەز دارێکە بەدیمەن، گەڵاکەی وەکوو داری سەرو وایە، جۆرێکی تری هەیە وەکوو دەوەن وایە، هێشوویەکی هەیە سپیکار وەیا سوور ڕەنگ هەنگ زۆر خۆشی لەوە دێت. ئەم دارە بۆ سووتاندن زۆر بەهێزە، ئاگرەکەی تیژە، بەرێکی هەیە بۆنی خۆشە.

یەکێ سپڵی ژان بکا لقێ لە داری گەز بخرێتە ناو سرکە پاش ماوەیەك مانەوە تیایا ئەو سرکەیە بۆ نەهێشتنی ژانەکە باشە. شوێنێك لە لەشدا کە بئاوسێ گەڵای گەزی لێ بنرێ ئەینیشێنێتەوە... دووکەڵی داری گەز برینی تەڕو ئاوڵە وشك ئەکاتەوە.. داری گەز بسووتێنرێ خۆڵەمێشەکەی بپڕژێنرێ بەسەر ئەو شوێنەی لەشدا کە بە ئاگر سووتاوەو بەسەر برینی تەڕدا وشکی ئەکاتەوەو چاکی ئەکاتەوە... یەکێ ڕوتەیل پێوە بدا وەیا ئازاری چاوی هەبێ بەری داری گەز بۆی باشە.



## داری گوێز

گوێز بەری دارێکە کە بە دارەکەش ئەڵێن داری گوێز. ئەم داری گوێزە دارێکی گەورەی بەدیمەنە، لەوڵاتی کوێستانیدا ئەبێت، چاندنی بە قەڵەم نییە هەر بەناشتنە، واتە هی دەنکەکەی، گەڵایەکی پانی پڕی هەیە بە جۆرێك ئەگەر هەتاو بدا لەسەری هیچ لەو هەتاوە لەبەر پڕی گەڵاکەی ناکەوێتە بنەکەی، داری گوێز دارێکی قایمە و لەگرێ کانیا وێنەی سەیر سەیر دەرئەکەوێ، لەم گرێیانە هەموو جۆرە پیشەسازیەکی دارینی نایابی لێ ئەکرێ، دەنگ وایە لەو کاتەدا کە ئەو گرێیە لەقەفی دارەکە دروست ئەبێ چی بەوێدا تێ پەڕێ ئەو گرێیە وێنەکەی ئەگرێ، لەپاشا کە بڕایەوە و کرا بە سینی وەیا شتێکی تر ئەو وێنەیە لەناو ئەو شتەدا دیارە،

دارەکەش چەورە لەسووتانا گڕێکی تیژی کەم دووکەڵی هەیە، گوێزو دارەکەی یەکێکە لە سەرمایەی زۆر شوێنی کوردەواری.

دانەی گوێز دوو توێکڵی هەیە؛ یەکێ سەوز کە پێ ئەڵێن «کەمکۆڵ»، یەکێکیتر لە ژێر ئەوەوە کە ئەمە سەختە، کە ئەو کەمکۆڵە وشك بووەوە ئەوە گوێزەکە پێ گەیشتووە. لەناو ئەم دوو توێکڵەدا کاکڵەکە هەیە کە ئەمە ئەخورێ و لە گەلێ لە ئاجیلەکانا بەکار ئەهێنرێ، لەتوێکڵی دارەکە و لەم کەمکۆڵەدا مادە ڕەنگێکی تێدایە بەنی پێ ڕەنگ ئەکەن و لەقاڵی و گۆرەوی‌کردنا بەکاری دێنن و ناچێتەوە. لەکاتێکا کە هێشتا گوێزەکە وشك نەبوەتەوەو کاکڵەکەی تەڕە ئەو کاکڵەیە پێ ئەڵێن «کاردۆژە» خواردنی بەلەزەتەو بە ڕووتی ئەخورێ.

ئەگەر بویسترێ گوێز توێکڵەکەی تەنك بێ و کاکڵەکەی بە پوختی بێتە دەرەوە گوێزێك بێنە بیخەرە ناو میزی منالێکەوە کە ئەو منالە هێشتا پێنج ڕۆژ عومری تەواو نەکردبێ، لەپاشا ئەو گوێزە بنێژەو خۆڵەمێشی بکە بەسەرا، ئەمە بە توێکڵەکەوە. وە یا خود گوێزێك بێنە بیشکێنە بەڵام بەجۆرێکی وابێ کە کاکڵەکەی بریندار نەبێ و بەساغی بێتە دەرەوە، لە پاشان بێنە ئەو کاکڵەیە بپێچێنە لە کاغەز وەیا پەڕۆ، وەیا گەڵایەکی مێوەوەو ئەمجا بینێژەو خۆڵەمێش بکە بەسەریا. ئا ئەمە کەبوو بە دار گوێزی ئەو دارە توێکڵەکەی زۆر تەنك ئەبێ و خێرا ئەشکێ و کاکڵەکەی بەساغی دێتە دەرەوە..

داری گوێز بەینی لەگەڵ هیچ دارێکا نییە تەنیا لەگەڵ فنقا نەبێ، کە لەنزیك ئەوەوە بوو خۆی تێ هەڵئەسوێ و گوێزەکەش زۆر بەلەزەت ئەبێ. شوێنێك لە لەشا ئازاری پێ گەیشتبوو کاردۆژەی بخرێتە سەر بۆی باشە... دەوام‌کردن و زۆر خواردنی کاردۆژە زمان گران ئەکاو لەوانەیە قورحەش پەیدا کا. توێکڵی گوێز بسووتێنرێ و بنرێ لە برین وشکی ئەکا... گوێز بەتوێکڵەکەیەوە بیسووتێنی و بیدەی لەموو ڕەشی ئەکاتەوە... نووستن لەژێر داری گوێزدا لەش گران ئەکا... داری گوێز تا سێسەد ساڵ ئەژی، داری گوێزی وا هەیە لەو بەرەیدا کە ئەیگرێ تا سەد هەزار گوێز ئەگرێ... گوێز لە کوردەواریدا زۆر بوو بەڵام لەم دەورەی دواییەدا بە هۆی نەزانینی خۆیان و فێڵبازی غەیری خۆیانەوە دارەکانیان لێ ئەکڕین و ئەیانبڕیەوەو ئەیاننارد بۆ وڵاتان شتی نایاب

نایابیان لێ دروست ئەکرد و پیاوە کوردە هەژارەکەش وای ئەزانی لەو کاتەدا ئەو چەند پوولەی دەستکەوتووە هەموو شتێکە بۆ پاشەڕۆژی، لەگەڵ ئەوەدا مردووە....



## لیمۆ

لیمۆ یەکێکە لە میوە بەلەزەت و جوان و بەکەڵکەکان، دارەکەی لە وڵاتی گەرمەسێرا ئەبێ، بەری دارەکەش هەر لیمۆی پێ ئەڵێن، توێکڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە تەنکتر لە توێکڵی پرتەقاڵ. لیمۆ لەسەر دوو جۆرە:لیمۆی شیرین و لیمۆی تورش، تورشەکەی بەکەڵکترە لە شیرینەکەی، خواردنی لیمۆی تورش بۆ ئەلامەت، «معدە» تێك چوون، سەرگێژبوون، گەرووتۆزانەوە بۆ ئەمانە هەموویان باشە و لایان ئەبا.توێکڵی لیمۆ ئەخەنە بوخچەی جلوبەرگ بۆ بۆن خۆشی و بۆ مۆرانە لێی نەدان. ئاوی لیمۆ بۆ نەهێشتنی ژاری مارو دووپشك و شتە زۆر باشە، یەکێ ئەگەر شتێك لەوانە پێوەی دا لیمۆ بخواو لە ئاوەکەشی بکا بەسەر شوێنی پێوەدانەکەدا زەهرەکە ئیتر کاری تێ ناکاو ژانیشی ئەشکێ.



## مازوو

مازوو کە «مازگ»یشی پێ ئەڵێن ئەمە زیاتر لەوڵاتی کوێستانیدا ئەبێت، دارەکەشی هەر پێی ئەڵێن داری مازوو، دارەکە لە سووتانا ئاگرێکی تیژی هەیە. داری مازوو حەڤدە بەری هەیە، ئەمە نۆیانە: مازوو، خڕنووك، سیچکە، گزگل، تسگل، جەوت، قژگە، لووتەخووگانە، بەڕوو. بەلام بەڕووی دار مازوو بێکەڵکە. مازوو لە کوردەواریدا سەرمایەیەکی گەورەیە بۆ ئەو شوێنانەی کە هەیەتی، ئەیکەن و بە بازرگانی ئەینێرن بۆ وڵاتان لە ڕەنگ و ڕەنگ‌کاری و دەباغیدا بەکاری دێنن، خۆی بچووکێکی گرنج گرنجی ڕەقە، دەنك دەنك وا لەبەینی گەلای

دارەکـەدا، مازووکـەران بەکوڕو کچـەوە لەژێـرەوە سـەیری ئەکـەن ئەیدۆزنـەوەو بەدارێکی درێژ کە بە دەستیانەوەیەو سەرەکەی دووفاقەیە لێی ئەدەن ئەیقرتێنن و ئەکەوێتە خوارەوە، بـەم جۆرە دەنـك دەنـك ئەیکەن، ئەوانـەی کە مازووکـەر نەبن و لێی نەزانن لەناو گەڵای دارەکەدا بەدی ناکەن. ژنانی لادێ لەم مازووە ئەکەن بە مەشکەکەیانا بۆ ئەوە کەرەی زۆر بێ، ژنانی شار ئەیگرنە زێڕو ئەیکەن بەسەر منداڵنیانا بۆ ئەوە چاو کاری تێ نەکا...

ئەگـەر یەکـێ پێستی لەشـی بەهۆی نەخۆشییەوە کـرژ بووبێتـەوە کە بەم نەخۆشیە ئەڵێن قـوباء - بـە مـازوو خـۆی بهەنوێ چـاك ئەبێتەوە. ئەگـەر یەکێ پووکی خـراپ بوو، مـازووی تـێ بگـرێ چـاك و تونـدی ئەکاتـەوە. وەیا ئەگەر یەکـێ دانی کرمێ بـوو، مازووی بخاتـە سـەر کرمەکـەی ئەکوژێ و چاك ئەبێتەوە.. برینـی تەڕ مازوو بهاڕنـەوەو بیپرژێنن بەسـەریا وشـکی ئەکاتـەوە. مـازوو ئاوەکـەی بگیـرێ و ئـەو ئـاوەی بـدرێ لـە مـوو ڕەشـی ئەکاتـەوە. هەندێـك لایان وایـە داری مـازوو سـاڵێك مـازوو ئەگـرێ و سـاڵێك بـەڕوو، وا ئەزانێ ئەمیش وەکوو کەروێشك وایە ساڵێك نێرەو ساڵێك مێ!...

## مۆرد



مۆرد دارێکە کە پێی ئەڵێن «ئاس». ئەم دارە وەکوو داری هەنار وایە لە ڕەنگ و ڕوودا، گەڵایەکی سـەخت و گـەورەو بۆنخۆشـی هەیـە. هەموو دەم هـەر سـەوزە، لە زۆر شـوێن ئەبێت بـەڵام ئەگەر تۆزێ ساردیەکەی کەمتر بـێ زیاتر گەشـە ئەکا. کاتێ بویسـترێ بنێژرێ بۆ ئەوە بەهێز بێ، لە پێشا تۆزێ لم بکرێتە چاڵێکەوەو قەڵەمی مۆردەکـەی تێ خـرێ، ئەمجا بـە دەورەکـەیا جـۆ بچێنرێ مۆردەکـە ئیتـر زۆر بەهێز ئەبێ. گـەڵای مـۆرد یەکـێ لەگـەڵ خـۆی هەڵبگرێ بۆنی زۆر خـۆش ئەبێت، هەروەهـا بدرێ لە موو بنەکەی بەهێز ئەکاو ڕەش و درێژی ئەکا... خۆڵەمێشی مۆرد بۆ نەهێشتنی «کلف» و «بهق» و بۆ نەمانی ژاری ڕوتەیل کە پێوە بدا باشە، «کلف» ڕەنگێکی لێڵە لەسەر پێست پەیدا ئەبێ و سووری بەسەر ئەو ڕەنگە لێڵەدا زاڵ ئەبێ.

«بهق» سپیەتیە کە لەسەر پێست پەیدا ئەبێ و جیایە لە بەڵەکی. یەکێ تۆوی مۆرد بکاتە ئاو ئەو ئاوەبدا بەدەمیاو قوم قومی پێ بکا کرمی ددانەکانی ئەکوژێ.



## مۆز

مۆز دارێکە لە وڵاتی گەرمەسێر و نمناك زۆرتر ئەبێ، لە هێندستان و ئەفریقا زۆرە، گەڵایەکی پان و بەرزی هەیە، بەرەکەی لە پێشا لەناو بەرگێکی سنەوبەریش دایە، لە پاشان لێك ئەبێتەوەو بەوێنەی هێشۆ دەرئەچێ، لەناو هەر هێشۆیەکدا تا زیاتر لە دووسەد دانە پەیدا ئەبێ، ئەمانە وردە وردە زل ئەبن تا ئەگەنە کاتی خواردن، لە وێنەدا وەکوو دەنکی بامیە وایە، سەرەتا سەوزە پاشان زەرد هەڵئەگەڕێ، کە ئەینێرن بە وڵاتانا بە سەوزی لێی ئەکەنەوە تا ئەگاتە ئەو شوێنانە ئەگات، میوەیەکە مۆز کە ماڵی بێ ددانە، خواردنێکی بە لەزەتی هەیە، ئێستە لە گەلێ لە شوێنانیتر پەیدا بووە.

گەڵا مۆزی وا هەیە دوو گەز ئەبێ، هێشووەکان لەژێر گەڵاکانەوەیە، ئەو گەڵایە کە هێشوویەکی لەژێرایە هێشووی‌تر دەرناکا. مۆز خواردن ئەگەر کەم بێ میز ڕەوان ئەکا بەڵام ئەگەر زۆری بخورێت ئەبێتە هۆی میزگیران و بەرد پەیدا بوون لەمیزڵداندا..

## مێو



مێو کە بەرەکەی ترێ ئەبێ لە ڕەسەنی دارە و بەدار دائەنرێ، لە ڕاستیدا دارێکی بەکەڵکە، بەرەکەی ئەخورێ، گەڵاکەی ئەخورێ، خۆی و ڕیشەکەی ئەسووتێنرێ، مێو بە قەڵەم ئەنێژرێ، بە سێ ساڵ دێتە بەر، شوێنی فێنك بۆی بەکەڵکترە تا گەرم، وەکوو لە بەراوا ئەبێت لەدێمیشا ئەبێت، بەرەکەی کە ترێیە لەسەر سی و شەش جۆرە. ترێ

ڕەشی هەیە، سپیشی هەیە، مێو لق و تەرزی زۆر ئەڕوا، سەرمای بەهێز وشکی ئەکا، قەڵەمی مێو ئەگەر لە مێوی گەنج وەربگیرێ، لە نیوەی یەکەمی مانگدا بنێژرێ و سەری قەڵەمەکە بە شیاکە داپۆشرێ، لە دەوروبەری قەڵەمەکەدا هەندێ بەڕوو بکرێتە ژێر گڵەوە، ئەو قەڵەمە کە گەورە بوو مێوێکی زۆر بەهێز ئەبێ. ئەگەر بێنی ترێ ڕەش و سپی و سوور هەموویان بەیەك ئەندازە، کەرتیان بکەی بەجۆرێ کە پیستەکەیان نەکەوێ، پاشان بیاننووسێنی بەیەکەوەو بیان نێژە، ئا ئەمە کەبوو بەمێو بەرەکەی سێ جۆرە ترێ ئەبێ؛ ڕەش، سپی، سوور.

ئەگەر مێوبڕ بێنێ مەقەست وەیا چەقووەکەی بژەنێ بە خوێنی بۆق وەیا گورگدا و پاشان مێوەکەی پێ ببڕێ، ئەو مێوە کرم لێی نادا. ئەگەر بتەوێ ترێ سپی بێ بە ڕەش بنی مێوەکە هەڵکۆڵەو نەوتی ڕەش بکەرە بنەکەی، پاشان ئەو ترێیە کە لەو مێوە ئەبێ بە ڕەش دەرئەچێ. ئەگەر بویسترێ مێو سەرما کاری تێ نەکا بێنە لەناو باخی مێوەکەدا شیاکە بسووتێنە بە جۆرێ دووکەڵەکەی هەمووی بگرێتەوە ئەمجا بەری داری گەزی بەسەردا بپرژێنە ئیتر سەرما کار لەو مێوە ناکات. ئەگەر یەکێ عەرەق خۆرێکی وابوو کە پێی تەرك نەئەکرا، بێنن لەکاتێکا کە مێو ئەبڕن ئەو تنۆکە ئاوانە، کە لەسەر لقە بڕاوەکەوە ئەتکێن بیانگرن و بیاندەن بە عەرەق خۆرەکە، بەڵام لەپاش خواردنەوەی عەرەق و بەبێ ئەوەش کە پێی بزانێ، بیخواتەوە ئیتر عەرەقی لا ئەبێزرێ نایخواتەوە.

یەکێ ئەگەر پووکی شل بوو گەڵامێو بجوێت توندی ئەکاتەوە. یەکێ ژانەسەری هەبوو گەڵامێو تۆزێ بیکوتن و لەسەری دانێن ژانەسەرەکەی لەکۆڵ ئەخا... ترێیەك کە هێشتا تەواو پێ نەگەیشتووە خواردنەکەی سك بەرێ ئەکا، پیاویش قەڵەو ئەکاتەوەو شەهوەتی چوونە لای ژنیش زیاد ئەکا... هەروەها لەگەڵ سرکەدا دەرمانێکی بەکەڵکە بۆ مایەسیری.

شوێنێ کە خوێنی نەئەوەستایەوە سرکەی پیا کەن خوێنەکە ئەوەستێتەوە. هەروەها باشە بۆ شوێنێکیش کە سووتابێ و بۆ ژانەسەریش. ددان کە لەق بوو ئەو کەسە سرکە بدا بە دەمیا توندی ئەکاتەوە. سرکە شەهوەت ئەکوژێ و ئیسقا ئەڕەوێنێتەوە.. ترێ وەکوو سرکەی لێ ئەکرێ مێوژیشی لێ ئەکرێ، خواردنی مێوژ دەمار بەهێز ئەکا، ماندوێتی لائەبا،

توورەیی ناهێڵێ، بۆنی دەم خۆش ئەکا، بەڵغەم نایەڵێ، ڕەنگ جوان ئەکا، «معدە» بەهێز ئەکا. ترێ خۆیشی جگە لە سوود هیچ زیانێکی نییە، سوودی ئەوەندە زۆرە باس ناکرێ.



## نارنج

نارنج خۆی میوەیەکە لە ڕەسەنی لیمۆ و ئەمانە، گۆشتەکەی ئاودارو تورش مەزەیە، پێستەکەی تاڵ و زەرد ڕەنگە، دارەکەشی هەر داری نارنجی پێ ئەڵێن، دیمەنێکی جوان و گوڵێکی سپی بۆن خۆشی هەیە، لە شوێنانی گەرمیانا ئەبێت بەرگەی سەرما ناگرێت.

نێرگس لە ژێر داری نارنجدا بڕوێنرێ ئەو نارنجەی کە لەو دارە ئەبێ تورشییەکەی ئەگەڕێتە سەر شیرینی. یەکێ بۆنی دەمی هەبێ گەڵای نارنج بجوێ بۆنەکەی نامێنێ، هەروەها بۆنی سیرو پیازیش لائەبا... بۆن کردنی گوڵی نارنج بۆ مێشك باشەو دڵیش بەهێز ئەکا... ناوکی نارنج بۆنی دەم لائەبا. ئەگەر ناوکی نارنج لە شوێنێکا بسووتێنرێ دووکەڵەکەی مێرووله لەو شوێنەدا ناهێڵێ.



## هەرمێ

هەرمێ کە هەمرۆیشی پێ ئەڵێن و دارەکەشی هەر بەو ناوەوە ناو ئەبرێ، دارەکەی دارێکە لەوێنەی دارسێودا، شوێنەکەی وڵاتێکی فێنکی ئەوێ، هەرمێ گەلێ چەشنی هەیە؛ هەرمێ گوڵاوی، هەرمێ پایزە، شەکرە هەرمێ، هەرمێ پایزە یەك لە یەك خۆشتر و بەتامترن، هەرمێ لە کێویشا بە دێم ئەبێت بەڵام زۆر خۆش نییە. هەرمێ کە لە دارەکە کرایەوە زوو خراپ ئەبێ.

ئەگەر بتەوێ هەرمێ ماوەیەك بمێنێتەوە حاجەتێك بێنە هەندێ خوێی تێکە یەکە یەکە هەرمێکان لەسەر ئەو چەشنە کە بەدارەکەوەیە لەناو حاجەتەکەدا داینێ

ماوەیەکی باش ئەمێنێتەوە. هەرمێ کە لەدار کرایەوە بێنە یەکە یەکە سەرەکەی زفتی لێدەو هەڵیواسە ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە. هەروەها بێنە زفت بدە لە سەرەکەی و لەناو تەشتی گڵێنا لەسەر ئەو چەشنە کە بە دارەکەوەیە یەکە یەکە داینێ دیسان ماوەیە زۆر ئەمێنێتەوە. بۆنکردنی گوڵی هەرمێ مێشك بەهێز ئەکا.. خواردنی هەرمێ سەفرا لائەبا بەڵام کۆڵنجیش پەیدا ئەکا.



## هەشتاڵوو

هەشتاڵوو کە قۆخە دارو بەرەکەی هەر پێی ئەڵێن هەشتاڵوو، دارەکەی کورت و گەڵاکەی درێژە، لەشوێنی گەرمیانا نابێت وەکوو لەشوێنی کوێستانا ئەبێت. خودی هەشتاڵووەکە گەورە گەورەو پڕگۆشت و ئاودارە. توێکڵێکی زۆر تەنك و ناوکێکی گرنج گرنجی زۆر سەختی هەیە، قۆخ لە میوە جوانە بەلەزەتەکانە، بەڵام خواردنی قورسە... ئەگەر لەدیوی ناوی ناوکەکەیەوە هەر نەخشێکی لێ دەی و ناوکەکە بنێژی، پاشان لەهەر دەنکە قۆخێکی ئەو دارە چەشنی نەخش دەرئەچێ.

خواردنی قۆخ بۆنی سیر نایەڵێ. هەشتاڵوو بهێنرێ بەناوکی ئەو کەسەدا کە کرمی هەیە، کرمی ناو سکەکەی نامێنێ. قۆخەکە خۆی چ کەڵکێکی هەیە لەم دووشتەدا گەڵاکەشی هەروایە...



## هەڵووژە

هەڵووژە خۆی و دارەکەی یەك ناوی هەیە، لە شوێنی زیاتر فێنکدا ئەبێ، دارەکە زۆر بەرز نییە. هەڵووژە خۆی گەلێ جۆری هەیە؛ هەڵووژەی سپی، هەڵووژە ڕەشە، گۆگجە، ئاڵوو، ئاڵووباڵوو، گۆگجەیان شیرینە، ئەوانی‌تر تورش

مەزەو مێخۆشن، هەموویان پێستێکی نازك و ناوکێکی سەختی سافیان هەیە، تەبیعەتی ڕەسەنی هەڵووژە ڕەوانە خواردنەکەی.

هەموو جۆرەکان لە کوردەواری هەیە، جگە لە گۆگجە ئەوانی‌تر وشك ئەکرێنەوەو ئەکرێن بە چێشت و بە مرەبا. هەڵووژە هەموو جۆرەکانی بۆ تینوێتی و گڕەی دڵ باشە. ئەگەر دارەکەی بەزراوی گا بهەنوێ کرم ناداتە بەرەکەی.



## هەنار

هەنار وەیا داری هەنار. دارەکەی بچووکە، گەڵاکەی وردە، گوڵەکەی سوورە، جوانتر سوورێك کە هەبێ گوڵی هەنارە، قەفی دارەکەی دڕکاوییە، دارەکەی لەشوێنی کوێستانیدا نابێت، زیاتر شوێنەکەی ئەبێ گەرمیان بێت، وا دیارە سەرەتا لەوڵاتی ئەفریقاوە کەوتۆتە کوردستان. خودی هەنارەکە زل و ئاودار و دەنك دەنکی سوورە، ئەخورێ بەلەزەتە، خوێن پاك ئەکاتەوە، ڕبەناری لێ ئەگیرێ، بۆ تام خۆشی ئەکرێتە ناو چێشتەوە.

ئەگەر بەدەوری دارەکەیا مۆرد بنێژرێ دارەکە بەری زۆر ئەبێ.. ئەگەر ناوکی خورماو خوێ لەبن دارەکەیا بکرێتە چاڵ بەرەکەی خراپ ئەبێ.. ئەگەر بتەوێ هەنارێك دەنکی تۆو لە ناوەکەیا نەبێ لەوکاتەدا کە قەڵەمەکەی ئەنێژێ لای خوارووی قەڵەمەکە شەق بکە، ناوەکەی هەموو دەرێنە، پاشان پێکیەوە بنووسێنەرەوەو بەگیایەك توند بیبەستەو بینێژە، ئەو دارەکە هاتە بەر هیچ ناوك لەناو دەنکەکانیا نابێ. ئەگەر بتەوێ دەنکی هەنارەکە هەموو سوور بێ خۆڵەمێشی حەمام بێنە بیکەرە ناو ئاوەوەو ئەو ئاوە بکە بەسەر دارەکەدا دەنکی هەناری بەری ئەو دارە زۆر زۆر سوور ئەبێ، ئەڵێن دەنکی هەناری دارێك بێنە بیبژێرە چەند دەنك بوو هەموو هەناری ئەو دارە ئەوەندە دەنکە. ئەو لەلانە کە لەسەر هەنارەوەیە بیبژێرە ئەگەر تاق بوو دەنکی ئەو هەنارە تاقە، ئەگەر جووت بوو جووتە..

زۆرتر جرِوجانەوەر لە هەنار هەڵدێن. لقی هەنارو دووکەڵی داری هەنار جرِوجانەوەر

ئەتارێنێ. مار لە دووکەڵەکەی هەڵدێت. ئەگەر ددان لەق بوو هەنار بۆی باشە.. خواردنی هەنار بەو پەردە سپیە تەنکەکەیەوە کە لەناویایە بۆ «معدە» زۆر باشە. هەنار دەنکە وردەکەی ناوی سك ئەگرێ، واتە قەبزە.

## هەنجیر



هەنجیر میوەیەکی شیرین و بەتامە، دەنکی ورد وردی لەناوا هەیە کە ئەوەندە وردە لەگەڵ هەنجیرەکەدا ئەخورێ، خۆیشی دوو جۆرە؛ سوورکارو سپی، وشکیش ئەکرێتەوە، دارەکەی لە وڵاتێکا کە زستانی سەخت نەبێ ئەبێ، گەڵاکەی گەورەو داقەڵشاوی تێدا هەیە، جۆرە هەنجیرێکیتر هەیە هەنجیری هندی پێ ئەڵێن لە ساقەکەیەوە شیرەیەکی سپی دەرئەکا کە هەوا لێی دا ئەمەیێت ئەو شیرەیە لەدروستکردنی «کاوچووك»دا بەکاری دێنن.

هەنجیر لەگەلێ شوێنی وڵاتی کوردەواریش ئەبێ، هەنجیری وا هەیە هەر لەو وڵاتی کوردەوارییە پڕ چنگێك ئەبێ بەتایبەتی هەنجیری بادار کە نوخشەیەو پێ ئەگا.

کە بتەوێ بینێژی لەناو خوێدا ڕۆژێك داینێ لە پاشان بیخەرە ژێر شیاکەی گاوەو ئەمجا بینێژە، هەنجیری ئەو دارە زۆر بەتام ئەبێ. ئەگەر بە ئاوی زەیتوون دارەکەی جارێك ئاو بدرێ هەنجیری ئەو دارە هەڵناوەرێ. ئەگەر گەڵای دارێکی هەنجیر ئاوی گەرمی پیا بکرێ هەموو دارەکە وشك ئەبێ. یەکێ ڕوتەیل پێوە بدا لە داری هەنجیری پیا بێنن چاك ئەبێتەوە وەیا بیکەنە ئاو و ئاوەکەی بخواتەوە. یەکێ میزە چۆرتێکی هەبێ وەیا قۆڕ بێ دووکەڵی داری هەنجیر بچێ بەسەریا میزڵدان و گونی دێتە ژان. داری هەنجیر شیرەیەکی سپی لێ دەرئەچێ ئەو شیرەیە بتکێنرێتە سەر شوێنی پێوەدانی مارو دووپشك و شتە ژارەکەی ئیتر بڵاو نابێتەوە بەلەش دا..

یەکێ ددانی کرمێ بێ لقی داری هەنجیر پێش ئەوە گەڵا بکا بگوشێ، ئەو ئاوەی کە لێوە دێت بیخاتە سەر دانەکەی کەڵکێکی زۆری هەیە بۆی. خۆڵەمێشی داری هەنجیر

بپژێنرێ بەسەر باخدا هەچ کرمێك هەبێ لەبەری باخەکەدا هەمووی ئەکوژێ. یەکێ سەگ گەزتبێتی بەتایبەتی سەگی هار گەلای داری هەنجیر بە تەڕی لەگەڵ نەگەیشتووی ئەو دارەدا ـ واتە کاڵ ـ پێکەوە بیکوتێ و بیخاتە سەری چاك ئەبێتەوە.. گەلای داری هەنجیر بیگوشی و ئاوەکەی بدەی لەخاڵ لای ئەبا... هەنجیر خواردنی ژانی مایەسیری و جومگە ناهێڵێ، دیارە دەوامکردن لەسەری. هەنجیری کاڵ بنرێ لەو خاڵە ڕەشە تەبیعیانە کە لە لەش دایەو لە بالووك نایانهێڵێ. دەوامکردن لەسەر هەنجیرخواردن ڕەنگی ئینسان جوان ئەکاو قەڵەوی ئەکاتەوە، هەروەها بۆ فێداریش کە بیخوا بۆی باشە، جا بە تەڕی بێ یا بە وشکی. شیری هەنجیر بهێنرێ بە دملا ئەیگەیەنێ، بتکێنرێتە سەر بالووك لای ئەبا، بکرێتە سەر برین گۆشتە خراپەکەی لائەباو پاکی ئەکاتەوە، هەروەها لەگەڵ هەنگویندا تێکلاو بکرێ بۆ پێوەدانی دووپشك باشە، دووکەڵی هەنجیرو دارەکەی مێشوولەو شتە ئەتارێنێ...



## یاسەمین

یاسەمین خۆی لە بنەڕەتا گوڵە؛ گوڵێکی بۆنخۆشی سپی یا زەرد یا شینە، هەندێ جاری وا هەیە لە هەندە شوێنێکا قەفەکەی وا ئەستوور ئەبێ وەکوو داری لێ دێت، جا بەو بۆنەوە لە ڕیزی دارا باس کرا، بەری ئەم دارە گوڵەکەیەتی.

گوڵی یاسەمین چ بە تەڕی چ بە وشکی پەڵەی سەر دەموچاو لائەبا. زۆر بۆنکردنی گوڵی یاسەمین زەردوویی لە دەموچاودا پەیدا ئەکا بەڵام سەرێشەیەك کە بەڵغەمی لەگەلا بێت لای ئەبا.

گوڵی یاسەمین بۆ یەکێ کە دەمی لار بووبێ، وەیا ئیفلیج بووبێ وەیا کەژۆك - عرق النساء - ی هەبێ بۆی باشە... ڕۆنی ئەم یاسەمینە بۆ میزگیران باشەو لای ئەبا...

◈◇◈

# ڕووەك (شیناوەرد)

## باینجان



باینجان لە خواردەمەنییەکە کە ئەچێنرێت لـە ڕەسـەنی ڕووەك، فەساڵەکەی دروشـت و درێژ و ڕەنگی وەنەوشەییییە، توێکڵ و گۆشت و ناوکی هەیە، ئەکرێ بەچێشت لە پاش ئەوە کە توێکڵەکەی لێ ئەکرێتەوە، ڕەگی تاڵی هەیە ئەبێ لەپاش قاش‌کردنی خوێ پێوە بکرێ بۆ ئەوە ئەو زەرداوە تاڵییەی بڕوا، وشکیش ئەکرێتەوە.

خواردنی باینجان خەوبینینی ناخۆش دێنێت و «معدە» هەڵئەشوێنێ بەسەر یەکا، باینجان کەرت بکرێ و لەسێیەردا وشك بکرێتەوە لەگەڵ پیوی گادا بکوترێ، ئەو کچەی کە تازە مەمکی کردووە بیهێنێ بەسەری مەمکیا، مەمکی هەر قوت ئەبێ و شۆڕ نابێتەوە. خواردنی باینجان سەودا دێنێت، پێست ڕەش ئەکاتەوە، ڕوومەت زەرد ئەکا، سەرێشە پەیدا ئەکا، گـول و شێرپەنجە پەیدا ئەکا، دیارە ئەمانە کـە زۆر دەوام بکا لەسەر خواردنەکەی. ئەگەر بتەوێ باینجان ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە لەپیوی تواوە هەڵکێشرێ ئەمێنێتەوە.

## بامیە



بامیـە تەڕەیەکـە ئەچێنرێ، درێژکارو کووز کووزە، کە بگات ڕەنگی سەوزە، ناوەکەی تۆی ورد وردی تێدایە، بڕکەکەی زۆر ئەگرێ، ئەکرێ بەچێشت، قنچکەکـەی ئەکـرێ، وشـکیش

ئەکرێتەوە، خواردنی بامیە زیانی نییە، سك ڕەوان ئەکا بەڵام نەك بەچوون، مێژووی پەیدابوونی لە کوردەواریدا ناگاتە سەد ساڵ، بامیە ئەوەی هەیە بەبێ تەماتە لێ نانرێ، ئەگەر لێش بنرێ ئەو تامەی نییە..

## پاقلە



پاقلە بەری گیایەکە کە ئەخورێ، ئەم بەرە بە ڕیز لەناو توێکڵێکایە، کە پێ گەیشت سەوزە، ئەکرێ بەچێشت و خۆیشی بەتەنیا ئەکوڵێنرێ و ئەخورێ. کە مانگ لە چواردەو پانزەو ئەوانەدا پڕ بووەوە ئەویش گوڵ ئەکا، گەڵاکەی ئەگەر بقرتێنرێ وەکوو خوێ لێ دێتەوە، سەیرکردنی گوڵەکەی خەم و خەفەت دێنێ.

پاقلە ئەگەر لەناو ئاوەنێکی قەڵاییدا بکوترێ و لەبەر هەتاو پاشان دابنرێ ئەبێ بە خەنەیەکی جوان. خواردنەوەی ئاوەکەی تاریکایی لە چاوا پەیدا ئەکاو خەوی ناخۆش دێنێ. زۆر خواردنی پاقلە ئەقڵ تێك ئەدا.. یەکێ سیری خواردبێ پاقلە بخوا بۆنەکەی ناهێڵێ. پاقلە بکرێ بەدوو کەرتەوەو بنرێتە سەر ئەو شوێنە کە خوێنی ناوەستێتەوە خوێنەکەی ئەوەستێتەوە. ئەگەر مریشکی هێلکەکەر بیخوا لەهێلکە ئەوەستێتەوە. ئەگەر بنەنگڵی مناڵ توێکڵی پاقلەی لێ بنێن موو دەرناکا.. خواردنی پاقلە بەتوێکڵەوە ڕەنگ و ڕوو جوان ئەکا.

## پەتاتە



پەتاتە کە پێی ئەڵێن «سێف زەمینی»ش، گیاکەی لەڕەسەنی گیایە نەوەك دار، بڕکێکی قایمی هەیە، ئەچێنرێ، خودی پەتاتەکە دانە دانەیەو بەری ئەو بڕکەیە، دانەکان هەیە لە هێلکەیەك گەورەتر و بچووکتر. پەتاتە لەوانەیە

وەکوو گەنم و جۆ خواردنێکی دڵگیر بێ، ئەکوڵێنرێ و ئەکرێ بەچێشتیش، کە برژێنرا مادە بەهێزەکەی تیا ئەمێنێ بەڵام کە کوڵێنرا تیایا نامێنێ. داهاتنەکەی لەوڵاتی کوردەواریدا لە سەدو پەنجا ساڵ زیاتر تێپەڕ ناکا، لەگەڵێ شوێنا هەیە. یەکێ تووشی دڵێشەو دڵەکزەو نەساغی گورچیلە بووبێ خواردنی پەتاتە بەکوڵاوی وەیا بەبرژاوی بەڵام زیاتر بە برژاوی بۆی باشە، ئەوەندە هەیە زۆر خواردنی ئینسان نارەحەت ئەکاو وەکوو بڵێیت بای پێ ئەکا. کەم خواردنەکەی زۆر بە کەڵکە. وڵات هەتا فێنکتر بێ پەتاتەکەی بەهێزتر ئەبێ.

## پیاز



پیاز یەکێکە لەو تەڕانە کە زۆر ئەخورێ و کەڵکی زۆرە، بەتۆو ئەچێنرێ، سەلکەکەی لەناو زەویدایە، گەڵاکەی و سەلکەکەی هەردووکی ئەخورێ، بەکاڵی و بەکوڵاویش، بە کاڵی کەڵکی زۆرترە تا بە کوڵاوی، شت هەزم ئەکاو بۆ بەهێزی شەهوەتیش دەرمانە، خواردنی پیاز هاتووچۆ ئەکا بە ئینسان بۆ سەر ئاودەست، خۆیشی دوو جۆرە، سپی و سوور، سوورەکەی تیژترە، بەڵام لە هەردووکیانا پاش خواردنەکەی بۆنێکی نەختێ ناخۆشی هەیە.

پیاز سەلکەکەی تۆویەتی بۆ چاندن، ئەگەر توێکڵی بکرێتەوەو ئەمجا بینێژی پیازێکی جوانی لێ دێتە بەرهەم، هەتا زۆرتر بچێ بە ئەرزدا بەهێزتر ئەبێ.

ئاوی پیاز لەگەڵ هەنگوین تێکڵاو بکرێ و بهێنرێ بەچاودا چاو تیژ ئەکاو ئەگەر بێ‌هێزی هەبێ نایهێڵێ. پیازخواردن ترسی کارکردنی زەهر ناهێڵێ، ژارەکە هەر ژارێك بێت.

ئەگەر یەکێ بیەوێ بۆنی پیاز عاجزی نەکاو بۆنی نەمێنێ بیهێنێ پێش ئەوە کە پاکی کا چەقۆکەی پیاکاو وازی لێ بێنێ هەر بەو جۆرە تا بەینێك، پاشان پاکی کاو کەرتی کا، ئیتر نە بۆنەکەی عاجزی ئەکا وەنە ئاویش لە چاوی دێت. خواردنی پیاز خوێن ڕائەکێشێ بۆ دەموچاوو ڕوومەتی گەش و سوور ئەبێت.

پیازخواردن دەفعی زیانی ئاو ئەکاو یەکێکیش سەگی هار گرتبووی پیازی پیا بهێنێ زیانی ئەوەش ناهێڵێ. لە وڵاتەکانی گەرمەسێردا پیازخواردن نایەڵێ بای سەمووم کاری تێ بکا. ئاوی پیاز بکرێتە چاو، چاو ڕووناك ئەکاتەوەو نایەڵێ ئاویشی لێ بێت. تۆوی پیاز بهێنرێ بەچاوا تانەو سپیایەتییەك کە بکەوێتە سەری لای ئەبا.. هەروەها بۆ ئەو پەڵە سپیانە کە ئەکەونە سەر لەش و بەڵەکیش نین باشە.. یەکێ مووەڕێزی هەبوو (داءالثعلب) تۆوی پیازی پیا بهێنێ نایمێنێ. تۆی پیاز لەگەڵ خۆیدا بدرێ لە بالووك لای ئەبا.



## تەرخوون

تەرخوون تەرەیەکە لە ڕەسەنی کەرەوز و ئەوانە، بۆنی خۆشە، بەکاڵی ئەخورێ و ئەکرێتە ناو چێشتەوە.. تەرخوون کە بیجویت چەشە لەدەما ناهێڵێت هەر دەرمانێکی تاڵ بخۆی ئیتر بەخۆت نازانی.. خواردنەکەی کەروێشە پەیدا ئەکاو هێزی شەهوەت کەم ئەکاتەوە.

تەرخوونی کێوی ژانی ددان ئەشکێنێ. تەرخوون لەگەڵ سرکەدا بکوڵێنرێ و بکرێتە دەم ئەو ددانە کە لەقن توندیان ئەکاتەوە. یەکێ دووپشك و شتە کە پێوە بدا تەرخوون بجوون و بیخەنە سەری چاکی ئەکاتەوەو ژانی ناهێڵێ.



## تەماتە

تەماتە کە «تۆماتێز»یشی پێ ئەڵێن، ڕووەکێکە ئەکشێ و تەرزی هەیەو گەڵاکەی وردی لەلەکراوە. بەرەکەی کە تەماتەکەیە بە ئەندازەی سێوێك و زێتریش ئەبێ، ڕەنگەکەی سوور سوورە، گۆشتن و ئاودارە، دەنکی ورد وردیلەتاوا هەیە، سەرەتا تۆو پاشان بە شەتڵ ئەنێژرێ، بەری زۆر ئەدا، پایزانیش دێتەوە بەر، تەماتە

بەکاڵی، بە برژاوی وە بە چێشت ئەخورێ، وشك ئەکرێتەوە، دۆشاوی لێ ئەگیرێ، تەماتە لە تەبیعەتی ڕۆندایە لەگەڵ هەموو شتێك ئەخورێ، مادەی هێزی خواردەمەنی تێدا زۆرە، بۆ یەکێ نەخۆشی گورچیلەی هەبێ باش نییە، لەگەڵێ شوێنا سەرمایەی تەڕەکاڵی هاوینەیە، بامیە بەبێ تەماتە وەکوو ژنی بێمێرد وایە، ماوەی پەیدابوونی لە کوردستان لە سەدو پەنجا ساڵ زیاتر نییە، لە ئەورووپاوە هاتووە.



## تووتن

تووتن کە «تەماکۆ»یشی پێ ئەڵێن گیایەکە لەپێشا بە تۆو ئەچێنرێ و پاشان بەشەتڵ، گەڵایەکی پانی هەیە، پاش ئەوە کە هاتە سەرەی پێگەیشتن گەڵا گەڵا ئەیکەنەوە وشك ئەکرێتەوە؛ بە گەڵێ جۆر وشك ئەکرێتەوە؛ ئەکرێ بەشووڵی دارەوە، هەروا لەسەر زەوی هەڵئەخرێ، ئەخرێتە ناو چاڵەوە و سەرەکەی وەکوو کەپر لێ ئەکەن. کە پێگەیشت ڕەنگی زەرد هەڵئەگەڕێ، ئەوانەی لە سێبەردا وشك بکرێتەوە باشترە، تووتن دوو جۆری هەیە؛ تەوەس، لاری، لارییەکەش ڕەشۆکی و سەمسۆنی هەیە. ئەم تووتنە بۆ کێشان ئەیکێشن، بەسەبیل، بە جگەرە، بە پەڕە سیغار، بە پاکەت، مادەیەکی زەهری تێدا هەیە بە نیکۆتین ناو ئەبرێ. ئەسڵی گەڵاکەشی پانەو درێژکار، لە زۆرتر لە ناوچەکانی دنیادا هەیە، زۆرتر لە مەردمی دنیا تووشی کێشانی بووە، سەرمایەیەکی گەورەی تەڕەکاڵ و بازرگانییە لە کوردستانا. لەسەر قسەی «مەلا ئەبوبکری مصنف» لە کتێبی «الوضوح»دا لە سەدەی نۆیەمی هیجری لە مەریوانی کوردستاندا چێنراوەو هەبووە.

جۆرە تووتنێکی‌تر هەیە پێ ئەڵێن تەماکۆی قلیاناوی، وەیا تەماکۆی نێرگەلە، ئەمەش هەر تۆو شەتڵە، ئەیخەنە سەر سەرە قلیان و پشکۆ ئەخەنە سەری و بەنێرگەلە ئەیکێشن.

نێرگەلەش یەکێکە لەشتە سەیرەکان، بۆ نێرگەلە سەیری ژمارەی گۆڤاری گەلاوێژ بکە کە شتێکمان لەسەری فەرمووە!



## توور

توور کە پێشی ئەڵێن «ترپ» یەکێکە لەو گیایانە کە ئەچێنرێ و بۆ خواردن کەڵکی لێ وەرئەگیرێ، سەلکی هەیە لەبن عەرزدا گەورە ئەبێ، هی وای تیا هەڵئەکەوێ هۆقەیەك ئەبێ، ئەم سەلکانە سپی ئەبن و سووریش ئەبن، گەڵاکەشی هەر ئەخورێ، گەڵاو سەلك هەر بە کاڵی ئەخورێن، تەبیعەتی توور توند و تیژە بەڵام شیرنیشی تیا پەیدا ئەبێ، قورقێنەیەکی ناخۆشی هەیە، وا دەرئەکەوێ ئەم بۆنە کە لە قورقێنەکەدا هەیە لەبەر خودی توورەکە نییە بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە توور لەناو سکا ئەگەرێ بەشوێن ئەو شوێنەدا کە خڵتی تەبیعەت ساردی لێیە، کە دۆزیەوەو کەوتە ناوی تێکی هەڵئەشێوێنێ، بۆنەکە هی ئەو تێك هەڵشێوانەیە.

توور لە دوای سیر بخورێ بۆنی سیرەکە نایەڵێ. دەوامکردن لەسەر خواردنی توور مایە ـ معدە ـ پاك ئەکاتەوە.

ژنی زەیسان توور بخوا شیری زیاد ئەبێ. پیاو بیخوا تێگەیشتنی زیاد ئەبێ بەڵام دەنگ ئەخاو گڕی ئەکا توێکڵی توور لەسەر دووپشك دانێ ئەیکوژێ. یەکێ تووری خواردبوو پاشان دووپشك پێوەدا زیانی پێ ناگات. هەروەها خواردنی توور بۆ یەکێ مووەڕێزەی بێ، وەیا لەشی توێك بخا باشە.. لەگەڵ ئەمانەشا توورخواردن ئەبێتە هۆی پەیدابوونی ئەسپێ لە لەشا، زیان بەسەر و ددان و چاو ئەگەیەنێ.. ئەگەر یەکێ لەکەو شتە لەسەر ڕوومەتی وەیا لە شوێنێکی‌تری هەبوو توورو هەنگوین تێکڵاو کاو بینێتە سەری چاك ئەبێتەوە. توور بخرێتە ناو شەرابەوە خراپی ئەکا. بەئاوی توور ئەو لەکە سپیانە کە لەسەر ڕوومەت پەیدا ئەبن و بەڵەکیش نییە بهەنووری چاکی ئەکاتەوە. یەکێ زەردووی لە ڕوومەتیا هەبێ ئاوی توور بگرێ و پێنج ڕۆژ لەسەر یەك بیخواتەوە بۆی باشەو نامێنێ. هەروەها ئەگەر ئەو ئاوە بهێنرێ بەچاودا چاو تیژ ئەکاو ئەگەر سپیایەتیشی لەسەرەوە بێ لای ئەبا.. توێکڵی توور وشك بکرێتەوەو بیهاڕنەوەو بیهێنن بەچاودا تیژی ئەکاتەوە. تۆوی توور هێزی شەهوەت زیاد ئەکاو بەکەڵکیشە بۆ هەموو جۆرە زەهرێك... خواردنی گەڵای توور بۆ ئافرەت شیری پێ زیاد ئەکا... توور شت هەزم ئەکا.

## تەڕەتیزە



تەڕەتیزەش یەکێکە لەو گیایانە کە بە کاڵی ئەخورێت. تامێکی توندو تیژی هەیە، پەلکەکانی باریك و وردە وەکوو ڕیشی بزن وایە، بەتۆو ئەچێنرێ هەر ئەیدرویێتەوەو هەڵئەداتەوە. لەگەڵ خواردەمەنی چەوردا ئەخورێ بۆ هەزمکردن، قازانجی هەیە بۆ ناو زك، ئاوی تەڕەتیزە بدرێ لەسەودا بۆی باشە..

## جۆ



جۆ دانەوێڵەیەکی هەرە بەنرخە لە دوای گەنم بۆ بژێوی، ئەدرێ بە ماڵات و ئەسپ، دەنکەکەی درێژ کۆڵەیە، ئەچێنرێت، وڵاتی کوردەواری شوێنیەتی.

ئاوی جۆ بۆ میز زۆرکردن زۆر بەکەڵکە. ئەگەر ترێ لە مێوەکەی بکەیتەوەو بیخەنە ناو جۆوە ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە، هەر جارکە دەری بێنی وا ئەزانی ئێستە لەمێوەکە کراوەتەوە... ئەو خاڵە ڕەش و پەڵانە کە لەسەر ڕوومەت پەیدا ئەبێ ئەگەر بەجۆ بهەنورێ لای ئەبا... جۆ لەگەڵ سرکەدا بکوڵێنرێ و بنرێ لەگەڕی بۆی باشە..

قسەیەکی زۆر دوور لەبارەی جۆوە: ئەڵێن جۆ سەرەتا گەنم بووە، کە باوە ئادەم گوێلێکی دەست کەوت دایە حەوا وتی ئا بزانم ئەوە چییە؟ ئەویش هەندێکی لێ دایەو وتی ئەمە گەنمە ئەیچێنین بۆ خۆمان و وەچەکانمان. دایە حەوا وتی دەبا بیچێنم. باوە ئادەم وتی کچێ نەکەی عەدم ئەبێ بە دەست تۆ نابێ، وتی: دەسا وەڵڵا ئەیچێنم ئەمە چییە هەر شتێك من ئەیڵێم تۆ هەر ئەڵێی نابێ، تووڕە بوو بە گوێی باوە ئادەمی نەکرد گەنمەکەی پرژان بە زەوییەکەدا و لە پاشا کەڕووا بەجۆ دەرچوو!

ئەم مەسەلەیە وەکوو مەسەلەکەی مەلا محەمەدی تەوێڵەیی و ئایشۆکی ژنی وایە بەڵام بە پێچەوانە:

لەو دەشتی لای «بەشارەت»دا لە شارەزوور ئایشێ هەڵاتبوو لە مەلا محەمەد، مەلا محەمەدیش شوێنی کەوتبوو، حەسەن بەگی جاف بە ڕێگاکەدا ئەڕۆیشت، مەلا محەمەد لە دوورەوە بانگ ئەکا حەسەن بەگ مەیەڵا ئایش بڕوا. ئایشێش ئافرەتێکی بەشەرمی بەحەیای هەتا ئەوپەڕی بە ئەدەب و لەسەرخۆ بوو. کە گوێ لەقسەی مەلا محەمەد ئەبێ لە شەرما ڕائەوەستێ و مەلا محەمەدی مێردی ئەگاو هەردووکیان لەبەر دەمی حەسەن بەگا ڕائەوەستن، حەسەن بەگ پێی ئەڵێ دایکم بچۆرەوە لەگەڵی مێردتەو پیاوی چاکە، ئایشێ لەم قسەیە زۆر شەرمەزار ئەبێ لەڕووی هەڵنایە سەر بەرزەوەکا، هەروا سەر دائەخاو دەست ئەبا بۆ پووشێ لەسەر زەوییەکە و یاری بە پووشەکە ئەکاو لەبەر شەرم لە ڕووی هەڵنایە قسە بکا. کوتوپڕ لەو کاتەدا مەلا محەمەد چاوی پێ ئەکەوێ کەوا ئایشێ پووشێك بە دەستیەوەیە، چاوی سوور ئەبێتەوە و هاوار ئەکا: ئایشێ بۆ خاتری قورئان نەکەی، ئایشێ نەتکردبێ ئەو پووشە بشکێنی تەڵاقم ئەکەوێ، ئایشێ ئەو پووشە پێم ئەڵێ کە پێت بڵێم نەکەی بیشکێنی  ئەگینا تەڵاقی من ئەکەوێ! حەسەن بەگیش پێ ئەڵێ دایکم مەیشکێنەوەو لەگەڵی بچۆرەوە. بەڵام باش بوو لێرەدا ئایش وەکوو دایە حەوا تووڕە نەبوو پووشەکە بشکێنێتەوە ئەگینا تەڵاقی مەلا محەمەد و هەموومان ئەکەوت! تووڕەییەکەی دایە حەوا چووبوو بۆ مەلا محەمەدی کوڕی!.

## چەوەنەر



چەوەنەر کە «چۆنەر»یشی پێ ئەڵێن گیایەکە لە ڕەسەنی سلق و شێلم و ئەوانە، سەلکێکی ئەستوورو گۆشتنی هەیە، گەڵاکەی پان و زلە، سەلکەکەشی لەگەڵ زلیەکەیدا هی وای هەیە، خڕە، هی واش هەیە درێژکۆلەیە، ئەم چەوەنەرە لەسەر سێ جۆرە؛ جۆرێکیان ئەو چەوەنەرەیە کە ئێستا هەیە لە کوردەواری، ئەمە زل و شیرینە، دیارە سەلکەکە مەبەستە، ئەمەیان یان بە تەنیا ئەیکوڵێنن وەیا ئەیپیشێنن و پاشان ئەیخۆن، زۆر شیرین و تامدارە، هەروەها ئەیکەن بەچێشت و ئەیکەنە ناو

ئاشـەوە، ئەم جۆرەیان بە کاڵی ئەدرێ بە ماڵاتیش بۆ ئەوە چۆن بە جۆ بەهێز ئەبێ بەم چەوەنـەرەش بەهێـز ئەبـێ، کەڵکێك لە گـەڵای وەر ناگیرێ جگە لـەوە نەبێ کە ئەدرێ بـە حەیـوانات. جۆرێکیـتـریان پێـی ئەڵێن چەوەنەری فەرەنگی، ئەمەیان پێستەکەی و ناوەکەشی وەکوو ئەوەی یەکەم سوورە بەڵام وەکوو ئەویتر شیرین نییە تەنها بۆ هەندێ لـە خواردەمەنـی چێشـت بـە کار ئەهێنـرێ. جـۆری سێیەم چەوەنەری شـەکرە، ئەمەیان درێژکۆڵەیـە، لـە چاندنا زۆر ئەخرێتە ناو زەوییەوە، ناوەکەی سپییە، ئەمەیان لە شـەکر دروستکردندا بەکار ئەهێنرێ، لەوانەیە لە چواردە تا هەژدە لە سـەدا مادەی شـەکرەکەی تێدایە. ئەمانە هەموویان ئەچێنرێن شوێنیشیان فێنك بێ باشە.



## خاشخاش

خاشـخاش گیایەکـە بـە ئەنـدازەی وەیا لـە قـەباری بنـی گەنمـدا، گەڵاکـەی دروشـت و ڕۆخەکـەی وەکـوو لەلـە کرابـێ وایـە، گوڵێکـی هەیە سپییە، بەرێکی هەیە سـەوزکارە، لەناو ئەم بەرەدا دەنکی زۆر ورد هەیە کە ئەخورێ.

ڕۆنیشـی ئەگـرن، لـە پێسـتە کەشـی شـیرەی تـریاك وەرئەگیـرێ. بـە واتەیەکیـتـر ئـەم خاشخاشە سێ جۆرە؛ سپی، ڕەش، سوور، سپیەکە یەکێ کۆکەی بێ بیخوا بۆی باشە و بەڵغەمەکەشی هەڵئەکەنێ، لەگەڵ هەنگوینـدا بخورێ ئاوی مەنی زیاد ئەکا.

ڕەشـەکەیان یەکـێ بیخـوا خـەوی لـێ ئەخـا، ئـەو کەسـەی بیـەوێ بەشـەو نەنـوێ خاشخاشی ڕەش ببەستێ بە تەوێڵیەوە بۆ نەنووستنەکەی زۆر باشە.

جـۆری سێیەم کـە میسـری پێ ئەڵێـن و سوورەکەیانە ئاوەکەی کە بگیـرێ وەیا بڵێین شیرەکەی، ئەمـە هـەر تریاکێکـە بـۆ خـۆی، هەرکـەس هـەر ژان و دەردێکـی هەبـێ لەم جۆرەیان بـە ئەنـدازەی نیسـکێکی بخوا ژانەکـەی ئەشـکێ وە ئەگـەر پێشـیا بێنـێ هـەر باشـە بۆی. یەکێ سـەری ژان بکا، لەم جۆرەیان بهێنێ بەسـەریا ژانەکەی ئەشـکێ بەڵام تێگەیشتنی ناهێڵێ و وەکوو بڵێیت ئەیکا بە بێهۆش!..



## خەردەل

خەردەل گیایەکە بەرەکەی دەنکێکی ورد ورد و ڕەش کارە، تامێکی توند و تیژی هەیە ئەیسوونەوە لەگەڵ ئاو یا سرکەدا بۆ ئیشتیها سافی لەگەڵ خواردندا ئەیخۆن. بە گیاکەو بە بەرەکەشی هەر ئەڵێن خەردەل.

خەردەلە هەرە وردەکە بکەیتە ناو ئاوی ترێوە، ئەو ئاوە بیخەیتە سەر ئاگر قەت نایەتە کوڵ. ئەگەر خەردەل بخەیتە کونی مارەوە مارەکە ئەتۆپێ..

دووکەڵی خەردەل جڕوجانەوەر ئەکوژێ، هەروەها دووکەڵەکەی یەکێ سەری پیاگرێ سەرو شکڵی جوان ئەکاو بۆنی دەمیش خۆش ئەکا. خەردەلی دێمی بۆ سێبەرۆ، مووەڕێزە و بیرۆ باشە کە لێی بنێن. هەروەها بۆ ژانی جومگەو «عرق النسا»یش باشە، کە لە شوێنەکەی بنێن.. گوێچکە کە ژان بکا ئاوی خەردەلی تێ تکێنن ژانەکەی ناهێڵێ...

ئەگەر یەکێ لە ناشتا ئاوی خەردەل بخواتەوە زەینی تیژ ئەبێ و ئارەزووی چوونە لای ژنیشی زۆر ئەبێ.



## خەیار

خەیار کە «ئاروو»شی پێ ئەڵێن، لە سێرەی تەڕەدایەو لەگەڵ ترۆزیدا لە یەك ترۆمن، بەڵام ترۆزی وەکوو ئەو خۆش نییە، برکی خەیار وەکوو برکی کاڵەك و کوولەکەو شتە وایە، ئەکشێ بەسەر زەویدا و تەرزی لێ ئەبێتەوە، لە بەهاریشا ئەبێ و لە پایزیشا، بە کاڵی ئەخورێ و ئەکرێ بەچێشتیش، بە تۆو ئەچێنرێ.

ئەگەر یەکێ بیەوێ خەیارەکەی زوو پێ بگا بێنێ تۆوەکەی بکاتە ناو سواڵەت وەیا سوێنەیەکی قوڕینەوە، کە هەتاو گەرم ئەبێ بیداتە هەتاو، کە باران ئەبارێ بیداتە باران، کە ڕۆژ ئاوابوو بیباتەوە ژوورەوە، هەموو جار ئاوی لێ بپرژێنێ، کە زستان بەسەرچوو لە

سواڵەتەکە دەری بێنێ و لە ئەرزا بینێژێ، کە شین بوو و ڕوا کام لە گەڵاکانی درێژترە سەرەکەی بقرتێنێ، ئەو خەیارە کە بەو جۆرە هاتە بەرهەم پێش هەموو خەیارێك ئەکەوێ.. ئەڵێن یەکێ تای تیژی هەبێ خواردنی خەیار بۆی باشە، بەڵام من بڕوا ناکەم...

خەیارخواردن بۆ میز زۆرکردن باشە، بەڵام هەر خێرا تینوێتی دێنێ، چونکە ئەبێ بە سەفرا... تۆوی خەیار بکوترێ و بدرێ لە ڕوومەت، ڕوومەت جوان ئەکا...



## ڕازیانە

ڕازیانە گیایەکە وەکوو زیرە، ئەشچێنرێ و لە کێویشا ئەبێ، دەنکێکی وردی بۆنخۆشی هەیە، کورد لەسەر ڕازیانە پەندێکی هەیە ئەڵێ: «ماڵی پڕی بوو لە ڕازیانە بە دەردی دڵێشە مردن!».

ڕازیانە لە پزیشکیدا زۆر بەکار ئەهێنرێ. ڕازیانەی تەڕ شیر خەست ئەکا بۆ ئافرەتێ کە بیخوا، خوێنی حەیز ڕەوان ئەکاو میزیش زۆر بە ئینسان ئەکا، هەروەها ئەو کونە هەرە بچووکانەش کە لە پێستا هەن و پیان ئێژن «مسام» ئەیانکاتەوە و نایەڵێ چاوێکیش کە ئاوی لێ بێ ئاوەکەی لێ بێت.. خواردنی ڕازیانەی کێوی بۆ یەکێ بەردی هەبێ لە میزڵداندا ئەیتوێنێتەوە، یادی کۆن لائەبا، پێچ و با لە سکا بێ لای ئەبا و چاویش تیژ ئەکا... مار کە لەکون هاتە دەرەوە چاوی ئەخشێنێ بەرازیانەدا تیژ ئەبێتەوە...



## ڕەیحانە

ڕەیحانە گیایەکی بۆنخۆشە، گەڵاکەی ڕەشکار وەیا وەنەوشەییە، بۆنەکەی لەو دایە، هەندێکی سەوزکارە ئەمەیان لەگەڵ کەباب و شتەدا ئەیخۆن.

یەکێ هەڵامەتی بێ بۆنی ڕەیحانە بکا بۆی باشە... بەکارهێنانی ڕەیحانە بۆ مایەسیری زۆر بەکەڵکە. هەروەها یەکێ سەرەگێژەی هەبێ،

وەیا خوێنی لووتی زۆر بپژێ بۆنی ڕەیحانە بکا بۆی باشە... ئەگەر یەکێ بۆنی بنەنگڵی وەیا پێی ئەهات و چاری بۆ نەئەکرا تۆی ڕەیحانە بخاتە خوێنی حوشترەوە وە پیایا بێنێ بۆنەکەی نامێنێ و ڕزگاری ئەبێ لەدەستی...



## ڕێواس

ڕێواس ڕووەکێکە لە بەهارانا لە شوێنی کوێستان و زیاتر لە بەینی بەرددا دەرئەچێ، ساقەتەیەکی درێژی هەیەو سەرەکەی گوڵ ئەکا، گوڵەکەی دەنکێکی ورد وردە وەکوو تۆپز لە سەریەوەیە. ئەم ڕێواسە بەکاڵی ئەخورێ و مزرێکی مێخۆشە، تا گوڵی نەکردووە زۆر تەرچکە شاخەی دێ، کە گوڵی کرد پیر ئەبێ، توێکڵێکی تەنکی هەیە ئەگیرێتەوە، دەنك دەنك لەناو زەوییەکەدا دەرئەچێ و بەرز ئەبێتەوەو ئەمجا هەڵئەکەنرێ، ئەوەی کەوتۆتە ناو زەوییەکەوە وەکوو سوورو سپی وایە، ئەوەی لەزەویەکە دەرچوو ئەوەی خۆشترە و ئەخورێ، لە کوردستان زۆرە. کە تاعوون بڵاوبووەوە خواردنی ڕێواس بۆ کار نەکردنی ئەو تاعوونە زۆر باشە. ئاوی ڕێواس چاوی پێ بڕێژرێ چاو تیژ ئەکات. منداڵ وەیا گەورە ئاوڵە وەیا سوورێژە بگرێ ڕێواسی پێ بدرێ زۆر باشە بۆی.

یەکێ دڵی پێکابێت و بیەوێ بڕشێتەوە ڕێواس بخوا بۆی باشە و ئیتر نارشێتەوەو دڵ تێکەڵچوونەکەی نامێنێ.. خواردنی ڕێواس پووك و گۆشتی ددان توند ئەکاتەوە.



## زەعفەران

زەعفەران گیایەکە گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە گوڵەکەی وەکوو گوڵی لالەعەباسی وایە، بنەکەی کە ڕیشەکەیەتی وەکوو سەلکی پیاز وایە ئەکوترێ و ئاوەکەی ئەگیرێ، ئەو ئاوەی

شیرەکەیەتی وەکوو شیر وایە، گەلێ جار ئەو سەلکەی وشك ئەکرێتەوەو ئەکوترێ وەکوو ئاردی لێ دێ ئەخورێ.

ئەو زەعفەرانەی کە لە ناو خەڵکا باوەو ئەیناسن برێتییە لەو تاڵ و هەودایانەی کە لەناو گوڵەکەدایە، ئەم گوڵانە لەپاش ئەوە کە بڕکەکان کرانەوە هەوداکانی جیا ئەکەنەوەو زەعفەرانەکە ئەمەیە، چەشنی پەیدابوونەکەی ئەبێ سەلکەکەی لە وڵاتیکا کە زۆر سەرما نەبێ بچێنن، گەلێ جاریش سەلکەکەی وەکوو سەلکی نەرگس وایە، کە چێنرا تا هەشت ساڵ ڕیشەکەی لە ئەرزا ئەمێنێ و هەموو ساڵێك گوڵ ئەکا.

زەعفەران بۆ ڕەنگ و ڕێس و بۆ بۆنخۆشکردنی خواردەمەنی کە تێ ئەکەن بەکار ئەهێنرێ. ئەگەر لەبەر ڕووناکی وەیا هەوادا دابنرێ نە تامی ئەمێنی نە بۆنی، بەڵکوو ئەبێ بکرێتە ناو شتێکی سەربەستراوەوە بۆ ئەوە ئەوانە لێی نەدا...

تۆی زەعفەران خەو لە ئینسان ئەخا، ڕەنگ و ڕوو جوان ئەکا، چاو تیژ ئەکاتەوە، ئاوی چاو ناهێڵێ، میز زۆر بە ئینسان ئەکا، شەهوەت زۆر ئەکا، دڵ بەهێز ئەکا، ئینسان ئەخاتە پێکەنین و کەیفخۆشی ئەکا، دیارە ئەمانە ئەبێ هەر یەکە لە شوێنی خۆیانا بەکار بهێنرێ، واتە ئەگەر بۆ ڕوومەت بێ لێ بدرێ، ئەوەندە هەیە لە کاتێکا کە بخورێ ئەبێ بە ئەندازە بێ، ئەندازەکەی نابێ لە سێ چارەکە مسقاڵ زیاتر بێ، ئەگەر زیاتر بوو ئەیکوژێ.. ئەوماڵەی کە زەعفەرانی تیا بێ مارمێلکەی ماڵی ڕووی تێ ناکا... ئەگەر ئافرەتێك لەکاتی منداڵبووندا منداڵەکەی لێ نەئەبووەوە، وەیا لفەکەی نەئەهات، دە مسقاڵ زەعفەران بخاتە دەستیەوە زوو ڕزگاری ئەبێ و منداڵەکەی دێت..



## زیره

زیرە تۆی گیایەکە، خۆی وردەو لەوێنەی کونجیدایە، زۆر بۆنخۆشە، ئەیکەنە ناو خۆراکەوە بۆ بۆنخۆش‌کردنی، بە تایبەتی ئەیکەن بەسەر پڵاودا، لە ناو کوردەواریدا خواردنی باوی هەیە.

ئەگەر یەکێ بیەوێ کۆتر هۆگری شوێنێك بێ و بەجێی نەیەڵێ، بێنێ پێش ئەوە

کۆترەکان باڵ بگرنەوە و بچن بۆ گەڕان وەیا چینەکردن زیرە بپرژێنیێ بەو شوێنەدا ئیتر ئەو کۆترانە ئەو شوێنە بەجێ نایەڵن... مێروولە لە بۆنی زیرە هەڵدێت.. ئەگەر دەموچاو بە ئاوی زیرە بشورێت دەموچاوت جوان ئەبێ. زۆر خواردنی زیرە ڕەنگ و ڕوو زەرد ئەکا.

یەکێ خوێنی لووتی بەربوو و نەئەوەستایەوە، زیرە لەگەڵ سرکەدا بکوتێ و بۆنی بکا خوێنەکەی ئەوەستێتەوە. زیرە ئاوەکەی بگیرێ و بهێنرێ بەچاودا چاو ڕوون ئەکاتەوە.

زیرەو خوێ بە ئەندازەی یەك لێیان وەرگیرێت و پێکەوە بکوترێن و بکرێن بە حەب، پاشان بخرێتە ناو ئاردی سپیەوە، ئەو ئاردە قەت ئەسپێ و شتە تێنادا بە پوختی ئەمێنێتەوە.



## ژاڵە

ژاڵە نە لە ڕەسەنی دارە نە لە هی گیا، دەرئەچێ بەرزە وەکوو دار وایە کەچی داریش نییە، تەنەو ساقێکی وەنەبێ قایمی هەبێ، لە ساقەتەدا وەکوو دەوەن وایە، گوڵێکی زلی هەیە پڕ چنگی سوورە، هی سپیشی هەیە، گەڵاکەی درێژکارە وەکوو هی داری بی بەڵام ئەم گەورەترو زلتر، گوڵەکەی جگە لەوە کە بۆنی نییە ئەوەندەش تاڵە ئەڵێی زەهرە، زۆرتر لەناو کۆنە چەمی دەشتەکیدا ئەڕوێ، ئەوەی، کە لەگوێی ڕووبارەکانا ئەڕوێ لای ژوورووی لقەکەی ئەستوورترە لەهی لای خوارەوەی، درکێکی نهێنیشی هەیە، بەرێکی ڕەقیشی هەیە لە ناوەوەی شتێکی تێدایە وەکوو لۆکە، جۆرێکی تریش هەیە دێمەو لەدەشتەوە ئەڕوێ لقەکەی بەسەر زەویدا پان ئەبێتەوە.

گەڵای ژاڵە کێچ لێی هەڵدێت، هەر حەیوانێك بیخوا ئەیکوژێ. ژاڵە بێنە بیکوڵێنەو ئەو ئاوەی بڕشێنە بەناو ماڵدا کێچ و مۆرانەو ئەو شتانە کە لەوێدا هەبێ هەمووی ئەکوژێ. هەسان ژاڵەی پیا بێنەو پاشان چەقۆی پێ تیژکە ئەو چەقۆیە زۆر زۆر تیژ ئەبێ و درەنگ کول ئەبێ. ئەگەر لەناو ماڵدا چاڵێك هەڵکەنن ژاڵەی تێخەن هەروا هەرچێ کێچە لەوێدا کۆ ئەبێتەوە، واتە لەو ماڵەدا. مشك و شەمشەمەکوێرەش لێی هەڵدێن.



## سپێناخ

سپێناخ گیایەکی وردە تۆی هەیە، دەشتیی هەیەو ماڵیی هەیە، واتە ئەچێنرێ و ئەدروێتەوەو ئەکرێ بەچێشت.

سپێناخ بۆ کۆکە و بۆ خیزەی سینگ و بۆ ژانی پشتێك لە حەرارەتەوە بێ و بۆ خوێن زۆریلە لەشا باشە، بەڵام بۆ شت هەزمکردن باش نییە، واتە سووئی هەزمی تێدا هەیە. تۆی سپێناخ بۆ تاو لەرز باشە. هەروەها تۆوی سپێناخ بۆ دڵێشە باشە بەڵام ئەبێ ئەندازەی هەبێ، ئەبێ سێ چارەکە مسقاڵێك بێ..



## سلّق

سلّق گیایەکە بە بنجێکی گەورە لە زەوی دەرئەچێ، گەڵایەکی گەورەو درێژی هەیە، لە ناوەڕاستی گەڵاکە بە درێژاییەکە شادەمارێکە پەلکەکە لەو ئەبێتەوە، ئەم گەڵای سلّقە بۆ کاروباری چێشت شوێنی گەڵامێو ئەگرێتەوە، بە تایبەتی ئەکرێ بە یاپراخ وەکوو گەڵامێو، لە وڵاتی کوردەواری لە گەلێ لا باوی هەیە بۆ چاندن و بەخێوکردنی. سلّق بە تۆو ئەچێنرێ.

ئەگەر سلّق بە شیاکەی گا کووتی زەوییەکەی بکرێ سلّقەکە بەهێز و تامیشی خۆش ئەبێ. سلّق بیگوشی و ئاوەکەی بدەی لە بالووك لای ئەبا. هەروەها ئەسپێ کەم ئەکا.

ئەگەر سەر بەو ئاوە بشۆی کرێش لائەبا لەسەرا، مووەکانی کۆ ئەکاتەوە، دیسان ئەو پەڵەڕەشانە کە لە ڕوومەتا پەیدا ئەبێ و بەڵەکیش نییە ئەوانەش هەر لائەبا.



## سۆسەن

سۆسەن گیایەکە لە ڕەسەنی زەنبەق، گەڵاکەی باریك و بەرزە، گوڵێکی جوان و بۆنخۆشی هەیە، گوڵەکانی سپی، زەرد، شین ئەبن. بەتایبەتی سپیەکەیان زۆر جوانە.

بۆنکردنی گوڵی سۆسەن خەو ئەهێنێ. ئەو پەڵەڕەشانە کە لە ڕوومەتا پەیدا ئەبن و بەڵەکیش نییە ئەگەر سۆسەنی پیا بهێنی لای ئەبا. یەکێ ژانەسەری هەبوو سۆسەن لەگەڵ سرکەدا تێکڵاوی کاو لێی بنێ لای ئەباو ژانەکەی نامێنێ. مێشوولەو شتە بدا بە ئینسانەوە سۆسەنی پیا بهێنێ ژان و ژاری ناهێڵێ.

یەکێ بیرۆ وەیا گەڕی هەبێ سۆسەن لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو کاو لێیان بنێ لای ئەبا.

سۆسەن بهێنرێ بە دەموچاودا جوانی ئەکا. ئەگەر گوڵی سۆسەن بخەیتە ناو حاجەتێکی تازەوەو سەری ببەستی بەجۆرێ کە هەوا لێی نەدا بە درێژایی ساڵ بە جوانی و تازەیی ئەمێنێتەوە. یەکێ کونە لووتی بۆنی لێ بێ ڕۆنی سۆسەنی لێدا بۆنەکەی نامێنێ.

## سیاوڵە



سیاوڵە کە «ڕەشکە»شی پێ ئەڵێن، گیاکەی گیایەکە وەکوو ڕازیانە و خۆیشی هەر وەکوو ئەو وایە، دانەکەی ڕەش و وردو بۆنێکی توندی هەیە، پەلکەکەی باریکە، گوڵەکەی زەردو وەنەوشەییە، بۆ کۆکە و سنگێشەو بووردنەوە و ئیسقاو لابردنی کرم لە «معدە»دا بۆ ئەمانە هەموو باشە.

سیاوڵە بکەیتە ناو ئاوو بیکوڵێنی، ئەو ئاوە بپرژێنی بە ناو ماڵدا هەرچی کێچی ئەو ماڵەیە هەمووی ئەکوژێ. ڕەشکە لەگەڵ سابوون پێکەوە بکوتن بیدەن لە دەموچاو وردە پەڵەی ڕەشی سەر دەموچاو ئەگەر هەبێ لای ئەبا. سیاوڵە بدرێ لە بالووك لای ئەبا.

جۆرە خاڵێکی ڕەش لە ڕوومەتا پەیدا ئەبێ و مووی بە دەورەوە دەرئەچێ ئەگەر ڕەشکە بدەن لەو جۆرە خاڵە نامێنێ و لای ئەبا. هەروەها یەکێ «بەهەق»ی هەبێ وەیا بەڵەکی هەبێ سیاوڵەی پیا بهێنێ لایان ئەبا.

«بەهەق» پەڵە پەڵەی سپیەتیە کە لە لەشا پەیدا ئەبێ و بەڵەکی نییە شتێکی‌ترە. یەکێ هەڵامەتی هەبێ بۆنی سیاوڵە بکاو بیهێنێ بە لووتیا هەڵامەتەکەی نامێنێ. ئەگەر یەکێ ددانی ژان بکا سیاوڵە بکوڵێنێ - ئەگەر لەگەڵ داری سنەوبەریشا بێ باشترە - پاشان بیدا بە دەمیا ژانی دانەکەی ئەشکێ. جرۆجانەوەر لە دووکەڵی ڕەشکە هەڵدێن. سیاوڵە لەناو کوردەواریدا ئەیکەن بە ڕووی کولێرەوە، بەڵام ئەڵێن زۆر خواردنەکەی لەوانەیە ئینسان بکوژێ.

## سیر



سیر سەلکی گیایەکە لەوێنەی پیازدا، تام و بۆنێکی توند و تیژی هەیە، بە کاڵی و بە کوڵاوی ئەخورێ، واتە ئەکرێتە ناو چێشت، ئەکرێتە تورشیش، کەرەستەی هازمە بۆن بکا، سیر بەربەستی ئەو بۆنە ئەکا، فشاری خوێن دێنێتە خوارەوە، هێزی چوونە لای ژن زیاد ئەکا، بۆ سك‌چوون و سیل زۆر باشە.

ئەڵێن ئەگەر سیر لە پانزەی دوایی مانگدا، واتە لەو سەردەمانەدا کە مانگ لە کەم بوونەوەدایە سیر بنێژرێ بەری ئەو سیرە بۆنی نایەت. چاوێ کە ژان بکا سیر بجوون و بیخەنە سەری ژانەکەی ئەشکێنێ. ئەگەر یەکێ دەموچاوی قەڵشابووەوە وەیا پەڵەی ڕەش لەسەر دەموچاوی هەبوو سیر لەگەڵ هەنگویندا بجوون و بیخەنە سەریان چاك ئەبنەوەو نامێنێ. یەکێ لەخورێنی سیر بخوا ئەو ڕۆژە نە ژار کاری تێ ئەکا نە زەهری مارو دووپشك و شتە...

سیر بیسووتێنن و خۆڵەمێشەکەی لەگەڵ هەنگویندا بدرێ لەو پەڵە سپیانە کە لە لەشدا پەیدا ئەبن نامێنن. سیر بە برژاوی ژانی ددان ئەشکێنێ، سیر کە کوڵێنرا و واتە وەیا

لەناو چێشتا بوو بخورێت گەروو خاوێن ئەکاتەوە و بۆ کۆکەپیرەش زۆر باشە نایهێڵێ، هەروەها بۆ پێوەدانی جروجانەوەریش باشە. ناو قنگ ئەگەر تووشی خوران بوو سیر بکا بە شاف و هەڵیبگرێ خورووەکەی ئەنیشێتەوە. ئەگەر بتەوێ بزانی ئافرەتێك کچە یا ژنە بێنە سیر بکوتە و لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاوی بکەو بکرێ بە شاف و ئەو ئافرەتە هەڵیبگرێ، لەپاش ماوەی دوو سەعاتێك بۆنی دەمی بکە ئەگەر بۆنی سیری لێ هات ئەوە کچە ئەگەر نەهات ئەوە بووە بە ژن.

ئەگەر یەکێ بۆنی دەمی ئەهات و چار نەئەکرا ماوەی ساڵێك دەست بکا بە سیرخواردن بۆنەکەی لائەچێ...



## سیسعەنبەر

سیسعەنبەرگیایەکەلەنەعنائەچێ،گەڵایەکی بۆنخۆشی هەیە، گوڵەکەی سپی مەیلەو سوورە، تۆوێکی وردی هەیە وەکوو تۆوی ڕەیحانە.

یەکێ ژانەسەری بێ وەیا لاجانگی ژان بکا سیسعەنبەری لێ بنێ ژانەکەی نامێنێ و چاك ئەبێتەوە... زەردەواڵە بدا بەیەکێکەوە سیسعەنبەری بخەنە سەری ژانی نامێنێ... لە شوێنێکا ئەگەر سیسعەنبەر ڕابخەن مێش و مێشوولەو شتە لەو شوێنە هەڵدێن... ئەسپێ لە لەشا دایە شوێنێك سیسعەنبەری لێ بنێن ئەیکوژێ. یەکێ نزگەرە بیگرێ و هەر ڕزگاری نەبێ ئاوی سیسعەنبەر بکەن بە دەمیەوە زوو ڕزگاری ئەبێ. یەکێ قورحە وەیا کرم لە سکیا بێ وەیا ئافرەت مناڵ لە زکیا مردبێ ئەمانە ئاوی سیسعەنبەر بخۆنەوە هەموویان نەجاتیان ئەبێ. تۆوی سیسعەنبەر بکرێتە ئاو یەکێ ژان و پێچی هەبێ بیخواتەوە بۆی باشە، هەروەها ئافرەتێ کە بە زەحمەت مناڵەکەی لێ ئەبووەوە بیخواتەوە زوو ڕزگاری ئەبێ.

## شمڵی



شمڵی تەڕەیەکە ئەیکەنە ناو خۆراکەوە، دەنکێکی وردی زەردی هەیە کە ئەمیش هەر لە خواردەمەنیدا بەکار ئەهێنرێ.

شمڵی ڕوونی بگیرێت و لەگەڵ ئاسدا تێکڵاو بکرێ بدرێ لە موو بەهێز و درێژی ئەکا...

هەروەها بدرێ لەشوێنی برین سارێژی ئەکا بە تەواوی. ئەگەر یەکێ پەڵە پەڵەی ڕەش لەسەر لەشی وەیا دەموچاوی هەبوو دیسان لە وەشی لێ بدا هەر بۆی چاکە و بەتایبەتی لە ڕوومەت بدرێ جوانی ئەکا. بهێنرێ بەدەمدا بۆنی خۆش ئەکا بەڵام بۆنی میز و لەش و عەرەق ناخۆش ئەکا...

## شووتی



شووتی کە «هەنی»یشی پێ ئەڵێن و ناوی‌تریشی هەیە، سەرەتا بە تۆو ئەیچێنن، پاشان گەورە ئەبێ و ئەبێ بە بڕك، بڕکەکەی ئەکشێ بەسەر زەویدا خزیشە، گەڵاکەی ورد و لەلە کراوە، ئەو بڕکە شووتی ئەگرێ، شووتی ئەوەندە زل ئەبێ هی وای هەیە دوو دانەی ئەنێن لە ئێسترێك، ئەم جۆرەی بە تایبەتی لە گوێ ڕووبارەکان و لەو شوێنانەدا ئەبێ کە چەوی گوێ ڕووبارەو لەژێرەوە تەڕەو لەسەرەوە دیار نییە، شووتی توێکڵێکی ئەستووری هەیە، ناوەکەی کە بگا سوورە، تامی شیرینە، ناوکی هەیە لە ناوەوە، هەتا ناوکی کەمتر بێ ئەوە ئەو شووتییە چاکترە، ناوکەکەی هەڵئەگیرێ و ئەبرژێنرێ.

شنووتی خواردن میزکردن زۆر پەیدا ئەکا، هیچ زیانێك لە خواردنی شووتیدا نییە مەگەر بۆ ئەو کەسانە نەبێ کە قورحەیان هەیە، یەکێ گەرمەژەنەی دەرکردبێ بە توێکڵی شووتی خۆی بهەنوێ لائەچێ، تەبێعەتی شووتی فێنکە..

## شویت



شویت تەڕەیەکی بۆنخۆشە ئەکرێتە ناو خۆراك بۆنی خۆش ئەکا، هەروەها وشکیش ئەکرێتەوەو ئەکرێتە ناوی، ساقەتەیەکی سەوزو گەڵایەکی ورد وردی باریکی هەیە، گوڵەکەی وەکوو چەتر ئەوەستێ و تۆوەکەشی زۆر وردە، بۆ نەخۆشی جگەر و بێ‌هێزی «معدە» بەکار ئەهێنرێ.

زەویەك ئەگەر کێڵراو ئاو درا لەپاشا، تۆوی پێوە نەکرا، ساڵێکی بەسەرا چوو شویتی لێ ئەڕوێ بەبێ ئەوە تۆوی شویتی پێوە کرابێ.. خواردنی شویت، واتە زۆر خواردنی تاریکایی لەچاوا پەیدا ئەکا.. خواردنی شویت خەو ئەهێنێ.. یەکێ مایەسیری هەبوو شویت بکوتی و لێ بنێ مایەسیریەکەی لەبن دێنێ. جۆرە شویتێك هەیە سپییە ئەگەر یەکێ ئەو شویتە بجوێت، پاشان پشکۆی ئاگر بخاتە ناو دەمی هیچ ئەو ئاگرە کاری تێ ناکاو نایسووتێنێ. ئەگەر یەکێ لەکاتی نووستنا ترس وەیا پرخە پرخی هەبوو شویت لە ژوور سەری دابنێن نایمێنێ. تۆوی شویت بۆ ئافرەت شیری پێ زیاد ئەکا، مادەی مەنی ئەبڕێ و مایەسیری لائەباو ئەیبڕێ.

## شێلم



شێلم گیایەکە سەلکی هەیە، ئەم سەلکەی وەکوو سەلکی توور وایە بەڵام بچووکترە، تامەکەی تۆزێ توند و تیژە، ئەکوڵێنرێ و ئەخورێ وە ئەیکەن بە چێشتیش، شێلمی کوڵیو بۆ کۆکەو سنگ ساف‌کردن و هێزی چاو و شەهوەت زۆر باشە، بەکوڵاوی بۆ ئەو کەسەی فێری نەبووبێ بۆنێکی زۆر پیسی هەیە، بەڵام کە فێری خواردنەکەی بوو زۆر بەلایەوە بەلەزەتە.

تۆی شێلم و تۆی کەلەرم ئەگەر سێ ساڵ بەسەریانا تێپەرێ و نەچێنران پاشان

چێنران، لەتۆی شێلمەکە کەلەرم و لە تۆوی کەلەرمەکە شێلم ئەڕوێ. ئەگەر تۆوی شێلم لەپێشا بخرێتە ناو هەنگوین و پاشان بچێنرێ شێلمێکی خۆش و شیرین لەو تۆوە دەرئەچێ.

تۆوی شێلم بنرێ لە مێخەکە هەڵی ئەکەنێ و لای ئەبا. ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئینسان سەوز بووبێتەوە شێلمی کوڵیوی بەگەرمی لێ بنێن چاکی ئەکاتەوە.

## قاخڵی



قاخڵی گیایەکە کە گوڵێکی زەردی هەیە وەکوو زەعفەران و زۆرتر لە شوێنێکا کە زەعفەران دەست نەکەوێ قاخڵی لە شوێنی ئەو بەکار دێنن.

تۆوی قاخڵی سنگ پاك ئەکاتەوە، دەنگ ڕەوان ئەکاو بۆ کوڵنج باشە، قاخڵی لەگەڵ هەنجیر وەیا هەنگوین بخورێ، واتە تۆوەکەی بۆ هێزی چوونە لای ژن زۆر بەهێزە، گوڵەکەی بدرێ لەو پەڵە ڕەش وەیا سپیانە کە لەسەر لەش و دەموچاو پەیدا ئەبن لایان ئەبا... قاخڵی ئەکرێ بە ڕووی کولێرەوە زۆر بەلەزەت و بە دیمەنە..

## قارچك



قارچك شتێکە کە لە بەهارانا لە شوێنی نمناك لە ژێر ئەرزا پەیدا ئەبێ و پاشان هەڵئەتۆقێ، نەتۆوی هەیە وە نە ڕیشەی هەیە، تەبیعەتی زەوییەکە دروستی ئەکا، پاشان کە هەور گرمانی زەوییەکە هەڵئەدڕێ و دێتە دەرەوە، ساقەتەی هەیە، سەرەکەی تۆپزێکی وەکوو چەتر وایە، خۆی نەرمە. قارچکیش چەند جۆرێکی هەیە؛ هی وەردو شۆو ئەمانە زۆر باشە، لەشوێنانی نمناکیتر ورد ورد دەرئەچێ و پێ ئەڵێن قارچکە گوڵانە، ئەوانە خواردنیان ئینسان ئەکوژێ، بە تایبەتی هی سێبەری داری زەیتون ئەو

کوشندەیەکی تەواوە، لەقەد دارو شتیشەوە دەرئەچێ ئەوانەش هەر خراپن. قارچکی شۆو وەرد کە هێنرایەوە سوور ئەکرێتەوە لەگەڵ ڕۆندا ئەبێ بە خواردەمەنیەکی باش و خۆش، ئەڵێن ئەگەر قارچك لەژێر ئەرزا مایەوەو دەرنەچوو، ئەگەر هاوین باران باری و ئەو بارانە لێی دا ئەو قارچکە ئەبێ بە مار.

زۆر خواردنی قارچك ترسی ئیفلیجی و مەرگی مفاجاتی لێ ئەکرێ. ئاوی قارچك بهێنرێ بە چاوا ڕوونی ئەکاتەوە. دیسان زۆر خواردنەکەی ئەبێتە هۆی کوڵنج و میزگیران. وەختی قارچك هەر بەهارانە.

## قانگ



قانگ گیایەکی دەشتەکییە، گەڵایەکی وردی هەیە، بەرەکەشی وردو خڕو کووز کووزە، لەناو ئەو بەردەدا دەنکی تێدا هەیە ئەو کەڵکەی کە لە قانگدا هەبێ لەو دەنکانەدایە. بە بنجەکەوە ئەیهێنن و وشك ئەکرێتەوە، پاشان ژنان بۆ چاوەزار بەرەخڕەکان کە دەنکە وردەکانی تێدایە هەڵی ئەوەرێننە سەر ئاگری پشکۆ و دووکەڵ ئەکا، لە هەمان کاتا بۆنیشی خۆشە هی ئەو سووتانەی، لەناو کورددا هەرشتێ کە بەو جۆرە دووکەڵی پێ بکرێ وە یا دووکەڵ بدرێ ئەڵێن: قانگی دا وەیا قانگ بدرێ، ئیتر مەرج نییە ئەم قانگدانە ئەو قانگە بێ کە ناوە بۆ ئەو گیا تایبەتییە.

جومگەی لەش کە ژان بکا قانگی لێ بنرێ بۆی باشە. لەم قانگەدا مادەیەك هەیە سەرخۆش و مەستی ئەدا، ئاوەکەی بگیرێ بەتەڕی یەکێ کۆڵنجی هەبێ لێ بدا وەیا بیخواتەوە بۆی باشە. تۆوە وردەکەی بکرێتە ناو سرکە و پاشان بیپژێنن بە ناو ماڵدا مێش ناچێتە ئەو ژوورەوە..

## کەرەوز



کەرەوزکێویشی هەیەو باخیشی هەیە، گیایەکە ساقەتەیەکی باریکی سپی هەیە، گەڵاکەی گردو خڕە، تۆوێکی وردیشی هەیە، کەرەوز ئەکرێتە ناو خواردەمەنی و بەکاڵیش هەر ئەخورێ.

خواردنی کەرەوز بۆنی دەم خۆش ئەکا، ئارەزووی یەك گرتنی ژن و پیاو زیاد ئەکا...

ئەندامێك لە لەشا لەرزۆکی تووش ببێ کەرەوزی لێ بنرێ چاکی ئەکاتەوە. کەرەوز بۆ گەڕی باشە.

یەکێ دووپشك پێوە بدا ئەبێ زۆر خۆی بپارێزێ لە خواردنی کەرەوز چونکە زۆر بۆی خراپە و ژان و ژارەکەی زیاتر ئەکا. یەکێ ئاوی کەرەوز بهێنێ بە چاویا چاوی ڕوون ئەبێتەوە.. یەکێ ددانی ژان بکا ساقەتەی کەرەوز بکاتە ملی بۆ ژانی دانەکەی باشە. تۆوی کەرەوز زۆر بەکەڵکە بۆ ئێسقان و میزگیران.

تۆوەکەی قانگ بدرێ دووکەڵەکەی زۆر خەو لە ئینسان ئەخا... یەکێ نزگەرەی ئینتەلا بیگرێ کەرەوز بخوا بۆی باشە.

## کاڵەك



کاڵەك کە هەندێ جار لە شێوەی کوردیشدا پێی ئەڵێن «گندۆرە» وەکوو پەندەکەی لەسەرە کە ئەڵێ «گندۆرە بەڕەنگی نییە». ئەوەندە هەیە لە شێوەیەکی‌ترا گندۆرە بە کاڵەکی بچووکی خریلەیەکی‌تەواو نەگەیشتوو ئەڵێن، کاڵەك لەبەری برکێکە کە ئەو برکە ساقەتەیەکی بەرزی هەیە و تەرزەکەی ئەکشێ بەرووی زەویدا. خۆیشی گەورەو شیرینە، تۆوەکە درێژکۆڵە و زەردکارە.

گەلێ جۆری هەیە؛ جۆرێکی هەیە پێ ئەڵێن «عەسکەری» زۆر شیرین و بە تامە،

جۆرێکی‌تری هەیە گۆشتەکەی زەردە، جۆرێکی‌تری گۆشتەکەی سپییە، توێکڵەکەی لایەکی سپی و لایەکی سەوزەو سافیشە، ئەم جۆرەیان بەتایبەتی کە تۆزێ زل بوو دێنن لە عاستی خۆی ئەرزەکەی بۆ قووڵ ئەکەن و ئەیخەنە ناویەوە و خۆڵ ئەدەن بەسەریا، هەر زل ئەبێ و هەر خۆڵ ئەدەن بەسەریا تا وای لێ دێ ئەوەندە گەورە ئەبێ هەر بەدوویان ئەبن بەباری گوێدرێژێك وە زۆر زۆریش شیرینە. چاندنی کاڵەك دەنك دەنکە، بەچوکڵەیەك زەوییەکە قووڵ ئەکەن و دەنکەکەی تێئەخەن و بە خۆڵ دای‌ئەپۆشن و ئاو ئەدرێ ئیتر ئەڕوێ.

تۆوی کاڵەك بخرێتە ناو هەنگوین و شیرەوە لەپێشا ئەمجا بیچێنن کاڵەکی ئەو تۆوە لەبەر شیرینی و خۆشی ناخورێ.

بۆنی کاڵەك زیانی هەیە بۆ داو دەرمان چونکە هێزی دەرمانەکە ناهێڵێ. لە ماڵێکا کە کاڵەك هەبوو وە هەویر لەو ماڵەدا کرا هەویرەکە هەڵنایەت.. ئەگەر شوێنێ کاڵەکی لێ بوو ژنی حەیزدار بەو شوێنەدا بڕوا کاڵەکەکان هەموو عەدم ئەبن. ئەگەر تۆوی کاڵەك و خەیار بۆنی ڕۆنیان کرد بەری ئەو دوو تۆوە تاڵ ئەبن. تۆوی کاڵەك لەناو گوڵدا دابنرێ و پاشان ئەو تۆوە بچێنرێ بەری ئەو تۆوە بۆنی گوڵ ئەدا... ئەگەر سەری کەر لەناو بێستانی کاڵەکا دابنرێ ئەو بێستانە دوور ئەبێ لە هەموو ئافەتێك و زوویش بەرەکەی دێتە ئەنجام.

خواردنی کاڵەك «معدە» پاك ئەکاتەوە، ئیشتیهای خواردن پەیدا ئەکا، ڕەنگ و ڕوو جوان ئەکا، تۆوی پیاو زیاد ئەکا...

یەکێ ئاو لە چاوی بێ تۆوی کاڵەك بگرێتە ناو چاوانی بەرهەڵستی ئاوەکەی ئەکا...

خواردنی کاڵەك بەکەڵکە بۆ ئەو بەردانە کە لە گورچیلەو میزڵداندا پەیدا ئەبێ لایان ئەبا...



## کاهوو

کاهوو ڕووەکێکە گەڵایەکی پان و چەوری هەیە لەگەڵ ساقەتەیەکدا، هەردووکی بەکاڵی ئەخورێ، کاهوو هەتا بەئاوی پیس و پۆخڵ ئاو بدرێ بەتامترو چەورتر ئەبێ، هەندێکی گەڵایەکی

وەکوو کەلەرم ئەچەسپێنێ بەیەکەوەو ئەبن بە وەکوو تۆپ ئەمەیان باشترە لەوانی‌تر. ئەگەر بشقڵێکی حوشتر بێنی کونی کەی تۆوی کاهوو و تۆوی تەرەتیزە بخەیتە ناویەوە و بینێژی و داپپۆشی بە خۆڵ و ئاوی بدەی پاشان کە ڕووا لەیەك ساقەتە کاهوو تەرەتیزە دەرئەچێ.

کاهوو هەتا گەڵاکانی لای خوارەوەی بکەی گەڵای لای سەرەوەی بە تامتر ئەبێ.

کاهوو خەو ئەهێنێ و تینوێتی لائەبا. شەهوەت کز ئەکا. بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ سرکە بخورێ هەر زۆر زۆر شەهوەت کز ئەکا... دەوامکردن لەسەر خواردنی کاهوو تەم و تاریکایی لەچاوا پەیدا ئەکا. بەڵام بۆ ئافرەت خواردنەکەی شیری پێ زیاد ئەکا... خواردنی کاهوو بە کەڵکە بۆ نەخۆشی شەکر...



## کاڵەکەمارانە

کاڵەکەمارانە بەری گیایەکە کە خۆی بەبێ چاندن لەشوێنی وشکا ئەڕوێ، بەرەکەی کە کاڵەکەمارانەکەیە زۆر بچووك و خڕە وەکوو قانگ، زۆر تاڵە وەکوو زەهر، ئاسکە کێوی زۆر خۆشی لێ دێ وەکوو حەڵوا ئەیخوا، دڕندەی کێوی هەموو لە کاڵەکەمارانە هەڵدێن.

شوێنێ لە لەشا خوێنی نەوەستایەوە گەڵای کاڵەکەمارانەی بخەنە سەر خوێنەکەی ئەوەستێنێتەوە، هەروەها بەکەڵکە بۆ ماخوولان و فێداریش. کاڵەکەمارانە بکرێتە ناو ئاوو بەو ئاوە ژووری ئۆدە و شتی پێ بڕشێنی هەچ کێچێك لەوێدا بێ هەمووی ئەکوژێ.

یەکێ تووشی شلەپەتەیی بوو سێ دەنك کاڵەکەمارانە بێنن کونیان کەن و شیر بکەنە ناوی و سەرەکانیان بنێنەوە، پاشان لەناو خۆڵەمێشی گەرما دایانبنێن تا دێنەکوڵ، ئەمجا ئەو کەسە بیانخواتەوە ڕزگاری ئەبێ لەشلەپەتییەکەی.. گول لەشی خۆی بە کاڵەکەمارانە بەهەنوێ چاك ئەبێتەوە. ئەو کەسەی تووشی لەش ئەستوور بوون وەیا ـعرق النسا ـ بووە لەشی خۆی وەیا ئەو شوێنەی بە کاڵەکەمارانە بەهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

یەکێ دووپشك پێوە دابێ کاڵەکەمارانە یا بیخوا وەیا بیهێنێ بەشوێنی پێوەدانەکەدا

چاك ئەبێتەوە و ژارەکەی کاری تیّ ناکا.. یەکیّ مارو شتە گازی لیّ بگریّ و پێوەنەدا کاڵەکەمارانە بخاتە سەر جیّ دەمەکەی بۆی باشە و مەترسی نامێنیّ.



## کەلەرم

کەلەرم کە «کەلەم»یشی پیّ ئەڵێن، یەکێکە لەو ڕووەکانە کە بە چێشت لیّ ئەنریّ و ئەخوریّ. کەلەرم دوو جۆرە؛ جۆرێکیان گەڵایەکی پانی گەورەی هەیە و بەسەر یەکا چوون وەکوو تۆپ، جۆرەکەی تریان کەلەرمێکە پیّ ئەڵێن کەلەرمی قەمەری کە وەکوو چەوەنەرەو ڕەنگی سەوزە.

کەلەرم گەڵاکەی زۆر گەورە و پان و پۆڕە، وەنەبیّ بڵاوبیّ وەکوو گەڵای ڕووەکی تر بەڵکو چوون بەسەریەکاو لەیەك توونئ بوون، زۆرتر بەکار هێنانی کەلەرم بۆ یاپراخە.. کەلەرم ئەگەر لە ئەرزی بایەرا بچێنریّ گەورە و بەتام ئەبیّ و کرمیش تێی نادا.

کەلەرم ئەگەر لەگەڵ ساقەتەکەیا بکوتریّ یەکیّ خەمبار بیّ لەسەر توێڵی دابنیّ ئەو خەمەی بەسەر ئەچیّ و کەیف خۆش ئەبیّ... کەلەرم خواردن خەوی ناخۆش بەپیاو ئەبینیّ بەڵام دەنگ ساف ئەکا. کەلەرم ژانی لەش سووك ئەکا، لەرزۆکی لە لەشا لائەبا، خەو ئەهێنیّ بەڵام بەرچاویش تاریك ئەکا.

تۆوی کەلەرم لەناو بێستانا بسووتێنریّ دووکەڵەکەی کرمی ئەو بێستانە ئەکوژیّ. هەروەها خواردنی تۆوەکەی بۆ ئافرەت لەپاش چوونە لای پیاوی، ئاوەکە ـ واتە مەنییە ـ خراپ ئەکاو تۆوی منداڵ لەو ئاوەدا ناهێڵیّ. خواردنی تۆوی کەلەرم مەنی زیاد ئەکا.



## کوولەکە

کوولەکە ڕووەکێکە ساقەتەیەکی بەرزو لووسی هەیە، گەڵاکەی پانە، بەرەکەی کە کوولەکەکەیە لەوێنەی کاڵەکدایە، تۆوێکی دروشتی هەیە لەناویا، کوولەکە ئەکریّ بەچێشت و ئەخوریّ،

کوولەکە چەند جۆرێکە؛ گەورەترو ڕەنگی زەردە هەر بەتەواوی لە ڕواڵەتا لە کاڵەك ئەچێ، ئەم جۆرەیان زۆر شیرینە و ئەپیشێنرێ و ناوەکەی پڕ ئەکرێ لەناواخن، جۆرێکی تریان توێکڵێکی ئەستووری هەیە، ملی باریکە، پاش ئەوە کە ناوەکەیان دەرهێنا توێکڵە بێ ناوەکە وشك و سەخت ئەبێ وەکوو داری لێ دێ، ئاوو ڕۆن و شتەی تێ ئەکەن، جۆرێکی تری لەوێنەی خەیاردایە بە عادەتی ئەکرێ بەچێشت.

کوولەکە ئەگەر تۆوەکەی لەکاتی چاندندا سەرەوبن بچێنرێ و بخرێتە ناو زەوییەکەوە کوولەکەی زۆر گەورە ئەبێ. کوولەکە زۆر خواردن ـ دیارە بەچێشت ـ خەم و خەفەت لائەباو خۆشی ئەهێنێ. مێش نانیشی بەبرکی کوولەکەوە.

## کەوەر



کەوەر تەڕەیەکە بەکاڵی ئەخورێ و هەندێ جاریش ئەکرێتە ناو چێشتەوە، گەڵاکەی درێژی مەیلەو باریکە و بە درێژیی درێژیەکەی کووزێك لەناویایە، بۆنی لەپاش خواردن وەنەبێ خۆش بێ، بەتۆو ئەچێنرێ، کە سەری لەزەویەکە دەرکرد پەلکەکانی جیا ئەبنەوە. یەکێ بیەوێ بیچێنێ بێنی لەپێشا تۆوەکەی بپرژێنێ بە زەوییەکەدا لەپاش سێ ڕۆژ ئاوی بدا ئەوە بنکەکەی زۆر بەهێز ئەبێ. خۆ ئەگەر بویسترێ زۆر بەهێز بێ پشقڵی مەڕ بێنێ، هەر پشقڵێ سێ دەنك تۆوی تێخاو بینێژێ ئەوە هەر زۆر زۆر بەهێز ئەبێ.

یەکێ دووپشك وەیا زەردەواڵە پێوەی بدا کەوەر بکوتن و لەسەری دابنێن هەر خێرا ژانەکەی ئەشکێنێ. دەوامکردن لەسەر خواردنی کەوەر تاریکایی لەچاودا پەیدا ئەکا...

جۆرە کەوەرێك هەیە پێ ئەڵێن کەوەری شامی ئەم جۆرەیان لەبالووك و زیپکە بدرێ لای.ئەبا بەڵام کە بخورێ پووك و ددان خراپ ئەکاو زیانی بۆ چاویش هەیە.. ئەم کەوەرەی کە هەیە خواردنی بۆ کزکردنی مایەسیری باشە تەنانەت ئەگەر لێشی بنێن هەر بۆی باشە، هێزی شەهوەتیش زیاد ئەکا... ئەو برینانەی کە خوێنیان ناوەستێتەوە

کەوەری لێ بنێن خوێنەکەی ئەوەستێتەوە... بۆ ساف‌کردنی دەنگیش باشە، دەنگ خۆشەکان ئەیخۆن بۆ ئەوە دەنگیان زەلال و ساف بێ.

## کونجی



کونجی گیایەکە کە گەڵاکەی باریك و چوار گۆشەییەکی درێژکارە لە وێنەی خاجدا هەڵکەوتووە، بەرەکەی وەکوو گوڵی گەنم دەنکێکی وردی هەیەو ئەو دەنکانە چەورو ڕۆنێکی زۆریان هەیە، ڕۆنی کونجی ئەگیرێت بۆ سابوون دروست‌کردن زۆر بەکاری ئەهێنن و لەشتی تریشا هەر بەکار ئەهێنرێ.

گەڵای کونجی خۆی وەیا ئاوەکەی بدرێ لە موو بەهێز و درێژی ئەکا. تۆوی کونجی شوێنێك لە لەشا بەهۆی لێ دان و شتەوە شین بووبێت وەیا خوێنەکەی تێدا وەستابێ لێ بنێن چاکی ئەکاتەوە. شوێنێك قەڵشابێتەوە کونجی لێ بدەن بۆی باشە... خواردنی کونجی ئینسان زۆر قەڵەو ئەکاتەوە. ژنی حەیزدار کونجی بکاتە ئاو و بیخوا [بۆی باشە] بە برژاوی هێزی چوونە لای ژن و ئاوی شەهوەت زیاد ئەکا.

## گاڵ



گاڵ کە «هەرزن»یشی پێ ئەڵێن، بەناو ئەویش لە سیرەی خەلەدایە، بنکەکەی بچووك و ساقەتەیەکی نازك و دەنکگەلێکی وردی هەیە، زۆرتر بە باڵندە ئەدرێ بەڵام گەلێ جاریش لە ساڵانی گرانیدا ئەیهاڕن و ئەیکەن بەنان و ئەیخۆن، گاڵ و دێمیلەی مەریوان بەناوبانگە. ئەو زەوییەی گاڵی تیا بچێنرێ لەوانەیە لەکەڵك ئەکەوێ بۆ دەغڵودان چونکە ئەو تۆوەکەی زوو لەناو ناچێ هەر شتێکی‌تری پێوە بکرێ ئەویش لەگەڵیا ئەڕوێتەوە، ئەبێ تا

ماوەیەکی زۆر دەست لەو ئەرزە هەڵبگیرێ پاشان بکێڵرێ، زۆرتر لەبەر ئەو خراپ نەبوونەیەتی بۆیە لە هەندێ شوێنا لە ترسی گرانی ماوەیەکی زۆر ئەیکەنە چاڵ و هەڵی ئەگرن. کولێرە دێمیلەی مەریوان دراوە لەملی سەگ شکاندوویەتی!.

ئەگەر شوێنێك لە لەشا ژان بکا گاڵی لێ بنێن ژانەکەی ئەڕەوێنێتەوە، خواردنی نانەکەی گوو بەزەحمەت بە ئینسان ئەکا، لەوانەیە ئافرەتی بەردار بیخوا بەرەکەی پێ بخا...



## گلێنە

گلێنە کە «کزن»یشی پێ ئەڵێن، گیاکەی کە کزنەکە بەری ئەوە گەڵاکانی باریك و درێژکارە، گلێنەکە خۆی کە بەرەکەیە وەکوو ماش وایە خڕە و بەئەندازەی ئەویشە، ڕەنگێکی تاڵی مەیلەو سووری هەیە، تامەکەی کەمێ تاڵ و توندە، ئەدرێ بە باڵندە لەباتی دان، بەڵام خواردنی هەرەخۆشی گایە بۆی ئەکەنە ئاو و ئەیدەنێ پێی قەڵەو ئەبێتەوە، بە مەڕو بزنیش ئەدەن. تامەکەشی لەبەینی ماش و نیسکدایە.

ئەو پەڵە سپی و ڕەشانە کە لەسەر پێست پەیدا ئەبن و بەڵەکیش نین، ئەگەر بەگلێنە بیانهەنوون چاك ئەبنەوە و لائەچن، هەروەها یەکێ بەڵەکی هەبێ گلێنەی پیا بهێنێ چاکی ئەکاتەوە... ڕەنگ و ڕوو جوان ئەکا... گلێنە بیهاڕن و ئاردەکەی پیاوی لاواز بە ئاردی وەیا بەنان بیخوا قەڵەوی ئەکاتەوە. یەکێ مار گازی لێ بگرێ وەیا سەگی هار بیگرێ گلێنە تێکلاوی شەراب بکرێ و لێی بنرێ زۆر بۆی باشە...



## گەنم

گەنم یەکێکە لەو شتە هەرە گرنگانە کە ژیانی ئادەمیزادی پێوە بەندە، گەنم دێمی هەیە و بەراوی هەیە، بەراوەکەی ئەوەیە کە لە پایزانا ئەوەشێنرێ هەموو دەم ئاو ئەدرێ، دێمیەکەی ئەوەیە کە

زەوییەکە بەراو نییە لەدەمەو بەهارا ئەوەشێنرێ و ئاوی باران ئاوی ئەدا، گەنمێ کە بە ئاوی باران بێتە ئەنجام چاکترو نانەکەی خۆشترە. بنکی گەنمی دێمەکار کورتترە لەهی بەراو، بەڵکوو لقی گەنمی بەراو تا دوو گەز درێژ ئەبێتەوە و لەوانەیە سوار تیایا ون ببێ، گەڵاکەی درێژترو باریکترە لەهی دێمەکار، هەر دەنکە گەنمێك چەند ساقەتەیەکی ناو بۆشی لێ دەرئەچێ، هەر لقێك گوڵە گەنمێکی بەسەرەوەیە، هەر گوڵە گەنمێك لە دە تا سەد دانە گەنمی پێوەیە، جوانتر دیمەن دیمەنی گوڵە گەنمە کە بە یاسایەکی زۆر رێك و پێك سەریان ناوە بەدوای یەکەوە، لەسەر هەر تاقە گەنمێك چزێکی باریکی درێژی بەگوڵەکەوە بەرز بووەتەوە. جگە لەم دێم و بەراوییە گەلێ جۆری هەیە، چاکتری هەمووی گەنمە بەهارەیە کە پێی ئەڵێن گەنمە قەندەهاری، ئایا چ دیمەنێك لە دیمەنی پەڵەگەنمی بەراوی جوانترە لەکاتێکا کە گوڵی کردووە؟ زۆر مخابنە کە ئادەمیزاد ئەم هەموو شتە جوانە سروشتییانە ئەبینێ و ئەمرێ!..

لە کاتێکا کە جووتیارەکە تۆوی گەنمەکە ئەوەشێنێ هەر دەنکە گەنمێکی کەوتە سەر شاخی گایەکە ئەو دەنکە قەت ناڕوێت... دەنکی گەنم بهاڕێتەوەو بدرێ لە ڕوومەت جوانی ئەکا...

یەکێ سەگی هار گرتبێتی کەپەکی گەنم بکوتن و لێ بنێن بۆی باشە. گەنم بخەیتە سەر ساج و بۆنی بدەی، لەو کاتەدا ڕتووبەتێکی لێ پەیدا ئەبێ، یەکێ وشکە بیرۆی هەبێ ئا بەو ڕتووبەتە بیهەنوێ چاك ئەبێتەوە. هەروەها یەکێ وشکە بیرۆی هەبێ نانی گەنم بەئاو و بەخوێ تەڕ بکاو پیا بهێنێ چاکی ئەکاتەوە... هەویری ئاردی گەنم خوێی زیادی تێ کەی و بیخەیتە سەر دمەڵ ئەیگەیێنێ. شوێنێك لە لەشا ئازاری گەیشتبێتێ ئاردی گەنم خوێی تێ کەی و تۆزێ گەرمی کەی لەگەڵ ڕۆن دا ـ دیارە ئاردەکە بکەی بە هەویر ـ بیخەیتە سەری بۆی باشە. کە بەمە بەکوردی ئەڵێن نیوەنمەك.



## کنگر

کنگر، وەیا قنگر لە سیرەی ڕووەکدایە، ساقەتەیەکی ئەستووری سپی هەیە، توێکڵ توێکڵە لەسەر یەك، لە ئەرز دەرئەچێ، سەری توێکڵەکان دڕکە، ساقەتەکەش زۆر بەرز نابێتەوە،

لە بەهارانا و لەشوێنی کوێستانا زیاتر ئەبێ، بەکاڵی و بە کوڵاوی ئەخورێ.

کورد پەندێکی هەیە لەسەری ئەڵێ: «کەنگر و ماست بە وەختی خۆی».

یەکێ موورێـزە ـ داءالثعلب ـ ی هەبێ کنگر بهێنێ بە شوێنەکەدا ئیتر مووی هەڵناوەرێ.

یەکێ سەری گێژ بخوا بەئاوی کنگر سەری بشوا ڕزگاری ئەبێ لەو سەرەگێژەیە، هەروەها سەری بە ئاوی کنگر بشوا ئەسپێ لەسەریا نامێنێ. یەکێ بۆنی بنەنگڵی بێ کنگر بخوا ئەو بۆنە نامێنێ. هەروەها کنگر خواردن هێزی چوونەلای ژن زیاد ئەکات. کنگر لەگەڵ ڕۆندا سوور بکرێتەوەو خوێی بکرێ بۆ هەموو جۆرە هێزێك باشە...



## گوڵاڵەسوورە

گوڵاڵەسوورە گوڵێکە کە لە سەرەتای بەهارا ئەڕوێ و ڕەنگێکی سووری نایابی هەیە، دەشتەکیی هەیە وماڵییشی هەیە، لەسەربانەکانا لە کوردەواری زۆر دەرئەچێ، ساقەتەو گەڵاو تۆوەکە زۆر لە خاشخاش ئەچێ، جۆرێکی گوڵەکەی پێنج پەڕەیەو جۆرێکی زیاترە لە پێنج، دەشتەکیەکەی پەڕەکانی زۆر سوورو تەنکە، لەبەینی پەڕەکانەوە ڕەشە، لە ناوەکەیەوە تۆوە، هەندێك لەم گوڵاڵەسوورەیە گوڵەکەی لەگەڵ ڕۆژدا ئەسوورێتەوە، بە ڕۆژ دەم ئەکاتەوە بەشەو چاو ئەنووقێنێ.

چاورێشتن بە گوڵاڵەسوورە تاریکایی سەرچاو لائەبا. گوڵاڵەسوورە لەگەڵ توێکڵی گوێزدا پێکەوە بکوترێن خەنەو وسمەیەکی زۆر نایابە بۆ موو. گوڵاڵەسوورە بهێنرێ بە گەڕی و برینـدا زۆر بەکەڵکە بۆی. گوڵاڵەسوورە لەگەڵ لاسکەکەیا بکوڵێنرێ و ئافرەت بیخوا شیری زۆر ئەبێ. ڕیشەی گوڵاڵەسوورە لەناو گوڵاودا ورد بکرێ، پاشان بیپژێنن بەسەر شتی سپیدا سووری ئەکا، کە وشك بووەوە لائەچێ و هیچی نامێنێ.



## گوڵگاوەزوان

گوڵگاوەزوان کە «گۆزروان»یشی پێ ئەڵێن گیایەکە گوڵێکی پانی هەیە وەکوو زمانی گا لەدەشتا ئەڕوێ، تەبێعەتی تەڕ و گەرمە، بۆ کۆکە و سینگ تێك‌چوون زۆر بەکەڵکە. لەزۆر شوێنا گوڵ و گەڵاکەی پێکەوە وشك ئەکەنەوە زستانان بۆ دەرمانی سینە وەکوو چا دروستی ئەکەن و ئەیدەن بەو کەسە. گۆزروان خواردنەکەی خۆشی ئەهێنێ و خەم و خەفەت لائەبا.



## گێزەر

گێزەر کە «گزەر»یشی پێ ئەڵێن لەبناغەدا گیاکەی ساقەتەیەکی باریك و گەڵای وەکوو بڕاو وایە، گوڵەکەی سپی و وەکوو چەتر هاتۆتەوە، بنکەکەی کەسەلکەکەیەتی گێزەرەکە ئەوەیە، ئەمە درێژ و ئەستوورە، ڕەنگی زەردیشی هەیە و سووریشی هەیە، تامەکەی شیرینە، بەکاڵی ئەخورێ، ئەکرێ بەچێشت و مرەباو شەربەتی لێ دروست ئەکرێ.

ئەگەر یەکێ گێزەر لەگەڵ هەنگویندا بکوڵێنێ و ڕۆژێ سێ تا چوار مسقاڵی لێ بخوا شەهوەت و ئارەزووی چوونە لای ژنی وا ئەبێ خۆی بە دەستیەوە دائەمێنێ. لەگەڵ ئەمەشا گورچیلە زۆر بەهێز ئەکات.

ئەگەر منال لە زگی ئافرەتا مرد تۆوی گێزەر لەسەر ئاگر بکوڵێنرێ و پاشان ئەو تۆوە لە ژێر ئافرەتەکەدا بسووتێنرێ و دووکەڵەکەی پیا بچێ منالەکەی ئەخا.



## لاولاو

لاولاو گیایەکە لە تۆ و ئەڕوێ و خێرا گەشە ئەکا، تەرز ئەهاویژێ، هەر دارو دەوەنێکی دەست کەوێ خۆی پیا ئەئاڵێنێ و ئەڕوا، گوڵێکی هەیە وەکوو شەیپوور وەیا چەتر، زۆرتر وەنەوشەییە، کە ئێوارە داهات دەم ئەکاتەوە، بەیانی کە هەتاو گەرم بوو وردە وردە دەم ئەنێتەوە بەیەکاو ئیتر دەم ناکاتەوە، کەوا بوو عومری چواردە سەعاتە، بەڵام کە ئەو نەما وە نەبێ گوڵ نەمێنێ یەکێکی تر لە تەنیشت ئەوەوە پەیدا ئەبێ، جۆری تێکڕایی بگری گوڵێکی زۆری هەیە و جوانییەك ئەدا بە باخی ماڵان، تۆوەکەش ڕەش و وردە لە بنیەوەیە.

یەکێ سەرێشەی دائمی هەبێ گەڵای لاولاو بخاتە سەری چاك ئەبێتەوە. گەڵای لاولاو لەگەڵ سرکەدا تێکڵاو بکرێ ئەو کەسەی سپڵی هەیە بیخوا بۆی باشە. لاولاو ئەسپێ ئەکوژێ...



## لۆبیا

لۆبیا گیاکەی وەکوو لاولاو وایە ئەپێچێ بەگیای تراو هەرشتێکی بەر پەلی کەوێ خۆی پیا ئەئاڵێنێ، گوڵێکی وردو وەنەوشەیی هەیە، ئەسڵی لۆبیاکە بەرەکەیەتی لەناو توێکڵێکایە وەکوو پاقلە..

خواردنی لۆبیا خەوی ناخۆش ناخۆش بە ئینسان ئەبینێ، بەڵام بۆ لەش خراپ نییە...

هەروەها ئافرەتێك منداڵ لە سکیا مردبێ لۆبیا بخوا منداڵەکەو لفەکەی فڕێ ئەدا. دیسان هەر بۆ ئافرەت خواردنەکەی کەڵکی هەیە بۆ ڕەوانی حەیز و ڕەوانی و خاوێنی خوێنی زەیسانی بۆی...



## لۆکە

لۆکە کە «پەموو»یشی پێ ئەڵێن، ئەسڵی خۆی گیایەکە بە تۆو ئەچێنرێ، گوڵی زەرد وەیا سووری هەیە، دانەکانی وەکوو لیف وایە بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەك درێژە، ئەوەیە کە ئەبێ بە لۆکە، کە دەنکەکان ئەبن و کاتی پێگەیشتنیان دێت قاوخەکەی کە گوێزەکەیەتی ئەقەڵشێتەوەو لێك ئەبێتەوە، لۆکەکە بە دانەکە وەیا تۆوەکەیەوە دێتە دەرەوە ئەکەوێتە ڕوو، ئەمجا ئەوانە ئەکەنەوەو کۆیان ئەکەنەوە، پاشان بەهۆی مەکینەو شتەوە دانەکەی لێ جیا ئەکەنەوە لۆکەیەکی خاوێن دێتە بەرهەم و بۆ گەلێ شت ئیتر بەکاری دێنن.

ئەگەر مناڵ سکی ئەچوو گەڵای بڕکی لۆکە ئاوەکەی بگرن و بیدەنێ سکی ئەوەستێتەوە.

لۆکە ئەگەر نەرم بوو لەپاش ئەوە کە کرا بەشت و لەبەر کرا لەش نەرم ئەکا، ئەگەر خۆ زبری تێدا هەبوو لاوازی ئەکا، لۆکە بخرێتە ناو سوخمەو کەواو شتەوەو لەبەر بکرێ جگە لەوە کە کابرا لەسەرما ئەپارێزێ هەر لە تەبێعەتەکەیا کەڵکی‌تر هەیە.

توێکڵی قاوخەکەی، واتە ئەو توێکڵە کە لۆکەکەی تیایە بسووتێنرێ یەکێ دەم و پووکی بووبێ بە برین لێ بنرێ چاکی ئەکاتەوە.



## ماش

ماش دانەوێڵەیەکە خڕو وەکوو نیسك وایە، پێستەکەی سەوزو ناوەکەی سپییە، ئەکرێ بەچێشت و ئەخورێ، لە وڵاتی بانەو سیوەیل زۆرە. لەسەر ماش قسەیەکی ئەو وڵاتە هەیە کەجارێ دوو پوورزا تووشی یەك ئەبن یەکێکیان بەویکەیان ئەڵێ: «پوورزا گیان ئیمساڵ ماشانو هەبوون؟» ئەویش وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێ: «پوورزا گیان ماشانو هەبوون بەڵام هەمووی خۆن خواردن!».

خواردنی ماش شەهوەت کەم ئەکاتەوە. ئەندامێك لە لەشا ژان بکا ماشی لێ بنێن ژانەکەی ئەشکێنێ. هەروەها خواردنی ماش ددان بێهێز ئەکات..



## مەرزەنگۆش

مەرزەنگۆش کە «مەرزەنجۆش»یشی پێ ئەڵێن گیایەکی بۆنخۆش و لقی بەرز بەرزی هەیە، گەڵاکەی باریك وەکوو گوێچکەی مشك وایە، گوڵی سپی مەیلەو سووری هەیە، تۆویشی هەیە وەکوو تۆوی ڕەیحانە وایە. یەکێ ژانەسەر وەیا ناوەڕاستی مێشك و سەری ژان بکا مەرزەنگۆش بۆ ئەو دەردە زۆر باشە...

یەکێ ئیسقا وەیا ژانەسك وەیا بە زەحمەت میز بکا مەرزەنگۆش بکوڵێنن و بیدەنێ چاکی ئەکاتەوە...

یەکێ دووپشك پێوە بدا مەرزەنجۆش تێکڵاو بەسرکە بکرێ و بنرێ لەشوێنەکە چاکی ئەکاتەوەو ژانی ناهێڵێ...

یەکێ زەردەواڵەو شەنگەسوورە پێوەی بدا بەئەندازەی کەمتر لە مسقاڵێ لە تۆوی مەرزەنگۆش بدرێ بەو کەسە بیخوا ژانی ئەشکێ و زەهرەکەی کاری تێ ناکا. ئەگەر یەکێ ئیفلیج بووبێ ڕۆنی مەرزەنجۆش بگرن و لەشی پێ بهەنوون بۆی باشە....

یەکێ دەمی تێك چووبێ، واتە ناو دەمی وەکوو ڕەش بووبێتەوە مەرزەنجۆشی وشك لەگەڵ هەنگویندا تێکڵاو بکاو بیگرێتە دەمی چاکی ئەکاتەوە.



## نەسرین

نەسرین گوڵێکی سپی بچووکی پەڕە زۆری بۆن خۆشە، نەسرین زۆرتر ئەوانەی کە گوڵ و باخچە بەخێو ئەکەن ئەویشی تیا ئەچێنن باخەکەیان بەو جوان ئەکەن.

یەکێ ئەگەر کرم لە گوێچکەیا بوو، وەیا گوێـی ئەزرینگایەوە، وەیا سەری گێژی ئەخوارد نەسرینی باخی بۆ ئەو کەسە باشە، کرمەکە ئەکوژێ و ئەوانی‌تریش لائەبا... هەروەها ئەگەر دەم و ددان هاتە ژان نەسرینی تێ گرێ چاکی ئەکاتەوە... یەکێ ژانەسەری دائمی هەبوو نەسرینی کێوی بگرێتە ناو چەوانی لەکۆڵی ئەخا... هەر ئەم نەسرینی کێویە بۆ نەهێشتنی نزگەرەش زۆر بەکەڵکە...



## نەعنا

نەعنا تەڕەیەکە وەکوو پوونگە بەڵام گەڵای ئەم واتە نەعنا ساقەتەکەی بەرزترە، بۆنێکی خۆشی هەیە، لەو تەڕانەیە کە بە تەڕی لەگەڵ کەباب و شتا ئەیخۆن، وشکیش ئەکرێتەوە و ئەیکەنە ناو چێشت بۆ بۆن‌خۆشی...

نەعناخواردنەکەی «معدە» بەهێز ئەکا، هێزی چوونە لای ژن زیاد ئەکا...

یەکێ نزگەرە بیگرێ نەعنا بخوا لە کۆڵی ئەخا.. ئافرەت ئەگەر پێش ئەوە لەگەڵ مێردەکەی بنوێ نەعنا وەکوو شاف هەڵبگرێ سکی پڕ نابێ. یەکێ ژانەسەری هەبێ نەعنا بگرێتە سەری ژانە سەرەکەی نامێنێ. یەکێ سەگی هار گرتبووی ئاوی نەعنا لەگەڵ سرکەدا تێکەڵاوی کا و بیخواتەوە نایەڵێ ئەو خوێنەی کە کەڵبەی سەگەکە لە لەشیا پەیدای کردووە بڵاو ببێتەوە بە لەشیا... هەروەها ئەم ئاوی نەعنایە لەگەڵ سرکەدا شەهوەت ئەجووڵێنێ، «معدە» بەهێز ئەکاو نزگەرە ئەنیشێنێتەوە.



## نۆک

نۆك بەری گیایەکە کە گیاکە لەسەر یەك بنج هەڵئەستێ و پاشان لق‌لق ئەبێتەوە، گەڵاکەی زۆر زڵ نییە، خۆیشی زۆر لەزەوی بەرز نابێتەوە، ئەچێنرێ، بەفەریکی ئەخورێ، واتە نۆکەکە،

ئەم نۆکەش دوو جۆرە؛ ڕەشی هەیەو سپی هەیە، پاش ئەوە کە وشك کرایەوە ئەکرێتە ناو چێشت، جۆرێکی‌تری هەیە وردترە، ئەمە ئەیکەنە هارەکرِدا کەرت ئەبێ پێ ئەڵێن لەتکە نۆك، ئەمەش هەر ئەکرێتە ناو چێشتەوە، هەر ئەم جۆرەیانە ئاجیل‌فرۆشەکان بۆنی ئەدەن و ئەیبرژێنن، نەرمێکی تورتی بە لەزەتی لێ دەرئەچێ و پێی ئەڵێن نۆکە قەنی، هەر ئەمە بەشەکریش بۆنی ئەدەن...

خواردنی نۆك ڕەنگ و ڕوو جوان ئەکا بەڵام بادارە، هەروەها ئاردەکەش بە دەموچاودا بهێنرێ جوانی ئەکا... ئەو نوختە ڕەشانەی کە لەسەر پێست پەیدا ئەبن و وان بەلەشەوە بەنۆك بیهەنوون لای ئەبا...

خواردنی نۆك بە فەریکی بۆن لەدەما پەیدا ئەکا... یەکێ وشکە بیرۆی هەبێ ڕۆنی نۆك بگرێ و لێی دا چاکی ئەکاتەوە نۆك بکرێتە ئاوو بخورێ ددان کە ژان بکا چاکی ئەکاتەوەو دەنگیشی ساف ئەکات...

نۆك بکوڵێنرێ و بخورێ منالی مردوو لەسکی ئافرەتا دەری ئەکاو بۆ پیاویش هێزی چوونە لای ژنی زیاد ئەکا، خۆ ئەگەر بەکوڵاوی خۆی و ئاوەکەی لەخورێنی پیاو بیخوا ئەو هێزی شەهوەتەی زۆر زیاد ئەکا...



## نێرگس

نێرگس گوڵێکی سپی بچووکی بۆن‌خۆشە، ساقەتەکەی بەرزە گەڵاکەی سەوز و درێژە، ساقەتەکەی بەرز بووەوە لقی بچووکی لێ ئەبێتەوەو لەو لقە گوڵەکە پەیدا ئەبێ، پەڕەکانی سپی و ناوەکەی زەردە وەکوو تۆو وایە، سەلکێکی هەیە ئەوە ئەچێنرێ. نێرگسی دەشتەکی هەیە و باخی ماڵی هەیە، ماڵیەکەی ئەو سەلکەی ئەنێژرێ بەڵام دەشتەکیەکەی لەناو مێرگەکانا و لە بەهارانا پەیدا ئەبێ، چاوی دۆستیش پێ ئەڵێن نێرگس.

ئەڵێن هەرکەس لەوانەیە لەبەینی سینگ و دڵیا گەرایەکی بچکۆلەی شێتی وەیا

بەڵەکی وەیا گولی هەبێ، هیچ ئەو شتانە لانابا بۆنکردنی نێرگس نەبێ... ئەگەر سەلکی نێرگس وەکوو خاج ببڕن وەیا دوو درك بە ڕاستە و چەپەدا پیاکرێ و ئەمجا بنێژرێ نێرگسێکی زۆر بەهێز پەیدا ئەبێ. ئەڵێن ئەگەر یەکێك لەو کاتەدا کە لەگەڵ ژنەکەیا دروست ئەبێ چاوی بکەوێ بەسەلکی نێرگس ئەو کەسە ئەبەسترێ و ئیتر هیچی پێ ناکرێ. سەلکی نێرگس بخرێتە سەر برین گۆشتەو زوون دێنێتەوەو چاك ئەبێتەوە.. ئەو پەڵە سپی و ڕەشانە کە لەسەر لەش پەیدا ئەبن گوڵی نێرگسیان لێ بنرێ لایان ئەبا...

هەروەها بۆ ژانە سەری دائمیش باشە... خواردنی نێرگس ڕشانەوە بە پیاو پەیدا ئەکا...

ئافرەت کە منالی لەسکا مرد بە ئەندازەی سێ مسقاڵ نێرگس لەگەڵ ئاوی هەنگوین تێکڵاو بکاو بیخوا مناڵەکە ئەخا...

## نیسك



نیسك بەری گیایەکە کە بنەکەی پچووکەو ئەوەشێنرێ، دەنکەکەی تۆزێ لەماش گەورەترە، ڕەنگەکەی سپیەکی مەیلەو زەردە، بەلام کە توێکڵەکەی لێ کرایەوە ئەو ڕەنگەی بەو جۆرە نامێنێ، جۆرێکی‌تری هەیە پان کارە توێکڵەکەی لائەبرێ ڕەنگەکەی سووری مەیلەو زەردە، لەسەر ئەمەیە کە کورد پەندێکی هەیە ئەڵێ:

**«وەکوو نیسك وایە بەروپشتی بۆ نییە!»**

نیسك ئەکرێ بە چێشت و ئەخورێ، نیسك لەگەڵ هەر شتێکا تێکڵاو بکرێ لەگەڵیا ڕێ ئەکەوێ، ئەگەر بتەوێ لەچاندندا زوو پێ بگا بیخەرە ناو شیاکەی گاوەو پاشان بیچێنە زۆر زوو پێ ئەگاو ئەڕوێت.

خواردنی نیسك ڕەحەتییەك ئەدا بەلەش و ئینسانیش ئامادە ئەکا بۆ بەربەرەکانی لە قسەدا.

زۆر خواردنی نیسك لەوانەیە ئینسان تووشی گولی و تاریکایی چاو بکا... خواردنەکەی خەوی هەڵیت و پەڵیت بە مرۆڤ ئەبینێ.



## وەنەوشە

وەنەوشە گیایەکە لە بەهارانا لەپێش هەموو گیایەکا ئەڕوێت، گۆڵێکی بۆن‌خۆشی شینی هەیە، گیاکەی هەندێ بەرز ئەبێتەوە، لق لە ساقەتەکەی ئەبێتەوە لەسەر ئەو لقەوە گوڵەکە دەرئەچێ، زیاتر لە مێرگیشا پەیدا ئەبێ، گەلێ بۆنی خۆش لەوەنەوشە وەر ئەگیرێت.

یەکێ وەناقی بێ گوڵی وەنەوشە لەگەڵ ئاودا تێکڵاوی کاو بیخوا بۆی باشە. ژانە سەرێ کە لە خوێنەوە پەیدا ببێ بۆنی وەنەوشە بکا وەیا بیهێنێ بەسەریا بۆی چاکە...

یەکێ هەڵامەتی بێ بۆنی وەنەوشە نەکا چاکە چونکە زیاتر پەرەی پێ ئەستێنێ..

یەکێ وشکە بیرۆی هەبێ ڕۆنی وەنەوشە بگرێ و لێ بدا چاکی ئەکاتەوە..



## هەزبیە کێویلە = سقر

هەزبیە کێویلە کە «مەرزە»شی پێ ئەڵێن بەکوردی و بەعەرەبی «صقر = سقر»ی پێ ئەڵێن، گیایەکی دەشتەکییە، گەڵایەکی وردو گوڵەکەی مەیلەو شینە، تامێکی توند و بۆن‌خۆشی هەیە، ئەم هەزبییەیە لە پزیشکیدا بۆ نەخۆشی سی زۆر بەکار ئەهێنرێ. هەزبییە لە باخەماڵیەکانیشا بە خێوی ئەکەن، زیاتر هی باخییەکان پیان ئەڵێن مەرزە.

یەکێ ددانی ژان بکا، وەیا کرمی هەبێ، وەیا قورحەی هەبێ مەرزە بجوێت بۆ هەمووی باشە.. یەکێ مار پێوە بدا هەزبیە کێویلەی بخەنە سەر ژان و ژاری لائەبا، هەر لەبەر ئەمەیە گەلێ لە حەیوانی کێوی کە مار پێوەی ئەدا خێرا ئەچێ ئەو هەزبیە کێویلەیە ئەخوا، بەتایبەتی ژیشك و مووشی خورما کەشەڕ لەگەڵ ماردا ئەکەن و مارەکە ئەگەر دای پیانەوە پەلاماری هەزبیە ئەدەن.



## هێرۆ

هێرۆ کە «هەرمەڵە»شی پێ ئەڵێن گیایەکە ساقەتەیەکی بەرزو ئەستووری هەیە، لەوانەیە دووگەز بەرز ئەبێتەوە، گەڵاکەی پان و زلە، گوڵەکەی شەیپوورییە، گوڵ و ڕیشە و هەمووی لە بزیشکیدا بەکارئەهێنرێ. گوڵەکەی سووریش دەرئەچێ و سپیش دەرئەچێ...

یەکێ ئەگەر پەڵە پەڵە سپێتی لەسەر ڕوومەتی پەیدا بوو وە ئەمەش جیایە لە بەڵەکی، بەم نەخۆشییە ئەڵێن «بەهەق» جا ئەگەر یەکێ ئەمەی هەبوو بەم هێرۆ و بەسرکە ئەوانە بهەنوێ و لەبەر هەتاو دانیشی چاکی ئەکاتەوە.. گوڵی هێرۆ لەگەڵ کبریت تێکڵاو بکرێ و بدرێ لە خەنازیر ئەیرەوێنێتەوە. خەنازیرloوییێکە کە لەبەینی پێست و گۆشتدا پەیدا ئەبێ و سەخت ئەبێتەوە، ئەمە زیاتر لە گەروو و ملدا ئەبێ.

یەکێ بەزەحمەت میزی ئەکرد وەیا ئافرەتێك بەگران منالی ئەبوو و منالەکەی لێ ئەبووەوە هێرۆ بکوڵێنن و لەو ئاوەی بخۆنەوە ڕزگاریان ئەبێ لە دەردەکەیان...

یەکێ دووپشك وەیا مار پێوەی دا بوو گەڵای هێرۆ لەگەڵ کەوەر بکوتن و لێی بنێن ژان و ژاری نامێنێ... خواردنی بە ئەندازەی مسقاڵێك لە ئاوی هێرۆ زۆر بەکەڵکە بۆ کۆڵنج..

ئافرەت وەیا پیاو مووی سەری بە هێرۆ بشوا نەرمی ئەکا و بە کەڵکە بۆی... یەکێ تووشی گەڕی بوو بە هێرۆ بیهەنوێ چاك ئەبێتەوە...




## هەلیلە

هەلیلە بەری دارێکی گەورەیە کە زیاتر ئەم دارە لە هندستان ئەبێت، دارەکە گەورەو گەڵاکەی باریك و درێژە، بەرەکەی وەکوو هێشو وایە دەنکەکەی بەئەندازەی مێوژێك ئەبێ، ڕەنگی زەرد وەیا ڕەشە، لە گەلێ داو دەرمانی پزیشکیدا بەکار ئەهێنرێ.



## هەلیلیون

هەلیلیون بەکوردی «مارگیا» و «مارچێو»ی پێ ئەڵێن، گیایەکە درێژو ئەکشێ بەسەر زەویدا، هەر شتێکیشی دەست کەوێ خۆی پیا ئەئاڵێنێ، ئەم گیایە وەکوو گەڵای هەیە تۆویشی هەیە، لەکێویشا ئەبێ و لە دەشتیشا، تەرزی ئەم گیایە وەکوو مار پێچ پێچە...

یەکێ پشتی ژان بکا وەیا کەژۆك ـ عرق النسا ـ ی هەبێ گەڵای مارچێو بکوڵێنێ و ئاوەکەی بخواتەوە چاك ئەبێتەوە. هەروەها هەلیلیون بۆ کۆڵنج باشە. یەکێ ژانی پشتی هەبێ، وەیا بەگران میز بکا، وەیا ئافرەتێك بەزەحمەت منالەکەی لەکاتی منالبووندا لێ ببێتەوە ئەمانە ڕیشەی مارگیا بکوڵێنن لەگەڵ خودی گیاکەدا و ئاوەکەی بخۆنەوە بۆ هەموویان باشە. هەروەها زۆر بەهێزیشە بۆ چوونە لای ژن و بۆ زیادبوونی ئاوی مەنی. تۆوەکەی بنرێ لە ددانێ کەژان بکا باشە.. زۆر خواردنی ئەم هەلیلیونە زیان بە معدە ئەگەیێنێ و ڕەوانیش دێنێ، خوێنی حەیزیش زیاد ئەکا.



## هیلوفەڕ

هیلوفەڕ وەنەبێ ئەم وشەیە زۆر باوی هەبێ بەڵکوو ئەسڵ و ڕاستیەکەی «نیلوفەڕ»ە، هیلوفەڕ وەنەبێ شێوەیەکی ڕەوان بێ. نیلوفەڕ گیایەکە لەناو دەریاچەو گۆمی گەورەی ئاو لێ نەبڕاوە پەیدا ئەبێ، بنکەکەی لەزەوی بنئاوەکەوەیە، سەرەکەی ئەگاتە لێواری ئاوەکەو گوڵ ئەکا، هەتا ئاوەکە بەرز ببێتەوە ئەویش بەرز ئەبێتەوە گیایەکی بۆن‌خۆش و گوڵێکی جوانی وەنەوشەیی تۆپ تۆپی هەیە، هەندێك لەم نیلوفەڕە بە ڕۆژ گوڵەکەی چاو ئەنێ بەیەکاو بەشەو ئەپشکوێتەوە.

ئەم نیلوفەڕە خەو لە ئینسان ئەخاو بۆ ژانەسەری گەرمی دایمی زۆر باشە بەڵام

ئاوی مەنی ئەوەستێنێ و ئارەزووی چوونە لای ژن زۆر زۆر کەم ئەکاتەوە. تۆوەکە یەکێ بەڵەکی هەبێ لەگەڵ ئاودا تێکڵاوی بکاو شوێنەکەی پێ بهەنوێ چاکی ئەکاتەوە، بەڵام کە بخورێ هیچ ئارەزووی چوونە لای ژن ناهێڵێ... یەکێ مووە ڕێـزە ـ داء الثعلب ـ ی هەبێ تۆوی نیلوفەڕی بخاتە سەر ئەو دەردەی نامێنێ و شوێنەکە مووی لێ ئەڕوێ بەبێ هەڵوەرین..

◈◈◈

# بارسایییەکانی سروشتی و کانەکان

مەبەست بە بارسایییەکانی سروشتی ئەجرامی کەونی وەکوو مانگ و ڕۆژو ئەوانەو بە کانەکانیش ئەو «معادن» و شتانەن کە لە زەویدا هەن. ئەم شتانە هەموو هەر یەکە جۆرە سروشتێك و چەشنە چاکەیەکی تێدایە کە لەیەکێکی‌ترا نییەو ئادەمیزاد بە جۆرێکی لارێگە و ڕێگەدار کەڵك لەهەموویان وەرئەگرێ. ئادەمیزاد گێتییەکی بچووکە، چی لەگێتی و کەونە گەورەکەدا هەیە لە ئادەمیزادەکەشا هەیە، ئەو کانانە کە لە زەویدا هەیە لە لەشی هەموو تاقە ئادەمیزادێکیشا هەیە؛ ئادەمیزادێك بتوێنەرەوە، لە پاشان سەیری خڵتەکەی بکە تەماشا ئەکەی ئەم خڵتەیە بریتییە لە ئاسن، لە پۆڵا، لە گۆگرد، لە ئاڵتوون، لەزیو، لە ئاسن‌کێش... هتد. کە وابوو ئادەمیزاد گێتییە گەورەکەیە و گێتییە گەورەکەش گێتییە بچووکەکەیە کە ئادەمیزادە!.

جا لەبەر ئەمانە پێویستە تۆزێ قسە لەو بارسایییە سروشتیانەو لە هەندێ لەو کانانە بکەین بۆ ئەوە بزانین چ چاکەیەکیان تێدا هەیەو بۆ ئەوە بزانین ئەم ئادەمیزادە چ نوختەیەکی جەوهەرییە بۆ ئەم کەون و گێتییە گەورەیە کەوا ئەمانە هەموو بۆ ئەم ڕاوەستاون و ئەمیش تا ئەندازەیەك توانیویە لە گەمێکی زۆر کەم لە سروشتی ئەوانە بگات.



## مانگ

مانگ لە زمانی کوردیدا بەو بیست و نۆ یا سی ڕۆژە ئەڵێن کە لە بەینی مانگی یەك شەوەی یەکەم و مانگی یەك شەوەی مانگی دواییدایە، وەبەم هەیکەلە ڕووناکییەش ئەڵێن کە لە ئاسمانەوە بەشەوی مانگە شەو دیارەو لەبەر چاو

ئێمەوە بە ئەندازەی سینییەکە بەڵام لە ڕاستیدا ئەم کورەی زەوییە بکەی بە «٦» کەرتەوە مانگ بە ئەندازەی کەرتێکیە.

مانگ لە هەموو بارساییەکانیتر نزیکترە بە زەوی، نزیکەی سەد و بیست هەزار فرسەخ لە زەوییەوە دوورە. ڕەنگی خۆی کاڵێکی مەیلەو ڕەشە، ڕووناکی لە ڕۆژ وەرئەگرێ، بە دەورەی زەویدا ئەسووڕێتەوە، لەبەر ئەوە کە زەوی وەکوو تۆپ خڕە کە لە پلەکانا زەوی ئەکەوێتە بەینی ئەو و ڕۆژ لەکاتی گەڕانی مانگەکەدا وێنەی مانگ وەکوو سەرە نینۆك وەیا دەمەداس دەرئەچێ لە یەکەم شەودا پاشان بەرە بەرە لەگەڵ گەڕانەکەدا زل ئەبێ چونکە زەوی ڕێگای بۆ چۆڵ ئەکا بۆ وەرگرتنی ڕووناکییەکەی لە ڕۆژ، تا پڕ ئەبێتەوەو ئەبێ بە وەکوو سینییەکی پان و خڕ ئەمجا دەست ئەکاتەوە بە کەمبوونەوە تا هەمووی ون ئەبێ و ئەچێتەوە سەری مانگی تازە. لە مانگدا هەندێ شت هەیە بە ئەندازەی دەسەڵات لێرەدا چمکێکی باس ئەکەین:

ئەمە چۆنیەتییەك بوو لە مانگدا کە تا ئێستە زانیاریی ئادەمیزاد پێی گەیشتبوو بە بێ ئەوە کە چووبێتە ناویەوە کەچی لە ڕۆژی دووشەنبەی «٢١ / ٧ / ١٩٦٩»دا سێ کەسی ئەمەریکی بەناوی «ئەرمسترۆنگ» وە «درین» و «کولینز» بەهۆی کەشتیی ئاسمانییەوە لەوێنەی جاڵجاڵۆکەدا لەسەر مانگ نیشتنەوە!

لەسەر قسەی ئەمانە مانگ ڕەنگێکی وای نییە، زیاتر ڕەنگی بەلای ڕەنگی خۆڵەمێشدا ئەڕوانێ. وایان بۆ دەرکەوتووە کە تەپۆڵکەی بەردینی تێدا هەیە، زۆر بەردی وای تێدا هەیە وەکوو «کێل» وانە سەرەکانیان تیژە، لەبەینی دوو تا سێ مەترەدا بەرزن، کە لەسەر مانگ نیشتوونەتەوە وەکوو یەکێك پێی بنێ بەسەر خۆڵەمێشدا چۆن شوێنی پێی کەی چاڵ ئەکەوێ ئەمانەش وابوون. هەوایان لەگەڵ خۆیان بردووە بۆ هەناسەدان چونکە هێشتا دەرنەکەوتووە هەوای بۆ ژیان تێدا هەیە. بەهۆی ئالاتەوە قسەیان لەگەڵ ئەرز کردووە.

هێزی ڕاکێشان و جازبیەت لە مانگدا کەم بووە ئەمانە بە چوار چەمۆڵە ڕۆیشتوون بۆ ئەوە تەوەك بکەون گلۆر بینەوە. لەو سێ کەسە تەنها دوو کەسەی یەکەمیان چوونە سەر مانگ ئەوی سێیەم لەناو مەکینەکەدا مایەوە. لەوێ ڕەنگی ئەرزیان بەجوان و ڕووناك

هاتۆتە بەرچاو. لەپاش مانەوەی «٢» سەعات و «٢٥» دەقیقە و «١٤» ثانیە لەناو مانگدا گەڕانەوە بۆ زەوی. ماوەی چوونەکەیان لە ئەرزەوە تا گەیشتنە مانگ بەو مەکینەیە کە پێی چوون «١٠٢» سەعات و «٤٥» دەقیقەو «٤٢» سانیە بوو. ئەبێ ئەو مەکینەیە چەندە تیژ بووبێ لە ڕۆیشتنا تا بەو ماوەیە ڕۆیشتوون؟! هێشتا ئادەمیزاد بۆی دەرنەکەوتووە کە «مادە»ی مانگ چییە. ئەو دەستەیە لە ٢٤ / ٧ / ١٩٦٩دا گەیشتنەوە سەر زەوی. ئەم چوونە بۆ مانگ «٢٤» هەزار ملیون دۆلاری ئەمەریکی تێ چووە.

لەشی هەموو گیانلەبەرێك لە سەردەمی زیادبوونی مانگ و مانگەشەودا بەهێزترە لەو سەردەمەی کە مانگ لە کزیدایە. تەڕایی لەش و زیادبوون و گەشەکردنی لەو سەردەمەدا زیاترە کە مانگ لە زیادیدایە تا سەردەمەکەی تری. هەروەها ئەحوالی کشانەوەو چوونەوە یەکی دەریاو ڕووبارەکان، واتە «مد و جزر»یان لە زیاد و کەمی مانگدایە؛ مانگ هەتا لە زیادی بێ ئەو ئاوانە لەبەر یەك ئەکشێنەوە، لە پانزەی مانگ بە دواوە وردە وردە ئەچنەوە یەك. ئەوانەی کە لەسەر ی مانگ وەیا لە سەردەمی زیادبوونی مانگ نەخۆش ئەکەون لەشیان بەهێزترە بۆ بەرەنگاری نەهێشتنی نەخۆشییەکە تا ئەو کەسانە کە لە ئاخری مانگ وەیا لەکاتی کەمبوونەوەی مانگدا نەخۆش ئەکەون...

لە کاتێکا کە مانگەشەو لەناوە مووی گیانلەبەر زیاتر خەریکی گەشەکردن و ئەستوور بوون ئەبێ تا ئەو سەردەمە کە مانگەشەو لەناوا نییە...

لە کاتێکا کە مانگ و مانگەشەو دەست ئەکا بە زیادبوون مالات شیری زیاتر ئەبێ، مێشکی پڕتر ئەبێ، هێلکە سپێنەکەی لەو سەردەمەدا زیاتر ئەبێ، کە کەوتە مانگ لەکورتی دان، واتە لەدوای پانزدە بەدواوە ئەمانە وردە وردە پێچەوانەکەی ئەگرن.

ئینسان کە زۆر لەبەر مانگەشەو دابنیشێ لەشی خاو ئەبێتەوەو سەرێشەو هەلامەتی تیا زیاتر ئەبێ. هەروەها گۆشتی حەیوانات ئەگەر لەبەر مانگەشەو بەیاتە بکرێتەوە بێن پەیدا ئەکا. (لە زمانی کوردیدا «بۆن» بۆ خۆش و «بێن» بۆ ناخۆشە).

لە نێوەی یەکەمی مانگدا ماسی زۆرتر دەست ئەکەوێ لە ڕووبارو دەریاکانا تا نیوەی دووەمی مانگ وە قەڵەوتریشن لەو نیوەی یەکەمەدا تا نیوەی دووەم.

لە نیوەی یەکەمی مانگدا جڕوجانەوەر زۆرتر دەرئەچن تا نیوەی دووەم، ئەوانەشیان

کە پێوە ئەدەن زەهریان تیژترە تا هی نیوەی دووەم... دڕندەکان لە نیوەی یەکەمی مانگدا زیاتر بە شوێن نێچیردا ئەسووڕێنەوە تا نیوەی دووەمی مانگ..

مەترسی کەژو کێو لە دڕندە لەو نیوەی یەکەمەدا زیاترە لە نیوەی دووەمی.

دار ناشتنی ئەگەر لەسەر دەمێکا بوو کە مانگ لەزیادی بوو، واتە لە نیوەی یەکەمی مانگدا بوو ئەو دارە زووتر پێ ئەگاو بەری چاکتر ئەبێ لە کاتێك کە سەردەمی کەمبوونەوەی مانگ، هەروەها موتربەش هەر لەو سەردەمەدا چاکتر پەیوەست ئەبێ تا سەردەمێ کە مانگ ڕووناکییەکەی لەکەمبوونەوەدایە...

دانەوێڵەی تەڕی وەکوو نۆك و نیسك و شتە و گیاش لەکاتێکا کە مانگ ڕووەو پڕبوونەوە ئەڕوا ئەوانە زیاتر گەشە ئەکەن و ئاو ئەگرن و پڕ ئەبن تا کاتێ کە مانگ ڕووی لە کزییە...

میوە کە خەریکی پێگەیشتن ئەبێ ئەوانەی کە ڕووناکی مانگ لێیان ئەدا جوانترن لەوانەی کە ئەو ڕووناکییەیان بەر ئەکەوێ... قامیش و کەتان ئەگەر ڕووناکی و تیشکی مانگی نیوەی یەکەمی مانگیان لێ بدا بەهێز و پێزتر ئەبن لەوانەی کە تیشکی نیوەی دووەمیان لێ ئەدا، واتە شەوقی مانگەشەو بۆ ئەوانە زیانی هەیە.

## زەوی



زەوی یەکێکە لەو بارساییە کەونیانە کە لەم بۆشایی هەوادا بەهۆی ڕاکێشانی ڕۆژو قورسایی خۆی و لەنگەر گرتنی هەواوە ڕاوەستاوە. لە دوو گەڕانی دائمیدایە؛ یەکێکیان بە دەوری خۆیدا هەر بەبیست و چوار سەعات شەوو ڕۆژ دروست ئەکا، یەکێکیان بە دەوری خۆردا لە «٣٦٥» ڕۆژدا چوار وەختە دروست ئەکا.

جیاوازی ئەم لەگەڵ بارساییەکانیترا ئەوەیە کە ئەم خاوەنی هەموو جۆرە هۆیەکە بۆ ژیان و بۆ پێ گەیاندنی گیانلەبەرو دارو درەخت ئەوانیتر ئەمەیان تێدا نییە.

ئەم ئەرزە لە وێنەی تۆپدایە، سێ بەشی ئاوەو بەشێکی خاکە، هەموو مەساحەکەی «٢٠٠، ٤٨٠، ١٣٥» کێلومەترە.

لـە جوانیـدا ئـەم لە هەموو ئەستێرەکانی‌تر جوان‌ترە. ڕووناکی لـە خۆر وەرئەگرێ. ئەو شوێنە لەزەویـدا کە ئەبێ بەشـەو لایەکەی‌تری ئەبێ بە ڕۆژ. وەکوو چۆن لەزەوییەوە سەیری مانگ ئەکرێ لە یەکەم شەودا تا شەوی چواردە هەر شەوێك مانگ بەشکڵێك دەرئەچێ؛ لە دەمە داسـەوە تا پڕ ئەبێتەوە ئەگەر یەکێ بچێتە ناو مانگ و سـەیری ئەرز بکا ئەرزیـش وا دەرئەچێ؛ سـەرەتا لەدەمـە داسـەوە تا پـڕ ئەبێتـەوە، ئەوەنـدە هەیـە لـە کاتێکا کـە زۆر دوور لـە زەوییـەوە سـەیری ئەرز بکرێ ئـەم گەلێ جوانتر و شیرینترە لە جوانی مانگ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە مانگ هۆی ژیانی لە خۆیداو بۆ خۆی (حیویەتی) تێدا نییە، ئاوی تێدا نییە جوانییەکەی هەر ئەوەیە کە ڕووناکیی خۆر لێی ئەداو هەوای بەینی مانگ و خۆر دانەوەکە ـ ئینعیکاسەکە ـ ڕووناکتر ئەکاتەوە.

لە زەویـدا ڕووناکی خۆرەکە هەیە، هەواو بۆشایی بەینی کورەی خۆرو کورەی ئەرزەکە هەیە، ئاوی ناو ئەرزەکە هەیە. ئەمانە هەموو ئەبنە هۆی ئەوە کە جوانیی لە ئەرزدا زیاتر پەیدا ببێ تا لە مانگ وەیا ئەستێرەیەکی‌تردا.

هـەوا قلەتێکـە ـ جورمێکـە ـ زۆر تەنـك و شـەفاف، بارسـاییەکی هەیـە، ئەم بارساییە بەلای شینیدا ئەڕوانێ.

هـەوا هەرچەنـدە بەرهەڵستی - مەنعـی - بینین ئەکا بەڵام مەنعی دڕان و چوونەناو ناکا، لەبەر ئەم بەرهەڵستی نەکردنەی بۆ چوونە ناویـەوە شەفافیەکی هەیە لەکاتێکا کە ڕووناکییەکی تیژ ڕوو بـەڕووی بکرێتـەوە ئەو بارساییە کە کەوتۆتە ئەو دیوی هەواکـەوە بەجوانتر و پوختتر دێتـە بەرچاو. وەکـوو چـۆن ئاوێنەیـەك ڕوو بـەڕووی شتێك بکرێتەوە شتەکە لـە ئاوێنەکەدا چاکتر دەرئەکەوێ تا نەفسی خۆی، وێنەی هەواو ئەرزو خۆریش هەر وایە.

دیسان ئەوا کێوێکی بەرز لەدوورەوە ئەبینرێ، هەوا هەیە لە بەینی کێوەکەو لە بەینی ئـەو کەسـەدا کـە کێوەکـە ئەبینـێ کێوەکە مەیلەو شـین و بە شـەفافییەك دێتە بەر چاو. ئـەرزو هـەواو خۆرەکـەش ئاوایـە. کـە ڕۆژ نادا لـە ئەرزەکـە تاریکاییـەك پەیـدا ئەبـێ کـە ڕۆژەکـە لێیـدا ڕووناکییـەك هەیـە کە ئەو ڕووناکییە گەلێ جوانترە لـەو ڕووناکییە کە ئێمە

لەمانگ وەیا ئەستێرەیەکی‌تردا بەرچاومان ئەکەوێ. بەڵام ئەمە بە مەرجێك كە سەیری ئەرز بکەین لە شوێنێکی دوور لە زەوییەوە نەوەك هەر لەسەر زەوییەکەوە سەیر بکەین چونکە کە لەسەر زەوییەکە بووین ئەو هەستەمان پێ ناکرێ.

ئەم جوانییەش کە هەیە جگە لەوە مادەی ئەرز- کە خۆڵەکەیە -تا ئەندازەیەك بە هەوێنترە لە مادەی ئەستێرەکانی‌تر لەبەر ئەوە کەسێ بەشی کورەی ئەرزەکە ئاوەو ئاویش لەخودی خۆیا مادەیەکی شەفافە، کە ڕووناکی هەتاوی لێدا ئینعکاسەکە لە ئاوەکەدا ئەبێ چونکە ئاوەکە زۆرترە ئەو وەختە جوانییەکەی جوانتر ئەبێ لە جوانی ئەستێرەکانی‌تر، وە ئەسڵی مادەی خاك و ئاوەکەش لە ڕووی زانیاری فیزیاو ژیۆلۆژییەوە -زانیاری ئەجسامی تەبێعی و ئەرز ناسین- جارێ نەزانراوە کە چین و جەوهەرەکەیان چییە.

ئەم ڕووناکی تاوەش تا ئەگاتە زەوی «٨» دەقێقەو «١٣» سانیەی ئەوێ بە مەرجێ کە لەهەر سانیەیەکدا «٤ / ١، ٢٣٥، ١٨٨» میل ببڕێ. کە وابوو ماوەی بەینی کورەی زەوی و کوویرەی ڕۆژ «...، ٥٠٠، ٩٢» میلە.

مەدارەکە ئەوەندە گەورەیە لە ژمارە نایەت، «قوتەرە»کەی «١١٠» جار زیاترە لە قوتری ئەرز. لەناو ئەو مەدارەدا لە گەرمایی زیاتر هیچی‌تری تێدا نییە، جووڵانی ئەو مەدارە دەستی هەیە لە جووڵانی ئەستێرە گەڕۆکەکانی‌ترا، لە گەڕانی ئەو ئەوانیش هەندێ لە گەڕانیان بەهۆی ئەوەوە ئەبێ.

ئەو ئەستێرانە کە بە دەوری ڕۆژدا ئەگەڕێن: «عەتارد، زوهرە، ئەرز، مەڕیخ، موشتەری، زوحەل، ئورانوس، نبتون». لە هەموویان نزیکتر بە ڕۆژەوە «عەتارد»ە پاشان ئەوانی‌تر بەپێ ڕیزی ئەم نووسینە.

لە بەینی مەداری مەڕیخ و موشتەری‌دا زیاتر لە هەزار ئەستێرە ئەخولێنەوە لەو بەینەدا.

هەروەها جگە لەبەینی ئەو دوو مەدارە بە سەدها ئەستێرەی‌تر هەیە هەر بە دەورەی خۆردا ئەسووڕێتەوە.



# ڕۆژ

ڕۆژ لە زمانی کوردیدا بەو بەشە بیست و چوار سەعاتەی شەو و ڕۆژ ئەوترێ کە بەرانبەری شەوە و لەهەتاو دەرچوونەوە دەست پێ ئەکا تا هەتاو ئاوا بوون. وە ڕۆژ بەو کورە ئاگرینە وەستاوە بەرزە پڕ گەرمایی و سووتێنەرە ئەوترێ کە چاو ناتوانێ سەیری بکاو دنیاو ئەستێرەکانی‌تر ڕووناك ئەکاتەوە.

جا ئا ئەم ڕۆژە کوورەیەکی ئاگرینی بەرزەو شوێنی تایبەتی خۆی هەیەو وەستانێکی تایبەتی هەیە، سەرچاوەی ژیانی زۆرتر لەم هەست و نەستیەیە، ملیۆنێك و چوارسەد هەزار جار لەزەوی گەورەترە، سێ سەد هەزار جار لە زەوی قورسترە، دووریەکەی لەزەوی ئەوەندە دوورە کە تیشکەکەی بە ماوەی هەشت دەقیقە و سیانزە سانیە ئەگاتە زەوی. هەر سانیەیەکیش ٤ / ١، ٢٣٥، ١٨٨ میل ئەبڕێت.

ئەم کورەی ڕۆژە کورەیەکی خڕی وەکوو تۆپ وایە، ئەستووریdەکەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر سێ سەدو پەنجاو پێنج هەزارو حەفتاو چوار میلە. ئەم کورە گەورەیە بریتییە لە تەم و بوخارو ئاگر، بە درێژایی ساڵ لەناو خۆیا ئەتەقێتەوە، وەکوو چۆن دەستەبەرەیەکی داربەڕوو ئاگری پێوە بنی، پەیتا پەیتا ئەو دارانە ئەتەقێنەوەو پزیسکەیان لێ ئەبێتەوە، کورەی ڕۆژیش بەو جۆرە لەماوەی هەر تاقە سانیەیەکدا بە سەدها ملیار تەقەو پزیسکەی لەناو خۆیا لێ ئەبێتەوە، لەم تەقەو هەراو پزیسکەیە کورەی ڕۆژەکە دروست بووەو ئەمانە وەکوو ئەو زەڕە و گەردانە کە لەکاتێکا خۆرەتاو لە کولانچکەی سەر ژوورەوە بە جۆرێکی کۆڵەکەیی ئەچێتە ناو ژوورەکە، گەردەکان چۆن لەناو ئەو کۆڵەکە خۆرەتاوەدا دیارن کە لە جووڵان و هات و چۆدان پزیسکەو گەردە ئاگرینەکانی ناو کورەی ڕۆژیش بەو جۆرە لە هات و چۆیەکی دائمیدان و بەهێزی ئاگرینی هەموویانەوە ئەو کورە ئاگرینە دروست بووەو ڕووناکی ئەدا بە هەموو بارساییە گەڕۆکە هەواییەکان. لەکاتێکا کە ڕۆژ ئەگیرێ مانگ ئەکەوێتە بەینی ئەو و ئێمەوە و ئەو ڕووناکییە لە ئێمە ئەشارێتەوە.

ئەم کورە ئاگرینــە کــە ئەمـە سـەمەرەی بـوو هەنـدێ شتی تایبەتی تێدا هەیە کە لە بارساییەکانیترا نییـە ئێمـە لێرەدا تۆزێکـی زۆر کـەم لـەو شتانە باس ئەکەین، لەمـەوە مستێك ئەبێ بە نموونەی خەروارێك:

گەرمایـی ڕۆژ دەستێکی تـەواوی هەیـە لـە دروستبوونی باران و ئاودا، چونکە ئەو گەرماییـە ئـەدا لـە دەریاکان و هەڵمـی لـێ پەیـدا ئـەکاو ئەیبا بـە ئاسمانا تا ئەگاتە نهۆمی سـەرمایی لەوێـدا ئەبـێ بەباران و ئەڕژێتـەوە خوارەوە، لـەوەوە کانیـاو و ڕووبارەکان دروست ئەبن... لـە کاریگـەری گـەرمایـی ڕۆژەکە کانە هەمـە جۆرەکان دروست ئەبن.. چونکـە ئـەو خلّتانـە کە لەژێر ئەرزەوە تەبیعەتی ئەرزەکە دروستیان ئەکا ئاوی ئەو بارانە کـە لـە گـەرمایـی ڕۆژەکـەوە پەیدا ئەبـێ ئەو خلّتانـەی بەپێی شـایانی زەوییەکـە پێکەوە ئەشێلێ و لە ئەنجاما کانەکانی وەکوو زیوو ئاڵتوون و نەوت و گۆگرد... هتد پەیدا ئەبن.

بەهـۆی ڕۆژەوەیـە کاروباری گژوگیـا و دارو درەخـت، چونکـە ئەمانـە نایێنـە ئەنجام و پێ ناگەن ئەگەر بێت و ڕۆژ لێیان نەدا... هەر لە کارو باری ڕۆژە گورجوگۆلی و چالاکی گیانلەبەر، بە ئاشکرا ئەبینین لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ هەموو جۆرە گیانلەبەرێك چالاکی و بزێوییەکی هەیە کە ئەو چالاکی و بزێوییەی لە نیوەڕۆ بەدواوە تیا نابینرێ، کە شـەو هات ئەم گیانلەبەرانە لەگێتییەکیتری وادان هەر ئەوەندەیە کە مردن نییە... دیسان ئەو وڵاتانـە کـە زۆر نزیکـن بە ڕۆژەوە سـەیر ئەکـەی لە ڕەنگ و ڕوودا ڕەش و داگیرساو، لە ڕەوشتا وەکوو دڕندە، ئەو وڵاتانە کە دوورترن لەڕەنگی پێست و ڕوودا سپی و لە ڕەوشتا ڕەوشتێکی تا ئەندازەیەك لەسەرخۆیان هەیە...

دیسان بەهۆی کاریگـەریـی ڕۆژەوەیە پەیدابوونی زەوی و وشکانی لەسەر ئەم زەوییە، گەرمایـی ڕۆژ ئەکاتـە کارێ کـە وردە خلّتـی لێواری دەریاو دەریاچـەکان زیاد ببێ و یەك بگرێ و ببێ بە زەوی، لەسەر ئەم بڕوایە ئەم شوێنە ئەرزەی کە ئێستە من و تۆی لەسەر دانیشتووین ماوەی پێش مێژوو دەریا بووەو بووە بە وشکانی.

## تیر



تیر ئەستێرەی عەتاردە،لە هەموو ئەستێرەیەکی گەڕۆك نزیکترە بە ڕۆژ و لە هەمووشیان بچووکترە، ئەرز بکەی بە بیست و دوو کەرتەوە تیر بە ئەندازەی یەکێ لەو کەرتانەیە، ماوەی دەورو بەرەکەی نزیکەی هەزار و سەد و پەنجا میلە، ماوەی بارسایی ناوەڕاستەکەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر ـ قوترەکەی ـ نزیکەی دووسەدو هەشتا میلە، لە هەر بورجێکا بیست و حەوت ڕۆژ ئەمێنێتەوە، لە ماوەی هەشتاو هەشت ڕۆژدا جارێ بە دەوری خۆی و ڕۆژدا خولێك ئەخواتەوە، ڕەنگی بارساییەکەی دێز کارە، لەگەڵ ئەوەشا شایانی ئەوەیە کە رووناکی ڕۆژ تا ئەندازەیەك کاری تێ بکا، ماوەی مەدارەکەی سێ سەدو هەشتاو هەشت هەزارو هەشتاو دوو میلە، ماوەی گەڕان و سووڕانەوەی ئەم مەدارە ساڵێکە، لەپێش ڕۆژ هەڵاتنا وەیا لەدوای ڕۆژ ئاوا بوون ئەبینرێ.

## زوهره



زوهره کە یەکێکە لە ئەستێرە گەڕۆکەکان، زوهره «ناهید» و «ناهیدە» و «ئەناهید» و «نوس»ی پێ ئەڵێن، لەپاش «تیر» نزیکتر ئەستێرەیەکە بە زەوییەوە، وەکوو تیر پێش هەڵاتنی هەتاوو دوای ئاوابوونی ڕۆژ ئەبینرێ، بە دوو سەدو بیست و پێنج ڕۆژ جارێك بە دەورەی ڕۆژدا ئەسووڕێتەوە، گەورەیی زوهرە ئەرز بکەی بە سی و چوار کەرتەوە زوهره بە ئەندازەی کەرتێکیانە، ماوەی مەدارەکەی سێ هەزار و حەوسەد و نەوەدو پێنج هەزار میلە، ماوەی ناوەڕاستەکەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر واتە قوترەکەی چوارسەدو چل و نۆ میلە، لەهەر بورجێك بیست و حەو ڕۆژ ئەمێنێتەوە، بەلای هەندێ لە زانایانی

فەلەکییەوە زوهرە لە تیر گەورەترە...

زوهرە هەرکەس سەیری بکا دائما لە خۆشی و دڵخۆشی ئەبێ. ئەو کەسەی کە سەیری زوهرە ئەکا ئەگەر تۆی سیلی تێدا هەبێ ئەو تووە کز ئەبێ..

ئەڵێن تەبێعەتی زوهرە تەبیعەتێکی ئاهەنگ ئاوەرەو تەبیعەتێکە خۆش و یەکیەتی ئەدا، جا بەم بۆنەوە ئەگەر مارەبڕینی ژن و مێردێك بکەوێتە ئەو وەختە کە زوهرە لە حاڵی باشیدایە بەینی ئەو ژن و مێردە ئەوەندە خۆش ئەبێ هەر نەبێتەوە...



## کەیوان

کەیوان کە ئەستێرەی «زوحەل»ە، یەکێکە لە ئەستێرە هەرە گەورەکان کە لەپاش موشتەری لە هەموو ئەستێرەکان گەورەترە، نزیکەی حەوسەدو پەنجا ئەوەندەی زەوی ئەبێ، هەشت کورە مانگی هەیە، کەمەیەکی ڕووناکی و تیشك دەوری گرتووە، لە ماوەی بیست و نۆ ساڵ و نیودا سووڕێك ئەخواتەوە، ماوەی مەدارەکەی بیست و یەك ملیۆن و شەشسەدو سی و شەش هەزارو شەشسەدو شەش میلە، تەماشاکردنی ئەستێرەی زوحەل خەم و خەفەت دێنێ...

## بەهرام



بەهرام ئەستێرەی مریخە، ئەستێرەی بەهرام لە ئەرز بچووکترەو لەدوای زەوییەوەیە، دوو ئەوەندەی ئەستێرەی تیرو نیوەی ڕووناکی ئەستێرەی ئەناهیدی هەیە، ماوەی سووڕانەوەی ساڵێك و دە مانگ و بیست و دوو ڕۆژە، لەوێنەو تەشکدا هەر وەکوو ئەستێرەی مانگ و ناهید وایە، ماوەی بەینی مەدارەکەی

ـ مەبەست بەماوەی بەینی مەدارەکەی ئەو بۆشاییی و بایەیە کە بەهۆی تەوژمی ئەووە ئەجوولێتەوەو ئەسووڕێتەوە. بیست ملیۆن و حەفتاو شەش هەزار و نۆسەدو نەوەدو هەشت میلە، ماوەی بارساییەکەی خۆی نزیکەی ئەوەندەو نیوی زەوییە، ئەستووری بارساییەکەی نۆسەد هەزارو هەشت سەدو هەشتا و پێنج میلە، ئەگەر بەراست بڕوا لەهەر بورجێکا چل ڕۆژ ئەمێنێتەوە.

## بەرجیس



بەرجیس ئەستێرەی «موشتەری»یە، ئەستێرەی موشتەری وەکوو «بەرجیس»ی پێ ئەڵێن «هورموز» و «ژووپیتەر»یشی پێ ئەڵێن، ئەم ناوانە لە پەهلەوی کۆندا هەن کە بناغەی زمانی کوردی ئێستەیە، بەرجیس گەورەتر ئەستێرەیەکە لەپاش ڕۆژ، بەچاو ئەستێرە ڕووناکی نەدەرەکانەوە بۆ ڕووناکی لە پلەی دووەمایە، پلەی یەکەم تیرە و پلەی دووەم ئەم، نزیکەی هەزارو دووسەد و سی ئەوەندەی زەوی ئەبێ، چوار مانگی هەیە، جازبیەتێکی زۆری هەیە سەیرکردنی ئەستێرەی بەرجیس خۆشی و ئاهەنگ دێنێ..

## دوو قوتبە

مەبەست بە دوو قوتبە ئەو دوو ئەستێرەیەیە کە لە ئەم سەرو ئەوسەری زەوییەوە دەر ئەکەون و پیان ئەڵێن قوتبی شیمالی و جەنووبی. قوتبی شیمالی حەو ئەستێرەی چکێ گەشی ڕێکوپێك دەوریان داوە کە بەم حەو ئەستێرەیە ئەڵێن «بنات النعش»، لەگەڵ ئەمانەشا زۆر لە وردە ئەستێرەی‌تر هەیە بە دەورەیەوەن، کە ئەم وردانە بە هەموویانەوە وێنەی ماسیەکیان دروست کردووە، ئەستێرەی قوتبەکەش خۆی زۆر گەشەو لەو سەریانەوەیە.

ئەم ئەستێرەی قوتبی شیمالییە یەکێ ژان و دەردێك لەچاویا بێ لە شەوی یەك

شەنبەدا، لەپاش ئەوە ڕۆژئاوا ئەبێ بە دوو سەعات، بەرانبەر بەو ئەستێرەی قوتبە بووەستێ و سەیری بکا، لەو کاتەدا میلێکی زیویش بکا بە ئاوی گوڵاودا و بیهێنێ بە چاویا و سەیری ئەستێرەکە بکا هەر ژان و دەردو تانەیەکی هەبێ لائەچێ...

ئەڵێن شێرو بەورو پڵنگ کە نەخۆش ئەکەون بەرانبەر بەم ئەستێرەی قوتبی شیمالییە ڕائەوەستن و سەیری ئەکەن چاك ئەبنەوە. هەروەها دێڵەشێر لەکاتی منالْبوونیا زۆر عەزیەت ئەبینێ، لەوانەیە لەبەر ژان و ئازار بمرێ، کە شەو هات دێتە سەر ڕووبارێکی گەرم وەیا کانیاوێکی گەرم و ئەچێتە ناوی، ڕوو بە ڕووی ئەستێرەی قوتبی شیمالی ڕائەوەستێ بەپێوە، ئەچێتە شوێنێکی کە ئاوەکە بگاتە ئەژنۆی، بەو جۆرە سەیری قوتب ئەکا لەو ژان و ئازارە ڕزگاری ئەبێ...

بەرانبەر بە قوتبی شیمالی لەم لاوە قوتبی جەنووبی هەیە، ئەمیش چەند ئەستێرەیەکی بە دەورەوەیە لەگەڵ ئەستێرەی سیوەیلدا، ئەو دووری و نزیکییە و ئەو مەدارانە بۆ قوتبی شیمال هەیە بەرانبەر بە زەوی چەشنی شتە بەرانبەر بە قوتبی جنووبیش، ئەوەندە هەیە هەندێ شت بۆ ئەم قوتبی جەنووبییە هەیە بۆ شیمالییەکە نییە، وەکوو:

هەر گیانلەبەرێکی مێچکە لەکاتی منالْبوونیا ئەگەر منالەکەی بەزەحمەت لێی ئەبووەوە سەیری ئەستێرەی قوتبی جەنووبی و ئەستێرەی سیوەیل بکا بەئاسانی منالەکەی لێ ئەبێتەوە، لە گیانلەبەری دەشتەکیدا ئەمە گەلێ جار تاقی کراوەتەوە... ئەگەر یەکێ بەبێ ئەوە دەرمانی خواردبێ شەهوەتی نەمابوو چەند شەوێ لەسەر یەك سەیری قوتبی جەنووبی بکا ئەو شەهوەتەی بۆ پەیدا ئەبێتەوە...

ئەگەر یەکێ تووشی ماخوولان بووبوو سەیری ئەستێرەی قوتبی جەنووبی و ئەستێرەی سیوەیل بکا لەسەر یەك ڕزگاری ئەبێ لەو ماخوولانە... ئەگەر یەکێ بیکا بە ڕەوشت هەموو دەم سەیری قوتب و ئەستێرەی سیوەیل بکا دائیمەن کەیف خۆش ئەبێ..

ئەگەر یەکێ پەردە بەسەر چاویا کشرابوو، لەشەوی سێشەنبەوە دەست پێ بکا پڕ بەچاو سەیری ئەستێرەی قوتبی جەنووبی و ئەستێرەی سیوەیل بکا، بەم جۆرە هەموو شەوێ دەوامی لەسەر بکا پەردەکە لەسەر چاوی نامێنێ.

## باوەڕێکی‌تر بەرانبەر بە ڕۆژ و قوتب

کورەی ڕۆژ لە باوەڕێکی‌ترا شتێکی خڕی وەکوو تۆپە، لەناو خۆیا هەموو وەکوو پزیسکی ئاگرە، ئەم پزیسکانە بە یەکا دێن و ئەچن و ئەتەقێنەوە، لەهەر دەقیقەیەکا گەلێ ملیۆن تەقینەوە لە ناو ئەو کورەیەدا دروست ئەبێ، لەم پزیسکانەو لە تەقینەوەی ئەم پزیسکانە ئەو کورە گەورە سووتێنەرە پەیدا بووە، ملیۆنێك و چوار سەد هەزار جار لە زەوی گەورەتر، سێسەد هەزار جار لە ئەرز قورسترە!

ئەم کورەیە درێژیەکەی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر، واتە «قوترە»کەی هەشتسەدو شەست و پێنج هەزار میلە، لە ئێمەوە نزیکەی نەوەدو دوو ملیۆن و پێنج سەد هەزار میل دوورە. ئەو ئەستێرە هەرە پچووکانە کە ئێمە بە ئاستەم ئەیانبینین ئەوانە زۆر زۆر لەو کورەی ڕۆژە گەورەترن!

تۆ ئەزانی ئەستێرەی قوتب چەندە دوورە لە ئێمەوە؟

ئەستێرەی قوتب چوارسەد و شەست و پێنج ساڵ بەبڕینی تیشکی ڕۆژ لە ئێمەوە دوورە، واتە کاتێ کە ڕووناکی لەم ئەستێرەوە سەر هەڵئەدا بەچوار سەدو شەست و پێنج ساڵ ئەگا بە ئێمە، بەمەرجێك لەهەر سانیەیەکدا سەدو هەشتاو هەشت هەزار و دوو سەدو سی و پێنج هەزار میل ببڕێ، وە بڵاو بوونەوەو پەرەسەندنی ڕووناکی و تیشکی ئەو ئەستێرەیە دوو هەزار و پێنج سەد جار زیاتر و بەهێزترە لە بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنی ڕووناکی کورەی ڕۆژ، واتە لە گەیشتنی تیشکی ڕۆژ بە زەوی!!.

ئەم بۆشاییە کەوا ئێمە لەسەر سەرمانەوە ئەیبینین و پێ ئەڵێن بۆشاییەکە کە هەر دوایی نایێ، وە ئەم هەموو ئەستێرانە کە ئێمە لەم بۆشاییی سەر سەرمانەوە ئەیان‌بینین لە ژمارەی ملیارو ملیۆنان دەرچووە، جارێ بە ملیۆن ئەستێرەی وا هەیە لە ڕۆژ گەورەترەو ئێمە زۆر بە بچووکی ئەیبینین، وە ئەمانە هەر یەکە مەدارێکیان هەیەو تیایا ئەسووڕێنەوە کە مەدارەکەیان دیارە هەزار ئەوەندەی خۆیان گەورەترە، وە ئەمانە هیچیان ناکەون لەیەك، وێنەی ئەمانە لەم بۆشاییە هەتا هەتاییەدا وەکوو وێنەی ژوورێکە چەند تیزانگ میزڵدانێکی تێخەی و بەناو هەوای ژوورەکەدا بڵاو بینەوە، ئەمە چ دیمەنێکی هەیە ئەستێرە بەرزەکانیش لەبۆشاییە دوایی نەهاتووەکەی ژوور سەرمانەوە ئاوانە!

جا لـە کاتێکا کـە کاروباری کەون چۆنیەتی بارساییەکانی ژوور سـەرمان ئەمانە بن چۆن ئادەمیزاد ئـەگا بەڕاستی و بەتێگەیشتن لـە نهێنی بارساییەکان و بۆشاییەکە؟! لەکاتێکا کـە لـە ژوور ئەمانەشـەوە گەلێکی‌تر هەیە کە هەر دیار نین لـە ئێمەوە. کەوابوو ئەمـە خاوەنێکی هەیـە کـە بـەم جۆرە یاسا ڕێـك و پێکەوە دروستی کـردوون و عەقڵی ئادەمیزاد هێشتا هەر لە پلەی هەرە نزمیایە بۆ تێگەیشتن لێیان. ئادەمیزاد ئەڵێ خەریکم ئەچم بـۆ مانـگ وە ڕاسـت بـوو چـوو ئـەم چوونـەی دۆزینـەوەی یەکێکە لە سـەد هەزار ملیاری نهێنیەکانی کەون، ئـەی ئەوانی‌تری چی؟... بەم یەکـەیان خۆی گیڤ کردۆتەوەو ناوی خۆی ناوە شـت و ڕووی کردۆتە مادەو پشـتی لە ڕۆحیات هەڵکردووە، وا ئەزانێ لە ژوور خۆیەوە یەکێکی‌تر نییە، لەگەڵ ئەوەدا خوا هەیە کە هیچ هێزێك نایگاتێ.

ئەڵێم ئادەمیزاد مەبەستم ڕەمەکییـە ئەگینا ئەوە ئاشکرایە هەتا ئەو تاکـی ئادەمیزادە زاناتـر و داناتـر بـێ زیاتـر بڕوا بەبوونـی خـوا و بێ‌هێـزی خـۆی ئـەکا. لەگـەڵ ئەمانەشا ڕۆژاواییـەکان هـەر باشـترن کـە ئەچن بۆ مانگ وەیا خەریکی شـتی دیاری و عەمەلین، ئـەی زۆر لـە ڕۆژهەڵاتییەکانی ئێستە چـی؟ بـە تایبەتی ئیسـلامەکانیان، وە بەتایبەتی‌تـر ئەو دەستەیە کە ئیسـلامەتی لەناو ئەوانا پەیدا بوو، لەکاتی خۆیا ئیشـی کردەوەییان کرد بـەڵام ئێسـتە هەمـوو کۆششـێکیان هـەر بریتییە لە قسـەو قسـەش ناچێتـە ناو گێرفانەوەو خەڵکی‌تریش بە کردەوەوە خەریکن.

ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا لە کردەوەدا چەندە لێکەوە دوورن لەقسەشا ئەوەندە لێکەوە دوورن!..

## کانەکان

ئـەم زەوییـە، ئـەم بایـە، ئـەم بارانـە بەهەموویانـەوە گەلـێ شـتیان دروسـت کـردووەو هێناوەتـە ئەنجام، هەمـووی بـۆ وریایـی ئادەمیـزاد بـۆ ئـەوە کـە ئادەمیـزاد کەڵکیـان لـێ وەربگـرێ، کەچـی ئادەمیـزاد لەباتی ئەوە زیاتر خەریك بێ و زیاتر سوپاسگوزاری بکا لەوانەیـە ڕۆژ بـە ڕۆژ بـۆ چاکـە نەناسین بەولاتـرەوە ئەچێ و هەمـوو شتێك ئەداتە پاڵ خۆی و ئەڵێ «من»!.

لەکاتێـکا کـە دڕکێکیشـی پیـا بچـێ لەهەمـوو پاژی کەونەکە بێ‌هێزتر ئەبـێ! کەوابوو

ئەگەر یەکێ خۆی ناسی خواش ئەناسێ، وا دیارە ئادەمیزاد بۆیە «من منیەتی» هێشتا خۆی نەناسیوە، کە خۆی نەناسیبێ خوایشی نەناسیوە، ئەو خوایە کە هەر سەرە دەرزییەك لەم کەونەی هەزاران فەلسەفەو هەزاران نهێنی تێدایە کە ئادەمیزاد هێشتا زۆری ماوە بیانگاتێ! کاروباری کانەکان یەکێکە لەو شتە سەرسام کەرانەی کە دەسەڵاتی ئادەمیزاد لە بوونیانا وەکوو ئەو دەسەڵاتەیەتی کە تاقە ئینسانێکی گیاندار دروست بکا. لێرەدا ئێمە لە تۆزێك لەوانەوە ئەدوێین کەلەمەوە ئەکەوینە گێتییەکی ترەوە:

کانەکان هەندێ لەش و بارسایی و شتن کە لە هەڵم و دووکەڵی ژێر زەوییەوە پەیدا ئەبن، لە تێکڵاوبوونی ئەم دووکەڵانەو لەئاوێتەبوونی خڵتەی ژێر زەوی بەوانەوە و لە زیاد و کەمی هەندێکیان بەسەر هەندێکیان کانەکان دروست ئەبن. ئەمجا لەمانە تێکەڵ بوونی ئەو مەوادانە یا بەهێزو بتەوە یا بێ هێزو کەمە، ئەوەی کەوا بەهێز ە یا لەوانەیە شایانی ئەوەی هەیە کە لە بەریەك بکشێتەوە بەبێ ئەوە ئەجزاکانی لەیەك بیچڕێن یا ئەو شایانیەی نییە، ئەوەی کە ئەو شایانیەی هەیە قەوارەی حەوتەوانە لەو دروست ئەبێ، ئەوانەش ئەمانەن: *«زێڕ، زیو، مس، قەلایی، ئاسن، قورقشم، خارچین». ئەوەش کە ئەو شایانیەی نییە یا* ئەوەتە زۆر پەیتە وەکوو «جیوە» وەیا زۆر سەخت و تورتە وەکوو «یاقوت». ئەوەیان کە زۆر ڕەقە جاری وا هەیە بەهۆی شێ و ڕتووبەتەوە خاو ئەبێتەوە ئەمەیان ئەبێ بە ئەجسامی زێڕینی وەکوو زرنیخ و کبریت. ئەو حەوت مادەی پێشوو لە تێکڵاوی ئەم جیوەو کبریت پەیدا ئەبێ ئەمەش بە هۆی زیاد و کەمی یەکێ لەو دووە بەسەر ئەوی تریانا.

پەیدابوونی جیوە کە زەیبەقە بەهۆی خڵتەو ئەجزای ئاووەیە کە تێکڵاو ئەبێ بە خڵتەو ئەجزای نازکی زەوی کە ئەم ئەجزا نازکەش لێرەدا کبریتە. کبریتیش کە گۆگردە لە ئەجزای ئاوو باو زەوییەوە پەیدا ئەبێ، کە ئەمانە گەرماییەکی بەهێز ئەیانشێلێ بەسەریەکاو وەکوو ڕۆنیان لێ ئەکا. جسمە ڕەقە شەفاف و ڕووناکەکانیش بەهۆی ئاوێکی شیرینی سافەوە پەیدا ئەبن کە ئەم ئاوە لەکاتی خۆیا کەوتۆتە بەینی دوو تۆوی بەردێکی ڕەقەوە و ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە خەست بووەتەوە، ئەوەندە ماوەتەوە کە گەرمایی کانەکە کاری تێ کردووەو پێی گەیاندووە، ئەو جسمانەش کە تاریکن و ڕووناکییان نییە پەیدا بوون و دروست بوونەکەیان بەهۆی تێکڵاوی ئاو و قوڕەوەیە بەڵام

ئەبێ ئەو قوڕە لینجییەکی تێدا هەبێ، کە ئەوەی هەبوو گەرمایی ڕۆژیش ماوەیەکی زۆر زۆر کاری تێ کردووەو مادەکە پەیدا بووە.

ئەو جسمانەش کە بەهۆی شێ و ڕتووبەتەوە خاو ئەبنەوە ئاوەو تێکڵاو ئەبێ بەو ئەجزا وشکانەی زەوی و لەو تێکڵاوبوونە بەهێزە کە ماوەیەکی زۆری ئەوێ مادەکە دروست بووە. ئەو ئەجسامانەش کە مادەکەیان ڕۆناوییە دروستبوونەکەیان لەو شێ و ڕتووبەتە هەمەجۆرەی ناو جەرگی زەوییە، کە گەرمایی کانەکە دەوری ئەداو ئەیگوشێ و پاکژیەکی لێ پەیدا ئەبێ، ئەو مادە پاکژە تێکڵاو ئەبێ بە جەوهەری خاکی شوێنەکە، گەرمایی کانەکەش دائیمەن وەکوو مووشەدەمە وایە بۆی هەر هانی ئەداو وەکوو بڵێت هەر ئەیکوڵێنێ، لەم کردەوەیە مادەکە هەر خەست ئەبێتەوە تا لە ئەنجاما وەکوو ڕۆنی لێ دێت.

گوایە وەکوو زانایانی ئەم باسانە ئەڵێن ئاڵتوون لەشوێنێکا ئەبێ کە یا دەشتێکی لماوی بێ وەیا کێوو بەردەلانێکی نەرم بێ... زیوو مس و ئاسن و ئەم جۆرە شتانە لەژێر ئەو کێوانەوە ئەبێ کە کوچکەکانیان تێکڵاو بووبێ بە خۆڵێکی نمناك... مەوادی گۆگردی لە شوێنێکا ئەبێ کە زەوییەکە شێداربێ و ڕتووبەتی ڕۆن ئامیزی هەبێ... ئەوانەی کە سوێرن و خوێیاوین لە زەوییەکی بایەری دەیمی دوور لەدەستی ئاوەدانی ئەبن... ئەو مادانە کە قورقوشم و تووتیاو شتەن لەشوێنێکا ئەبن کە لم بێت و خۆڵەکەی گەچی تێدا هەبێ...

ئەوانەی کە مەوادێکی ڕووناکن وەکوو مادەی شووشەو زاخ و شتە لە شوێنێکا ئەبن کە خۆڵێکی تاڵی وشکی هەبێ. لەگەڵ ئەمانەشا وەکوو دەرئەکەوێ هەر شوێنێك لە ئەرز تایبەتیيە بە شتێك لەم کان و مەعادنانە، ئەمانەش واتە کانەکان لەگەڵ ئەوەدا کە یەکە یەکە واتە ترۆمەکانیان زۆرن هەموویان لەژێر سێ شتا کۆ ئەبنەوە:

١ـ «فلزات» کە ئەو شتە کانیانەن و ئەتوێنرێنەوە شتیان لێ دروست ئەکرێ.

٢ـ بەردەکان، واتە ئەوانەی کە بەناو بەردەوەیە وەکوو گەوهەرەکان.

٣ـ ئەو شتانەی کە مەوادی ڕۆناوین.

جا ئێمە لێرەدا لە هەندێ لە بەشی یەکەم و سێیەم قسە ئەکەین و ئەو کەڵکانە کە لەوانا هەن تۆزێکی باس ئەکەین.

◈◇◈

# شتە فلزیەکان

فلز قەبارەیە لە کان دەرئەهێنرێ و شایانی ئەوەی هەیە بە گەرماییە هەموو جۆرە فەساڵێکی بەسەرا بهێنرێ وەکوو ئاسن، زێڕ، زیو... هتد... پەیدابوونی ئەم شتە فلزیانە بەهۆی تێکڵاوبوونی جیوەو گۆگردەوە ئەبێ، کە ئەم دووە ئەبێ زۆر پاك و خاوێن بن و هیچ شتێکی تریان ئاوێتە نەبووبێ وە بەتەواویش هەردووکیان ئاوێتە بووبن، کبریتەکە وەکوو چۆن ئەرز ڕتووبەتی ئاو ئەمژێ ئەویش ڕتووبەتی جیوەکەی مژیبێ، ئەبێ ئەندازەشیان بە ئەندازەی یەك بێ، گەرمایی شوێنەکە کە ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە بۆیان پێیان بگەیەنێ، تا پێش پێگەیشتنیان نابێ نە سەرما و نە گەرمای زیاد وە نەهۆی وشكبوونەوەیان بگاتێ. کە شتەکە بەم جۆرە بوو لەپاش درێژی زەمان و ماوەیەکی زۆر ئاڵتوونی ساغ لەمە پەیدا ئەبێ و زێڕ دێتە دەست.

ئەگەر هاتو جیوە و کبریتەکە خاوێن و ساغ بوون، بە تەواوی لەبن عەرزەکەدا بەجۆرێکی ڕێکوپێك تێکڵاو بوون و شێلران بەسەر یەکدا، لەگەڵ ئەم کردەوەیەیانا کبریتەکە مادەکەی سپی بوو ئەمە لێرەدا زیو دروست ئەبێ لە کانەکە... ئەگەر لەپێش ئەوەدا ئەم جیوەو کبریتە پێ بگەن و بگەنە پلەی زێڕ وەیا زیو سەرمایەك دای لێیان ئەوە خارچین دروست ئەبێ. ئەگەر جیوەکە ساغ و خاوین و کبریتەکە وانەبوو، وە هێزێکی سووتێنەری تێدا بوو لێرەدا مس دروست ئەبێ، ئەگەر گۆگردەکە بە تەواوی لەگەڵ جیوەکەدا تێکڵاو نەبوو قەڵایی دروست ئەبێ. ئەگەر چ کبریتەکەو چ جیوەکە هەر دووکیان خاوێن و پاك نەبوون، وە جیوەکە مەوادی تری زەوی زیاتر مژی بوو، کبریتەکەش هەر باش نەبوو ئاسن دروست ئەبێت. ئەگەر کبریت و زیبقەکە خراپ بوون، لەگەڵ ئەم چاك نەبوونەشیانا باش تێکڵاو نەبووبوون ئەوە قورقوشم دروست ئەبێ. وەکوو ئەبینین ئەم شتە فلزیانە هەموو لەو دوو مادەیەوە پەیدا ئەبن جۆری تێکڵاوی و عەوارزیتر جیایان ئەکاتەوە. ئینجا چاکەو خراپەی یەکە یەکەی ئەم شتانە:



## زێڕ

زێـڕ کـە ئاڵتوونـە تەبێعەتـی گـەرمـە، لەبـەر زۆر جۆش‌خواردنـی ئـەجزای خاکییەکـەیـەوە بـە ئەجـزای ئاوییەکـەیـەوە نـە بـە ئاگر ئەسووتێ چونکە ئاگر ناتوانێ ئەجزاکانی لێك جیا بکاتەوە، نـە لـەناو خاکا ئـەڕزێ، وە نە ژەنگیش هەڵدێنێ با هەزاران ساڵیش بەسەریا تێپەڕێ، ئەو شوێنە کە کانی ئاڵتوونە بە هەزارو هەشتا ساڵ ئەو ئاڵتوونە دروست ئەبێ.

ئاڵتوون نەرمە، زەردە، بریسکەدارە، تامی شیرینە، بۆنی خۆشە، قورسە، زۆر مەنن و لەسەرخۆیە، ئەم ئەوسافانەی هەموو لەبەر ئەجزاکانیەتی.

ئاڵتوون یەکێ پێی بێ دڵی بەهێز ئەکا، بەسـەرا هەڵبواسـرێ ژانە سـەرو ترسـی لائەبا ـ ژنـە زۆرزانـەکان بۆیـە ئەیکەن بەسـەریاناو دین و ئیمانیـان ئاڵتوونە! ـ ئەگەر لە ئاڵتوون کلچێوێـك دروسـت بکـرێ و بهێنـرێ بـە چاوا چـاو ڕوون ئەکاتـەوە، جوانی ئـەکاو هێزی بینینی تیژ ئەکاتەوە...

ئەگەر گوێ بە دەرزی ئاڵتوون کون بکرێ شـوێنەکەی نایەتەوە یەك. ئەگەر شـوێنێك بـە ئاڵتـوون داخ بکـرێ تلۆق ناکات، وەیا ئەگـەر شـوێنێك تلۆقی کردبوو بـە ئاڵتوون داخ بکرێ خێرا چاك ئەبێتەوە...

یەکێ بۆنی دەمی بێت ئاڵتوون بخاتە دەمی بۆنەکەی لائەبا... ئاڵتوون بۆ بەهێزی دڵ و بۆتەنگە نەفەسی باشە...



## زیو

زیـو کـە نوقـرە ـ شـی پـێ ئەڵێن لـە هەمـوو کانییـەکان لـە زێڕ نزیکتـرە، ئەگـەر لـە کانەکەدا پێش ئـەوە پـێ بـگا سـەرمای پـێ نەگەیشـتایە لەوانـە بـوو ببـێ بـە ئاڵتـوون. زیـو ئەگـەر بەهۆی

خاکەوە نمی هەڵهێنابوو بخرێتە سەر ئاگر ئەسووتێ. زیو چڵك و پیسی هەڵئەگرێ، بەڵام زێڕ هەڵی ناگری. زیو کە بۆنی قەلایی و جیوەی پێ گەیشت کە لێت دا ورد ئەبێ و ئەشکێ، ئەگەر بۆنی کبریتی گەیشتێ ڕەش دائەگیرسێ. ئەگەر زیو توێنرایەوە گۆگرد بکرێ بەسەر ئەو تواوەیەدا ئەسووتێ و ڕەش هەڵئەگرێ و وەکوو شووشە چۆن ورد ئەبێ ئەویش ورد ئەبێ، ئەگەر لەو حاڵەدا «بۆرەك»ی بکرێ بەسەرا چاك ئەبێتەوەو وەکوو خۆی لێ دێتەوە.

«بۆرەك» جۆرە خوێیێکە کە لە هەندێ لە دەریاچەکانی ئاسیا، چین، تەبەت و هندستان وەر ئەگیرێ، هەندێکی تری هەیە لەبەرد هەر لەکانەکەیا دروست ئەبێ، ئەمانەش سپی، سوور، دێزیان هەیە، تامەکەی سوێرە. ئەوەندە هەیە کە ئەو بۆرەکە کرا بەسەریا زۆری کەم ئەکا. قورقوشم و زاخی ڕەش زیو عەیبدار ئەکات...

زیو ئەگەر بسووڕێتەوەو تێکڵاو بەو دەرمانە تەڕانە کە ئەخورێنەوە بکرێت ئەو ڕتووبەتە لینجانەی کە لە لەشی هەندێ کەسا پەیدا ئەبن لایان ئەبا. ئەگەر یەکێ بۆن لە دەمیا هەبێ زیو لەناو دەمیا ڕابگرێ بۆنەکەی نامێنێ. زیو بۆ گەڕی و خوران و میزگیران باشە، ئەو دەرمانانە کە بۆ تەنگە نەفەسی ئەخورێن ئەگەر زیویان تێکڵاو بکرێ باشتر و بەهێزتر ئەبن...

زیو لەگەڵ جیوەدا تێکڵاو بکرێ بۆ مایەسیری زۆر باشە.

## مس



مس زۆر نزیکە لە زیوەوە، جیاییەکەیان لەگەڵ زیودا لە ڕواڵەتا ئەوەیە کە مس ڕەنگی سوورە، وشکە، زوو چڵك و ژەنگ هەڵئەگرێ، سووریەکەی لەبەر زۆر گەرمایی و زیادەی بەشی کبریتەکەیەتی، وشکی و چڵك و ژەنگەکەی لەبەر خەست و خۆڵی مادەکەیەتی، یەکێ بتوانێ سپی و نەرمی کاتەوە ئەتوانێ هەموو ئیشێکی پێ بکا، کە بە شتی تورش مەزە بهەنوورێ ژەنگەکەی لائەچێ، دەرزییەك

لەمس دروست بکرێ و زاخاوی بەخوێن بدرێتەوە، بەو دەرزییە گوێ کون بکەن شوێنەکەی نایەتەوە یەك، شت خواردن لەناو حاجەتی مسدا کە ژەنگاوی بێ نەخۆشی وای لێ ڕوو ئەدا کە چاری زۆر گرانە...



## ئاسن

باسی دروستبوونەکەی کرا، ئاسن بۆیە ڕەشە چونکە لەکاتی ناو کانەکەیا گەرمایی زیاد لە ئەندازە کاری تێ ئەکا. یەکێ لەکاتی نووستندا پرخە پرخ بکا بەڕادەیی ئاسن لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ئەو پرخە پرخەی نامێنێ... یەکێ ئاسنی پێ بێت دڵی بەهێز ئەبێت، ترس و ئەفکاری خراپی نامێنێ، دڵ خۆش ئەبێ، خەوی خراپ نابینێ، لەبەر چاو مەردم گران و ماقووڵ ئەبێ... مادەیەك هەیە بەسەر ئاسنەوە بەهۆی ڕتووبەتی هەواوە پەیدا ئەبێ، ڕەنگی سوورکارە کە پێ ئەڵێن «کرپیش»ەکەی، جا ئەو کرێشەی ئەگەر بهێنرێ بەچاودا چڵکی ئەو چاوە ئەخوا، ئێشی لائەبا، پێڵوەکانی قورس بێ سووکی ئەکا، ئەگەر ئەو چاوە تەم بکا لای ئەبا، ئەگەر یەکێ جومگەکانی دەست و پێ بئاوسێ کە پێ ئەڵێن «نقرس» لەو کرپیشی ئاسنەی پیا بێنێ چاکی ئەکاتەوە... یەکێ مایەسیری هەبێ لەو کرپیشی ئاسنە بکا بەخۆیا وەکوو شاف چاکی ئەکاتەوە.

پارچە ئاسنێك سوور بکرێتەوە، لەپاشا هەر بەو سوورییە بهێنرێ بە سەرە تیرو شتی‌تری وەکوو ئەودا ئیتر ژەنگ هەڵناهێنن..



## قەڵایی

قەڵایی کە «تووتیا» و «رۆح»یشی پێ ئەڵێن جۆرێکە هەر لە زیو بەڵام سەری لێ‌تێك‌چووە، سەر لێتێکچوونەکەش ئەوەیە کە ئەم بۆن و تورتیەکی هەیە و بۆی پەیدا بووە زیو ئەوەی نییە...

ئەگەر یەکێ بێنێ ئەڵقەیەك لە قەڵایی دروست بکا ئەو ئەڵقەیە بکاتە ملی دارێکی بەردارەوە بەڵام لەبنیەوە، ئەو دارە بەرەکەی ناوەرێ و زۆریش ئەبێت...

ئەگەر یەکێ پارچەیە قەڵایی لەسەر سکی و یا پشتی دابنێ پەڕینی ئەنیشێتەوە...

ئەگەر تۆزێ قەڵایی بخرێتە ناو مەنجەڵی گۆشتەوە ئەو گۆشتە ناکوڵێ و پێ ناگا...

ئەگەر قەڵایی بەڕۆن و خوێ بهەنوورێ توێکڵێکی ڕەشی لێ پەیدا ئەبێ، بەو توێکڵە کە گیرا شمشێر و خنجەرو شتەی پێ مشت و ماڵ بدەن ئیتر ژەنگ هەڵناهێنن...



## قورقوشم

قورقوشم کە «سرب»یشی پێ ئەڵێن پەیدابوونەکەی وەکوو قەڵایی وایە بەڵام لەو خوێڕیترە چونکە مادەی ئەم قورقوشمە هەر زۆر زوو چڵك و پیسی وەرئەگرێ.. شتێکی سەیر لە قورقوشمدا هەیە؛ ئەڵماس ئەگەر بیخەیتە سەر سندانی پۆڵاو بەچەکوشی پۆڵا لێی دەی چەکوش و سندانەکە کون ئەکاو ئەڵماسەکە ناشکێ کەچی ئەگەر لەسەر قورقوشم دابنرێ بەلێداننێکی زۆر کەم پارچە پارچە ئەبێ، وەیا پارچەکانیشی هەموو سێ گۆشەیی ئەبێ، هەروەها قورقوشم بخرێتە لای ئاڵتوون وەکوو ئاهەکی لێ ئەکاو ئەو ئاڵتوونە کە ئاگر کاری تێ نەئەکرد بخرێتە ناو ئاگر ئەسووتێ...

ئەگەر یەکێ «لوو» وەیا «خەنازیر»ی هەبوو، خەنازیریش هەر لووە بەڵام ئەم واتە خەنازیر لەبەینی گۆشت و پێستا ئەبێ و زیاتریش لە ملدا ئەبێ، جا ئەگەر یەکێ ئەوەی هەبوو پارچەیە قورقوشم بخاتە سەری لای ئەباو ئەیڕەوێنێتەوە، ئەگەر بە ئەندازەی نۆزدە مسقاڵ قورقوشم ببەسترێ بەزکی هەر کەسێکەوە ئیتر شەهوەتی نامێنێ...

## خارچین

ئەم خارچینە زۆرتر لە وڵاتی چین ئەبێ، ڕەنگەکەی ڕەشێکی مەیلەو سوورە، لەم خارچینە جۆرە گازێك دروست ئەکەن بۆ گرتنی ماسییە هەرە گەورەکان، بۆیەش لەمە

دروستی ئەکەن چونکە ئەم مادەیە خۆی لە هەر شتێك گیر کرد لێ نابێتەوە مەگەر بەزۆر نەبێ.

دەردێك هەیە پێ ئەڵێن «لقوه»، ئەمە دەم لار ئەبێ، جا ئەگەر یەکێ تووشی ئەم دەردە بوو، لەم خارچینە ئاوێنە دروست ئەکرێ، ئەو کەسە ئەو ئاوێنەیە بباتە ژوورێکی تاریك و سەیری بکا دەردەکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.. هەر لەم مادەیە مەقاش دروست ئەکرێ ئەو شوێنانە کە مووی لێ دێت و بویسترێ ئیتر مووی لێ نەیەتەوە بەو مووکێشە مووەکە هەڵئەکەنن و پاشان شوێنەکەی چەور ئەکەن چەند جارێك ئیتر مووی لێ نایەتەوە.

◈◇◈

# شتە ڕۆناوییەکان

ئەو شتێ و ڕتووبەتانە کە لەژێر زەویدا هەن بەزستان گەرم ئەبن و بە هاوین سارد ئەبن، ئاوی کارێز چاکتر بەڵگەیە بۆ ئەم قسەیە، سەیر ئەکەی بەزستان پێش ئەوە هەوا لێی دا گەرمەو هەڵمی لێ هەڵئەستێ، هاوینیش ساردە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە گەرمی و ساردی لەیەك شوێنا نابێ کۆ ببنەوە، کە زستان هات دەرەوەی سارد ئەبێ، گەرماکە ناچار شوێنی بۆ نامێنێتەوە ئەچێتە ناو زەوی، هەندێ شوێنی وا هەیە لە ئەرزەکەدا تەبێعەتی خاکەکەی ڕۆناوییە ئەو گەرمایە لەو ڕتووبەتە وەرئەگرێ، کە سووسەی هەوا وەیا سەرماییەکی دەرەوەی ئەرزەکەی کرد خەست ئەبێتەوەو یەك ئەگرێ، وەیا گەلێ جار هەر لەسەر ئەو پەیتیەی خۆی ئەمێنێتەوە ئەبێ بە کبریت وەیا بە جیوە وەیا بە نەوت و شتی وا، ئەم وەرگەڕانە تەبێعەتی دەرەوەو ناوەوەی ئەرزەکە دروستی ئەکا، کەوا جارێکی‌تر ئەیپاڵێوێتەوە و وەکوو بڵێت بێژنگ کارییەکی‌تری ئەکاتەوە، لە ئەنجامی ئەم کردەوەیەدا و لە ئەنجامی ئەم ئاوێتە بوونەوەی جاری دووەمی گۆگرد و جیوەکەداو کار تێ‌کردنی هەوای دەری ئەرزەکەو گەرمایی ناو کانەکا گەوهەرەکانیەکان پەیدا ئەبن. لێرەدا ئێستە باسی هەندێ لە ڕەگەزە بناغەییەکان ئەکەین و پاشانیش تۆزێ لە گەوهەرەکان:

## جیوە = زەیبەق

جیوە پاژی وردی ئاوییە کە تێکڵاوی ئەجزای وردی بێ‌گەردی کبریتی ئەرزی ئەبێت، بەجۆرێ ئەم دووە ئامێتە ئەبن کە بەهیچ جۆر یەکێکیان لەوی کەیان جیا ناکرێتەوە، پەردەیەکی تەنکی خاکیی بەسەرەوەیە، کە ئەو دووە یەکێکیان کەوت لەوی کەیان ئەو پەردەیە دەم ئەکاتەوەو هەر دوو پارچەکە ئەبن بەیەك و پەردەکە ئەمجا دەوری هەردوکیان ئەدا. ئەو سپێتیەش کە دیارە لێوە هی ئەجزای ئاوەکەیە. زۆر کەس لەزانایانی ئەرزناس لەسەر ئەوەن کە جیوە زیوە و بەڵام تووشی چورتم بووە لەکانەکەداو لە ئەنجاما بووە بە جیوە.

یەکێ لەشی بەجیوە بهەنوێ ئەسپێ و کێچ و کرێش و مۆرانەی هەموو ئەکوژێ..
یەکێ نزیکی زەیبەق بکەوێتەوە و پاشان ئەو کەسە ئاگری لێ بکەوێ ئیفلیج ئەبێت..
دووکەڵی جیوە گەلێ دەردی ناهەمواری وەکوو لەرزووکی، کەڕی، ئیفلیجی، ڕەنگ زەردی، بۆنی دەم، وشككردنی مێشك لەئینسانا پەیدا ئەکات... هەروەها مارو دووپشك و هەرچێ جروجانەوەرە لە دووکەڵی جیوە هەڵدێن، هەرکەس لەلای ئەو دووکەڵەوە بووەستێ ئەمرێ...

تەنوورێك نانی پێوە بێ تۆزێ جیوەی تێخەی هەموو نانەکەی ئەکەوێتە خوارەوە... جیوە بهێنی لەناو سرکەدا، پاشان هەندێ بەنی تێ هەڵکێشی، هەرکەس ئەو بەنە بکاتە ملی قەت ئەسپێ لە جلیا پەیدا نابێت...

## گۆگرد

گۆگرد کە کبریتە پەیدا بوونەکەی بەهۆی ئەجزای هەوایی و ئاوی و ئەرزییەوەیە کە بەهۆی گەرماییەکی بەهێزەوە تێکڵاوی یەك ئەبن وایان لێ دێ ئەبن بە وەکوو ڕۆن، لەپاشا بەهۆی ئەوەوە کە ساردی لێیان ئەدا یەك ئەگرن و ئەبن بەیەك شت کە جیاکردنەوەیان هەر نابێت. کبریت چەند جۆرێکی هەیە؛ هەیە ڕەنگێکی سووری جوانی هەیە، هەیە سپییە وەکوو سپێتی تۆز، هەشیە ڕەنگی زەردە. سوورەکەی دەرمانێکی تەواوە بۆ فێداری و سەکتەو ئەو ژانەسەرانە کە لەنیوەی سەرا پەیدا ئەبن، بۆ خاوێنکردنەوەو قاڵکردنەوەی ئاڵتوونیش بەکاری ئەهێنن، سپیەکەشی بدرێ لە لەشی سپی ڕەشی ئەکاتەوە. ئەم جۆرەیان زیاتر لەو شوێنانەدا هەن کە لە ژێر کانەکەوە وەکوو کانی دەرئەچن، بۆنێکی زۆر ناخۆشی هەیە. ئەم جۆرەیان لەگەلێ شوێنی کوردەواری هەیە، وەکوو گەڕاوەکەی درۆزنەو سەنگاو، حەمام جەلی لە وڵاتی کۆیە، حەمام عەلی لە وڵاتی موسڵ.

ئەگەر یەکێك لەکاتێکا کە هەوا نە زۆر سارد و نە زور گەرم بێ بچێتە ئاوی ئەم کانیانەوە ڕزگاری ئەبێ لە هەموو برین و گەڕی و ئاوسان و باو شتە...

کبریت دەرمانێکی زۆر بەکەڵکە بۆ بەڵەکی بەڵام بەو مەرجە کبریتەکە ئاگری نەدیبێ...

ئەگەر کبریت تێکڵاو بەسرکە بکرێت بهێنرێ بەسەر ئەو پەڵە سپیانەدا کە لە ڕوومەت پەیدا ئەبن، وەیا لەش کەتوێك ئەخاو پێی ئەڵێن «قوبا» وەیا جومگەی دەست و پێ ئەستوور ئەبێ بەتایبەتی پەنجەکانی کە پێی ئەڵێن «نقرس» جا کبریت کە تێکڵاو بەسرکە کراو بەتایبەتی ئەگەر بنێشتێشی لەگەڵ بوو بدرێ لەمانە هەموویان چاك ئەکاتەوە.. گۆگردی زەرد بیهاڕنەوەو بیپرژێنن بەسەر شوێنی پێوەدانی شتدا بۆی بەکەڵکە...

هەروەها ئەم گۆگردە دووکەڵەکەی بدا لە مووی ڕەش سپی ئەکا... کە لەگەڵ ڕۆنی وەیا سمی کەردا تێکڵاو بکرێ و بسووتێنرێ مارو کێچ و شتە لەو دووکەڵە هەڵدێن..

## نەوت

نەوت مادەیەکە ئێستە پێویست بە باسکردن ناکا چونکە بوو بەسەرمایەیەکی بەرزی هەموو عالەم بەتایبەتی وڵاتی کوردەواری.

نەوت ڕەشی هەیە و سپی هەیە، تێکڵاو ئاوە ئەکەوێتە سەر ئاوەکە، دیارە لەپاش کردو کۆشێکی زۆر ئەبێ بەم نەوتە کە ئێستە ئێمە ئەیسووتێنین.

نەوت بۆ ژانی جومگەو دەم لاربوون و ئیفلیجی و سپێتی چاو و ئاوهاوتنی زۆر زۆر باشە... ئەگەر یەکێ ژان و بای هەبێ خواردنەوەی نیو مسقاڵ نەوت لەکۆڵی ئەخا... هەروەها ئەگەر ئافرەت مناڵ لە زکیا مردبوو وەیا لفەکەی مابووەوە بە ئەندازەی نیو مسقاڵ نەوت بخواتەوە هەمووی دەرئەکا... دیسان کرم لە سکا ئەکوژێ، وەیا ئەگەر شتێك پێوە بدا نەوتی پیا بهێنێ بۆی باشە...

لە وڵاتی کوردەواری گەلێ شوێنی وا هەیە زەوییەکەی ئەگەر چیلکە وەیا شتێك بە زەوییەکەدا بێنی ئاگری لێ ئەبێتەوە.

چیایەك هەیە لەسەر شاری سنەوە پێ ئەڵێن «کوچکە ڕەش» ئەو کوچکە ڕەشە دەنگ وایە کە ژێرەکەی کانی نەوتە. لە دیوی سەنگاو گەڕاوێك هەیە دڵۆپ دڵۆپ ئاوی سپی لێ ئەتکێتە خوارەوە هەر لەدوور دوورەوە بۆنێکی زۆر پیسی لێ دێت بۆ گەلێ دەرد و نەخۆشی باشە. هەر لەناوچەی سەنگاودا لە نزیکی درۆژنە کانییەك هەیە ئاوێکی لێ دێتە دەرەوەو بە جۆگەیەکدا ئەڕوا، لەپاش ماوەیەك لە جۆگەلەکەدا چوار

ڕەنگ بە تەنیشت یەکەوە دروست ئەکا؛ سوور، ڕەش، زەرد ڕەنگ، ڕەنگی ئاو، هیچیان تێکڵاو بەوی‌تریان نابن و جۆگەش هەر یەك جۆگەیە..

لە وڵاتی کۆیە کانییەك هەیە لە شیوێکی درێژدا پێ ئەڵێن «حەمام جەلی».
ئەویش بۆنێکی ناخۆشی هەر لە دوورەوە لێ دێت، ئەوانەی کە هەستی گولی لە خۆیانا ئەکەن وەیا گولن ئەچن بۆ سەر ئەو کانییەو ماوەیەك لەسەری ئەمێننەوەو مەلەی لێ ئەکەن و لێی ئەخۆنەوە بۆ دەردەکەیان باشە.

لە وڵاتی موسڵ شوێنێك هەیە پێی ئەڵێن «حەمام عەلی» ئاوێکی گەرمی بۆن‌دارە، کراوە بە حەوز، بۆ دەردی گەڕی و باو کەژۆك، مەردم ئەچن و مەلەی تیا ئەکەن باش ئەبنەوە...

لە وڵاتی زینوی شێخی کانی سەر مەرقەدی شێخ باڵەکان - شێخ کەماڵ - ئەو ئاوەی بۆ دەردی گورچیلە خەڵك ئەچن و لێی ئەخۆنەوەو بۆیان باشە. ئەو شوێنە لەم سەردەمەدا پێی ئەڵێن حاجی هۆمەران، من ئەم شوێنانەم هەموو بەچاوی خۆم دیوە...

◈◇◈

# شتە بەردییەکان

ئینجا بۆ زیادە ئاگاداری هەندێ لەو مەوادانەش کە بەناو پێیان ئەڵێن بەرد وەیا لە ڕەسەنی بەردن باس ئەکەین.

ئەوی کە ڕەسەنی بەردە بەهۆی ئاوی باران و ئەو شێ و ڕتووبەتەوە کە لەژێر زەویدایە پەیدا ئەبێ، ئەمە لەکاتێکا وایە کە ئەو بەردە ڕووناك و شەفاف بوو، خۆ ئەگەر لێڵ و تاریك بوو ئەوە لە تێکڵاوی ئاوو خاك پەیدا ئەبێ، لەم تێکڵاوییە لینجییەك پەیدا ئەکەن و ئەمجا گەرمایی ڕۆژ کاری تێ ئەکا، ئەو قوڕە سەخت ئەبێتەوەو ئەبێ بە بەرد.

ئەمجا ئەگەر ئاوی باران و ڕتووبەت لە کان و ئەشکەوتەکانا کۆ بووەوە و ئەجزای خاکی هیچ تێکڵاو نەبوو، گەرمایی کانەکە کاری تێ کردو بەم جۆرە ماوەیەکی زۆر مایەوە، بەشی ئاوەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ گەشی و قورسی و یەكگرتنی زیاد ئەکا، لەم کردەوەیە بە درێژی زەمان هەندێ بەردی ڕەقی ڕوونی وا دێتە ئەنجام کە ئاو و ئاگر کاری تێ ناکاو وەکوو یاقووت و ئەو شتانە، بەلای هەندێ لە زانایانەوە وایە کە جیایی ڕەنگی ئەم ڕەسەنە بەردە ڕووناکانە بە هۆی کار تێکردنی زۆرو کەمی گەرمایی کانەکەیە. هەندێکیتر ئەڵێن جیایی ڕەنگی ئەم گەوهەرانە بە هۆی کار تێکردنی تیشکی هەندێ لە ئەستێرە گەڕۆکەکانەوەیە، ئەڵێن جەوهەری بەردەکە لەناو کانەکەدا مادەیەکی تێدایە تیشکی ئەستێرەکە ڕائەکێشێ بۆ لای خۆی و ئەو تیشکە کار ئەکاتە سەر دروستکردنی ڕەنگەکەی. ئەڵێن ڕەنگی ڕەش لە بەردە گەوهەرەکانا هی زوحەلە، سەوز هی موشتەرییە، سوور هی مەریخە، زەرد هی ڕۆژە، سپی هی مانگە، ڕەنگاو ڕەنگ هی عەتاردە، شین هی زوهرەیە.

ئەو ڕەسەنە بەردەش کە ڕووناکی شەفافی تێدایە نییە ئەوە وەکوو وترا پەیدا بوون و دروستبوونەکەی لە تێکڵاوی ئاوو خۆڵەوەیە کە لینجی تێدا پەیدا ئەبێ و گەرمایی ڕۆژ کاری تێ ئەکاو بەردەکە دروست ئەبێ، دیارە ئەم جۆرە کردەوەیە ماوەی هەزاران وە بەڵکوو ملیۆنانساڵی ئەوێ، هەتا ئەو گەرمایەش زیاتر کاری تێ بکا بەردەکە ڕەقتر ئەبێ،

کەوا بوو ڕەقی و نەرمی بەردەکە بە زیادو کەمی کاریگەری گەرماییەکەوەیە، وەکوو چۆن خشتی کاڵ سەرەتا نەرمە، کە ئاگرەکە کاری تێ کرد ڕەق ئەبێ و ئەبێ بە خشتی سوور، وە هەتا ئەو ئاگرە زیاتر کاری تێ بکا ئەو زیاتر ڕەق ئەبێ سەمەرەی بەردەکەش وایە.

ئەمجا ئەم بەردانەش بەهۆی شوێنەکانیانەوە جیا ئەبنەوە؛ ئەگەر شوێنەکە خاك و قوڕێکی ڕووت بوو بەردی ڕووت پەیدا ئەبێ، ئەگەر دێم بوو ئەنواعی بەردی سوێر پەیدا ئەبێ، ئەگەر شوێنەکە لەوانە بوو گەردەلوول زیاتر لەوێدا پەیدا ئەبوو وەکوو شوێنە لماوییەکان و دەشتە چۆڵەکان ئەو بەردانە پەیدا ئەبێ کە شووشەو شتەی لێ دروست ئەکرێ.

هەروەها بەرد لە ئاویشا دروست ئەبێ، واتە لەناو ئاودا، جا ئەمە یا لەبەر ئەجزای ئاوەکەیە وەیا لەبەر ئەجزای ئەو مادەیەیە کە ئاوەکە وا لەسەر ئەوەوە.

جا ئێمە لێرەدا لە هەندێ لەو بەردانەو لەو شتە تایبەتیانە کە لە هەندێکیان هەیەو لەوانیتر نییە ئەدوێین و بە ئەندازەی دەسەڵات قسەیان لێوە ئەکەین:



### بەردی سورمە

سورمە کە «کل»یشی پێ ئەڵێن لە بناغەدا بەردێکی ڕەشە و گەلێ کانی هەیە بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتا زۆرە، ئەم بەردە لە کانەکەدا قەڵاپی ئاوێتە ئەبێ، ئەسوورێتەوە ئەهێنرێ بە چاوا. ئەم سورمەیە کە هێنرا بە چاوا ئاوی ئەو چاوە لائەبا، دەمارەکانی بەهێز ئەکا، هەچ دەردێك هەبێ نایەڵێ ڕووی تێکا، خۆ ئەگەر هەندێ میسکی تێکڵاو کرێ زۆر بەهێزترو بەکەڵکتر ئەبێ، ئەم کل بەچاوا هێنانە بەتایبەتی بۆ ئینسانی پیرو ئەو کەسانە کە چاویان بێهێزە زۆر بە کەڵکە. گەلێ جاری وا بوو کە کل چاوی بێهێزی تەواوی ڕوون کردۆتەوە، دیسان برژانگ قایم ئەکاتەوە. هەر ئەم کلە ئەگەر شوێنێك بسووتێ کلی تێ بدرێ و پاشان پیوی پیا بهێنرێ بۆی باشە.



## زاخ

زاخ لە ڕەسەنی بەرد دائەنرێ، لەبەری کانەکانەو ڕەنگی وەکوو بلوور وایە، سپی و سەوزو ڕەشی هەیە، هەموویان لە ئەجزای ئاوو لەهی ئەرزێکی سووتێنەر دروست ئەبن، ئەم دوو مادەیە بە تەواوی تێکڵاو ئەبن، ئەو گەرما زیادەی ئەرزەکە کاری تێ ئەکا مادەیەکی ڕۆنی لێ پەیدا ئەکاو وای لێ ئەکا کە شایانی توانەوەی هەبێ، لەبەر ئەمە سەیری ئەکەی کە ئاوو خۆڵەکە لە زاخدا مادەی سوێری و کبریتی و بەردی تێدا هەیە، ئەمانەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەجزای ئاوی و ئەرزیی سووتێنەری تێدایە سوێری لێ پەیدا ئەبێ، لەبەر ئەوە کە گەرماییەکە زۆرەو جۆشی ئەدا ڕۆنێکی کبریتی لێ پەیدا ئەبێ، لەبەر ئەوە کە ئاوو خۆڵەکە بەهۆی گەرمایی ڕۆژەوە جۆش ئەخوا مادە بەردیەکەی لێ پەیدا ئەبێ، ڕەنگەکانیشی بەهۆی جۆری گۆڕانی کانەکانەوەیە.

زاخ بۆ گەڕی، بۆ ئەو برینانە کە لەسەر وەیا ڕوومەت پەیدا ئەبن، بۆ پژانی لووت، بۆ کرمی ددان زۆر بە کەڵکە.. ئەگەر زاخ لە ماڵێکا بسووتێنرێ مشك و مێش لەبەر بۆنەکەی هەڵدێن.



## زەرنیخ

ئەم زەرنیخە کە لێرەدا باسی ئەکرێ «مەرگە مووش»یشی پێ ئەڵێن، جسمێکە لە کاندایە و گۆگردی تێکڵاوە، سوورو زەردو سپی هەیە، سوورو زەردەکەی زۆر لە ڕەنگا لەزێڕ ئەکا، کە لەگەڵ ئاهەکا تێکڵاو بکرێ موو لائەبا، ئەم زەرنیخە زەهرێکی کوشندەیە هەر لەبەر ئەمەیە کە بۆ کوشتنی مشك دائەنرێ...

زەرنیخ بسووتێنرێ خۆڵەکەی بهێنرێ بە ددانىدا ئەو زەردی و چڵك و شتەی کە بەسەریەوەیە لای ئەبا... هەروەها زەرنیخ بنرێ لە برین و لە گەڕی لەو برینە تەڕانەی

کە لەسەرو ڕوومەت پەیدا ئەبن و پیان ئەڵێن «سەعفە» کەڵکی زۆر هەیە بۆیان، لەگەڵ زەیتدا ئەسپێ ئەکوژێ، لەگەڵ ڕۆنی گوڵدا بەکار بهێنرێ بۆ مایەسیری لای ئەبا، ئەگەر بە زەرنیخ لەش بهەنوون مووەکەی لائەبا بەڵام لەوانەیە پەڵە پەڵەی ڕەش لەسەر لەش پەیدا کات.



## ئاقێق

ئاقێق کە پێی ئەڵێن عەقیق گەلێ جۆری هەیە، چاکترەکەیان ئەوەیە کە زۆر سوور بێ، ئەم جۆرەیان هی وڵاتی یەمەنە، لە وڵاتی ئوردنیش هەیە هی ڕۆخی دەلیاکە بەڵام زۆر چاك نییە، ئەم ئاقێقە زۆرتر ئەکرێ بە نقیمی ئەنگوسیلە، یەکێك عەقیقی پێ بێ لەکاتی شەڕا تووڕەییەکەی ئەنیشێتەوە، وە لەکاتی پێکەنینیشا ئەو هێزی پێکەنینە زۆرەی کەم ئەکاتەوە... وردە وەیا خۆڵێ کە لە کاتی ڕێکخستنەکەیدا لەو ئاقێقە هەڵئەوەرێ ئەگەر یەکێ ئەوە بهێنێ بە ددانیا چڵکەکەی لائەباو سپی ئەکاتەوە، هەروەها ئەگەر بۆنی دەمیشی بێ ئەو بۆنەش لائەباو ئەگەر خوێن لە پووکەکەشی بێت ئەو خوێنەش ئەوەستێنێتەوە.



## پیرۆزە

پیرۆزەیەکێکە لەبەردەتائەندازەیەك بەنرخەکان و ڕەنگێکی شینی هەیەو لەکان دەر ئەهێنرێ، زۆرتر ئەکرێ بە نقێمی ئەنگوسیلە، کانەکەی زیاتر لە نەیشاپوور، کرمان، فارس و ئازربایجانە. ئەم پیرۆزەیە بەهۆی هەواوە ڕەنگی گەش و جوان ئەبێ، ئەو پیرۆزانە کە ڕەنگەکەیان زۆر شین و ئاسمانی نییە هەوا وا تێکی داوەو ئەوانەیان باش نین، پیرۆزە لەگەڵ کلدا بهاڕێتەوەو بکرێتە چاو بۆی باشە... بەقسە ئەگەر

یەکێ دائیمەن پیرۆزە بکا بە نقێمی ئەنگوسیلەکەی و لە دەستیابێ هەژاری ڕووی تێ ناکا، ئەوەندە هەیە لەبەر ئەوە کە هەیبەت کەم ئەکاتەوە پادشاهان نایکەنە دەستیان...



## دوڕ

دوڕ کە مرواری گەورەیە، ئەم مروارییە وا لەناو سەدەفاو لەدەریا وەرئەگیرێ، لەکاتی بەهارانا بەهۆی باوە سەدەفەکە سەر ئەکەوێ، هەر با ڕشێنەی ئاو دێنێ و سەدەفەکە لەو ڕشێنەیە قووت ئەدا، وێنەی ئەمە وەکوو وێنەی منالْدانە کە ئاوەکە وەر ئەگرێ و قووتی ئەدا. ئەو سەدەفە کە لەم ڕشێنەیە وەرگرت ئەچێتەوە بن ئاوەکە، ئەو تنۆکە ئاوەکە ئەچێتە ناو سەدەفەکەوە سەدەفەکە بۆی ئەبێ بە گۆشت و ئاوەکەش ئەوا ئاوە. جا ئەگەر تنۆکە ئاوەکان ئەجزای هەوایان لەگەڵا بوو بە جۆرێك کە پێکیانەوە بنووسێنێ دیوی ناوەی سەدەفەکە پێکیانەوە ئەگوشێ و بە هۆی بایەکەوە یەك ئەگرن و دوڕێکی گەورە پەیدا ئەبێ، ئەگەر ئەجزای هەوای نەبوو مرواریەکان هەروا ورد ورد ئەبن. دیسان کە ئەو ڕشێنەیە کەوتە دەم سەدەفەکە لەبن ئاوەکە دیسان لەکاتی هەڵکردنی باداو لەکاتی هەڵاتن و ئاوابوونی ڕۆژدا سەر ئەکەوێتەوە، لەو سەرکەوتنە لەم کاتانەدا بەهۆی بای شەماڵ و گەرمایی کەمەکەی ڕۆژەوە مرواریەکە توند ئەبێتەوەو ئەبێ بە دوڕ، ئەمجا ناو سەدەفەکە کە لە پێشووترا ئاوی تاڵ و سوێری تیا نەبوو ئەو دوڕە کە لەو سەدەفە پەیدا ئەبێ زۆر جوان و گەشە، ئەگەر خۆ تیا بوو ڕەنگی دوڕەکە تێك ئەچێ، هەروەها لە غەیری ئەو دووکاتەی پێشوودا ئەگەر با لیی دا دیسان ڕەنگی تێك ئەچێ. ئەگەر هاتوو کرمی تیا بوو وەیا کون بوو ئەوەش هەر لەبەر ئەوەیە کە هەوای ناهەموار لیی داوە، ئەو هەوایەش لەو کاتانەدا هەوای شەوە، وەیا هەوای ناوەڕاستی ڕۆژە.

ئەمجا ئەگەر سەدەفەکە دوڕەکە لەناویا بە ڕێکوپێکی گرسابوو سەدەفەکە ئەچێتەوە بۆ بنی بەحرەکە، لەبنەوە دەمارو شتی لێ ئەبێتەوەو وەکوو بڵێیت ڕیشە دائەکوتی، تا ئەم کاتە حەیوان بووە کە ڕیشەی داکوتا ئەبێ بە ڕەسەنی ڕووەك. لێرەدا ئەگەر مەلەوانەکان

وازی لێ بێنن و دەری نەهێنن وەکوو چۆن میوەیەك ئەگەر گەیشت و لە دارەکە نەکرایەوە خراپ ئەبێ ئەمیش ئەگەر دەرنەهێنرێ خراپ ئەبێ و ئەو جوانییەی نامێنێ.

مرواری بۆ تەنگەنەفەس و ترس باشە، خوێنی دڵ گەش ئەکا، پزیشکەکان بۆ ئەم جۆرە شتانە بەکاری ئەهێنن، هەروەها ئەگەر لەگەڵ کلدا تێکلاو بکرێ و بهێنرێ بەچاوا دەمارەکانی بەهێز ئەکا، ئەگەر مرواری بخرێتە ناو ئاوی جووڵاوەوەو پاشان ئەو کەسەی کە پەڵە پەڵەی سپی لەسەر لەشی پەیدا بووە بەو ئاوە بهەنوێ لائەچێ و چاکی ئەکاتەوە...



## کارەبا

ئەم کارەبایە لە بناغەدا جەویی هەندێ لە دارەکانی وەکوو سەرو و کاژە، کە ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوەو وەکوو بەردی لێ دێ، جا لە بەر ئەمەیە کە لە ڕیزی بەرددا دائەنرێ، لە ڕەنگیشا زەردی هەیە، سووری هەیەو سپیشی هەیە، کە نزیکی پووش وەیا کاغەزی ئەخەیتەوە ڕایئەکێشێ.

یەکێ ئاوساوی وەیا تەنگە نەفەسی هەبێ کارەبا لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ بۆی باشە، هەروەها ئەگەر یەکێ زۆر زۆر دڵی تێك هەڵئەشێواو لەوانە بوو هەر ئەڕشایەوە کارەبای پێ بێ ئەوەی نامێنێ، خوێنی شوێنێکیش ئەگەر نەئەوەستایەوە کارەبای بخرێتە سەر ئەیوەستێنێتەوە، ژنی سك پڕ کارەبا لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ سکەکەی بێوەی ئەبێ...

یەکێ زەردووی هەبوو کارەبای پێ بێ ئەو زەردوویەی نامێنێ.



## ئەڵماس

ئەڵماس یەکێکە لەبەردە بەنرخەکان، بدرێ لەهەر بەردو شووشەیەك خۆی لەبەریا ناگرێ بەڵام ئەو بەدەست قورقوشمەوە حاڵی شڕە. ئەم بەردە لەکان وەرئەگیرێ، کانەکەی زۆرتر لە

هندستان و بەرازیل هەیە. ئەمەش لە ڕەنگا گەلێ جۆری هەیە؛ سەوز، سوور، ڕەش، شین، چاکتر ئەڵماس ئەوەیە کە هیچیەك لەم ڕەنگانە نەبێ بەڵکوو ڕەنگە عادەتییەکەی خۆی بێ کە وەکوو دوڕ وایە. زۆر زۆر سەختە، تەنانەت ئەگەر بەچەکوش بیشکێنی ناشکێ و چەکوشەکە بریندار ئەکا، بەڵام بە قورقوشم ئەشکێ، ئەڵماس ئەگەر ورد بکرێ با بکرێ بەهەزار پارچەشەوە پارچەکانی هەر بە سێ سووچ دەرئەچن... ئەڵماس ئەگەر بخرێتە ناو خوێنی بەران و نزیك بخرێتەوە لە ئاگر ئەتوێتەوە... بۆ ژان و بۆ تێك چوونی «معدە» زۆر بەکەڵکە... ئەگەر بخرێتە دەمەوە ددانەکان ئەشکێنێ وە لە هەمان کاتا زەهرێکی کوشندەشە...



## مەرجان

مەرجان لە بناغەدا لە جانەوەری دەریاییەو خۆی ئەنووسێنێ بەبنی دەریاکەوە، زۆر کەسیش لەسەر ئەوەیە کە جانەوەر نییەو لەگیای ئەو ساقەتەیە مادەیەکی وەکوو ئاهەك بەخۆیەوە دروست ئەکا ئەمە ئەبێتە قەڵغانێك بۆ پاراستنی مەرجانەکە. گەلێ شوێنی وا هەیە لە دەریا هەرەگەورەکانا کە ئەم مەرجانە ئایا جانەوەر بێ یا گیا بێ هەر لە بنەوە لە تەنیشت یەکەوە سەر هەڵئەدەن و دێنە دەرەوە، کە سەریان دەرکرد بە هەموویانەوە «دورگە = جزیرە» یەك دروست ئەکەن. ئەسڵی مەرجانەکە لەبنی بەحرەکەوەیە مەلەوانان و ئیشزانان دەری ئەهێنن سەرەتا وەکوو وترا وەکوو دار وایە و توێکڵی پێوەیە، توێکڵەکەی لێ ئەکرێتەوە مەرجانە سوورەکە دەرئەکەوێ، جا لەبەر ئەمە کە شتێکی بەنرخەو لە بۆ جوانکردن و ئارایشی شتە جوانەکان بەکار ئەهێنرێ لە ڕێزی بەردە بەنرخەکانا دانراوە ئەگینە خۆی لە ڕاستیدا بەرد نییە.

مەرجان یەکێ خوێن لە شوێنێکی بڕواو نەوەستێتەوە بیخاتە سەری ئەیوەستێنێتەوە، چاوی پێ برێژێ بەهێزی ئەکاو ڕتووبەتی خراپیشی ئەگەر هەبێ نایهێڵێ، هەروەها مەرجان دڵ بەهێز ئەکا، یەکێ بەزەحمەت میز بکا مەرجانی پێ بێ بە ئاسانی ئیتر

میزەکەی ئەکا... یەکێ ئەگەر فێی هەبوو مەرجان ببەستن بە ئەژنۆیەوە ڕزگاری ئەبێ..
مەرجان ڕەنگی سپی و ڕەشیشی هەیە بەڵام چاك و بە نرخەکەیان ئەوەیانە کە ڕەنگەکەی سوور بێ..

## مەرداسەنگ

ئەم مەرداسەنگە زیاتر لە قورقوشم و قەلایی وەرئەگیرێت، ڕەنگەکەی سووری هەیەو زەردی هەیە، لە مەلحەمکاریدا بەکار ئەهێنرێت، برین وشك ئەکاو گۆشتەوزوونی پێ دێنێتەوەو چاکی ئەکاتەوە ئەگەر بخرێتە سەری، یەکێ شوێنێك لە لەشیا بۆنی بێت مەرداسەنگی لێ دا بۆنەکەی ناهێڵێ، هەروەها ئەگەر پەڵە پەڵەی ڕەشی لە لەشا هەبوو مەرداسەنگی لێ بدرێ لای ئەباو ناهێڵێ..

خواردنی مەرداسەنگ زەهرە ئینسان ئەکوژێ و میزی پێ ئەگیرێ... لەبەر ئەم زەهرەی ئەگەر درا لە لەش بۆ لابردنی بۆن پاشان بە ڕۆن شوێنەکەی بهەنوون بۆ ئەوە نە وەك کار بکاتە ناو سك و ترسی کوشتنی پەیدا ببێ لێوە..

## ئاسنکێش



ئاسنکێش کە مەقناتیسە جۆرە بەردە ئاسنێکە کە لە کانەکانا هەیەو زیاتر ئەو کانانەش لە دەوروبەری دەریای هندو وڵاتی نەرویژو سوێددا هەیە، لەو شوێنانەدا لەوێنەی بەردێکی ڕەشدا دەری ئەهێنن، ئەم بەردە وەکوو چۆن عاشق بۆ لای دۆستەکەی هەڕا ئەکا، وەیا مەڕ بە بێئیختیار بۆ لای گورگ هەڕا ئەکا کە چاوی پێ کەوت ئاسنیش بەم جۆرە بۆ لای ئاسنکێش هەڕا ئەکاو هیچ ئیختیاری تێدا نامێنێ. ئا ئەم هێزی ڕاکێشانە بەم جۆرە لە لەشی هەندێ ئینسانیشا هەیە کە بەو هۆیەوە ئەتوانێ یەکێکی‌تر بخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە، ئەم هێزە نابینرێ بەڵکوو شتێکی نەبینراوو پۆشراوە کاریگەرییەکەی دەری ئەخا کە ئەم هێزە هەیە، ئەمەش زیاتر لەچاودا ئەبێ،

وەکوو ئەو کەسانە کە خاوەن دەسەلاتی فەرمانڕەوایین سەیری هەرکەسیان کرد ترسێکی لێ ئەنیشێ، ئەم ترسە بەو هێزە گوزارشت لێ دراوەتەوە، وەیا ئەو کەسانە کەوا بەهۆی سەیرکردنیانەوە هی یەکێکی‌تر ئەتوانن خەو لە کەسەکەی‌تر بخەن. ئەم جۆرە هێزە وەکوو لە ئینسانا هەیە لەچاوی هەندێ لە گیانلەبەرەکانی‌تریشا هەیە.

لەو شوێنانەدا کە کانی ئەم ئاسنکێشەی تێدایەو نزیکی بەحرە، کەشتی ئەو دەریایانە بەهیچ جۆر توخنی ئاسن ناکەوێ ئەگینە کانەکە ڕایئەکیشێ و نایەڵێ لەشوێنی خۆی بجووڵێ. شتێکی سەیرتریشی تێدا هەیە؛ ئەگەر هاتوو ئەم ئاسنکێشە بۆنی سیر وەیا پیازی کرد ئیتر ناتوانێ ئاسن ڕاکێشێ، لە هەمانکاتدا ئەگەر بە سرکە شۆرا ئەچێتەوە سەرباری خۆی و ئاسنەکە ڕائەکێشێتەوە. هەروەها ئەگەر خرایە ناو خوێنی بەرانەوە دیسان ئەگەڕێتەوە سەر ئیشی خۆی و ئاسنەکە ڕائەکێشێتەوە.

ئەگەر یەکێ وا ڕێکەوت وردەو بەڕادەی ئاسنی خواردبوو، ئەم ئاسنکێشە ورد بکەن و تێکلاو بە شیری بکەن و ئەو کەسە بیخواتەوە هەموو ئاسنەکە هەڵئەهێنێتەوە.. دیسان ئەگەر یەکێ بە ئاسنێکی زەهراوی بریندار کرابوو ئەو شیرو ئاسنکێشە کە وترا بیخواتەوە کاریگەری ژاری ئاسنەکە نامێنێ، وەیا برینێك لە لەشا بوو بەهۆی ئاسنی زەهراویەوە لەم ئاسنکێشە بهاڕنەوەو بیکەن بە برینەکەوە چاکی ئەکاتەوەو کاریگەری ژارەکەی نامێنێ...

ئەگەر یەکێ جومگەکانی دەست و پێی ژانی ئەکرد پارچە ئاسنکێشێك لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ ئەو ژانە نامێنێ...

ئەگەر ئافرەتێك بە زەحمەت لە کاتی مناڵبووندا منالەکەی لێ ئەبووەوە، پارچە ئاسنکێشێك بخاتە ناو دەستی لەو کاتەدا ئیتر بە ئاسانی منالەکەی لێ ئەبێتەوە..

ئەگەر یەکێ تووشی گزاز بووبوو ئاسنکێش بکەنە دەستی ڕزگاری ئەبێ... ئەگەر یەکێ پارچە ئاسنکێشێك هەموو دەم لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ بەتایبەتی بیکاتە ملی زەینی تیژ ئەبێ و شتی لەبیر ناچێتەوە...



## خوێ

خوێش لەبەر ئەوەکە هەر لە کانا یا لە ڕیزی بەردە کانییەکانایە، شتێکی سپی، بلووری ڕەنگی، سوێرە، بەڵکوو هەر سوێرییەو بووە بەو جسمە، کە خرایە ناو ئاو ئەتوێتەوە، سوێریەکە هەیە و جسمەکەی نامێنێ، خوێ هەزم تیژ ئەکاتەوە و ئێسقان بەهێز ئەکا، خوێ چەند جۆرێکی هەیە؛ هەیە وەکوو بلوور، هەیە ڕیزە ڕیزە وەکوو بەفر، هەشە هەر ئاوەو لە هەندێ ئەرزی دێمەکارا هەڵئەقوڵێ و پاشان ئەمەیێ..

خوێ هەرچی بۆگەنە لای ئەباو ئاگاداری هەموو شت ئەکا.. خوێ بسووتێنی و بیدەی لە ددان سپی ئەکاتەوە، بەتایبەتی خوێ لەگەڵ خەڵووزدا بهاڕێتەوەو بدرێ لە ددان بەتەواوی سپی ئەکاتەوە... ڕوومەت کە زەردو مایل بە ڕەش بوو دیارە ئەمە لە نەخۆشییەوەیە خوێ بسووتێنێ و پیا بهێنێ لای ئەبا... خوێ تێکەڵاو بە هەنگوین بکرێ بهێنرێ بە ڕوومەتاو بەو شوێنانەدا، کە گۆشتی زیادەیان لێ دەرچووە جوانی ئەکاو لای ئەبا، هەروەها لەشێك کە توێکی ئەخست وەیا تووشی گەڕی بوو خوێ و هەنگوین تێکڵاوکەی و لێی دەی چاك ئەبێتەوە... یەکێ دووپشك پێوەبدا خوێ و تۆی کەتان پێکەوە ئاوێتە بکاو بیکوتێ و لێی بنێ ژانی نامێنێ... یەکێ زەردەواڵە وەیا هەزار پێ پێوەدابوو وەیا چووبووە گوێچکەیەوە خوێ و هەنگوینی لێ بنێ بۆی باشەو ڕایئەکێشێتەوە دەرەوە... هەروەها یەکێ جومگەکانی ژانی ئەکرد خوێ و هەنگوین تێکڵاو کاو لێی بنێ چاکی ئەکاتەوە. ئەو جۆرە خوێیەی کە کلۆیەو ڕیزەکە نییە خواردنەکەی زەین تیژ ئەکاو پووك توند ئەکاتەوە، ڕیزەکەش بۆ پووك هەروەهایە. خوێ خواردن بەڵام زۆر زۆری نەء بۆ هەرچێ دەمارو لەش و خوێنە باشە، هەر لەبەر ئەمەیە کە ئەدرێ بە ماڵاتیش و ئەکرێتە ناو زۆرتر لە خواردەمەنییەکانیشەوە...



## ئاهەك

ئاهەك کە «قسڵی»یشی پێ ئەڵێن ئەمیش هەر لە ڕیزی بەردە کانییەکانە، جسمێکی سپی و ڕتووبەت ئەکێشێ، لە بناغەدا خۆی بەردێکی تایبەتییە بەهۆی سووتان لە کوورەخانەدا دروست ئەکرێ، کە دروست کرا کلۆکلۆیەکە ئاوکرا بەسەریا لەبەر یەك هەڵئەوەشێتەوەو دووکەڵ و تەمێکی گەرمی لێ هەڵئەستێ و لەوانەیە دەستی بەرکەوێ ئەیسووتێنێ، ئاهەك لە سابوونکردن و دەباغی و شەکرسازیدا بەکار ئەهێنرێ، بە تایبەتی دەباغی کردن بە ئاهەك نەبێ پێك نایە.

ئەگەر شوێنێك لە لەشدا خوێنی هەر نەئەوەستایەوە ئاهەکی بخەنە سەر ئەیوەستێنێتەوە... هەروەها ئەگەر شوێنێك بە ئاگر سووتابوو ئاهەکی پیا بهێنن ژانی کەم و چاکی ئەکاتەوە.. ئاهەك لە حەماما بە کاری ئەهێنن بۆ لابردنی موو ئەمە لێرەدا کار ئەکاتە سەر ژێری پێستەکە پێویستە پاش لێ دانەکەی بۆ ئەوە ئەو کارە نەکات بەڕۆنی وەنەوشەو گوڵاوی ساغ شوێنەکەی بهەنوون... ئاهەك ئەگەر پژێنرا بە شوێنێکا کێچ توخن ئەو شوێنە ناکەوێ.



## یاقووت

یاقووت یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان کە لە کانەکانا دەست ئەکەوێ، بەردێکی سەختی وشکی بەڕیزی بریسکەدارە، لە ڕەنگا سووروو سەوزو زەردو شین و سپی هەیە، ئەوەی کە سووری بریسکەدارە لەپاش ئەڵماس لە هەموو بەردە بە نرخەکان بەنرخترە. هەتا گەورەتر بێ باشترە تا ئەگاتە ئەندازەی دەنکی هەنار لە ڕەنگ و گەورەییدا. یاقووت لە بناغەدا ئاوێکی سافی ڕوونە کە لە کانەکەی خۆیا لە بەینی بەردە ڕەقەکانا ماوەیەکی زۆر زۆر ئەمێنێتەوە، وردە وردە خەست ئەبێتەوەو ڕەق

ئەبێ، گەرمایی کانەکە لەو ماوە دوورو درێژەدا پوختەی ئەکاو پێی ئەگەیەنێ تا وا ڕەق ئەبێ ئاگر کاری تێ ناکا، بۆیەش کاری تێ ناکا چونکە مادەی ڕۆناوی تیا زۆر کەمە، وردیش نابێ چونکە مادەی ڕتووبەتەکەی زیادە، بەڵکوو هەتا بمێنێتەوە ڕەنگی جوانتر ئەبێ، ئەوەندە ڕەقە بڕبەن کاری تێ ناکا، کانەکەی زۆرتر لەژێر خەتی ئیستوادایە.

ئەگەر یەکێ تۆزێ یاقووتی پێ بێ جا لە نقیمی ئەنگوسیلەدا بێ یان نەء، بەو مەرجە یاقووتەکە لە یاقووتە چاکەکان بێ، واتە یا سوور، یا زەرد، یا سەوز بێ ئەو کەسە تاعوون کاری تێ ناکا با لە شوێنێکیشا بێ هەموو تووشی تاعوون بووبوون، هەروەها هەڵگری یاقووت مەردم بە چاوی ڕێزو گەورەییەوە سەیری ئەکەن و کاروباری ژیان و گوزەرانیشی بە باشی بۆ دێتە پێشەوە. یاقووت ئەگەر بخرێتە ناو ئاو ئەو ئاوە نایبەستێ، یاقووتی سوور ئاگر کاری تێ ناکا، لە پاش ئەو زەرد، لە پاش زەرد، سەوز، ئیتر ئەوانیتر هیچ نین و لە ڕیزی بەردە بەنرخەکان نین.

## زومورەد



زومورەد یەکێکە لە بەردە بەنرخەکان کە لە کان وەرئەگیرێ، ڕەنگێکی سەوزی قەرسیلی جوانی هەیە، زەبەرجەدیش کە هەر لە بەردە بەنرخەکانە لە ترۆمی زومورەدە ئەوەندە هەیە ڕەنگەکەی ئەم سەوزی مەیلەو زەردە ئەو کانەی کە زومورەدی تێدایە زەبەرجەدیش هەر لەوێ دایە. لە هەندێ لە ئەشکەوتە قووڵەکانا جۆرە بەردی سەختی وا ئەبێتـ▒ـە ناوەکەی ڕابووردوی مێژوو و تەبیعەت چاڵی کردووەو دەرگاکەی هاتۆتەوە یەك کونێکی تێدایە، ئەمانە کەوتوونەتە ژێر زەوییەوە، لەو ژێرەوە ماوەیەکی بۆشایی هەیە کە ئەشکەوتەکەیە.

ڕتووبەتی زەوی و باران ئەچێتە ئەو شوێنە، گەرمایی کانەکەو گەرمایی هەتاو بە درێژایی زەمان ئەو ڕتووبەتە ئەکاتەوە بە تنۆکی ئاو، ئەو تنۆکانە کە ئەتکێن ئەگەر ڕێ کەوت و کەوتنە ناو بەردە چاڵەکەوە، لەوێدا درێژایی زەمان و فشاری بەردەکە و هەڵمی

شوێنەکە ئەو تنۆکانە خەست ئەکاتەوەو ئەبن بە یەك پارچەو لە ئەنجاما سەخت ئەبن، ئەگەر مادەی خاك و شوێنەکە زیاتر کاری کردە سەر دروستبوون و یەکگرتنی ئاوەکەو مادەکەش لەو شوێنەدا پلەی سەوزی زۆرتر بوو ئەبێ بە زومورەد، ئەگەر وانەبوو ئەبێ بە زەبەرجەد، هەندێك لایان وایە لە زانایانی زەوی ناسی پاش ئەوە کە ئەو مادانە یەکیان گرت و پێ گەیشتن ئەگەر دەستی ئینسانی گەیشتێ و دۆزیەوە، ئەوە زەبەرجەد ئەبێ ئەگەر ماوەکەی زۆر بوو زۆر مابووەوە و پاشان ئینسان دۆزیەوە ئەوە زومورەدە، کەوا بوو ئەو مادەیە هەتا لەو شوێنەدا زۆرتر بمێنێتەوە زیاتر ئەبێ بە زەمورەد، ئەگەر زۆر نەمایەوە زەبەرجەدە.

زەمورەد وەیا زەبەرجەد لەلای هەرکەس بێت ئەو کەسە دائما کەیف خۆشە... مار زۆر حەزیان لێ ئەکا، لەلای هەرکەس بێ مار ئەچێ بەلای ئەو کەسەوە بەڵام بە هیچ جۆر وەزەی لێ ناکا... کە خرانە سەر هەر زێڕو زیوو خەزنەیەك ڕزق، ئەو ڕزقە کە پارە ئەدزێ ناچێ بەلایا...



## لەعل

لەعل کە «لال»یشی پێ ئەڵێن ئەمیش لە بەردە کانییەکانە، گەلێ جۆری هەیە؛ لەعلی پیازی، لەعلی دۆشاوی، لەعلی هەناری، لەعلی عەنابی، لەعلی پەیکانی، لەعلی عەقرەبی، لەعلی قوتبی و چەند جۆرێکی تریش، ڕەنگی تێکڕای ئەمانە هەموو سوورن، چاکتریان ئەوەیە کە سوورێکی هەناری بێت، ئەم جۆرەش زیاتر هی بەدەخشانە. دەنگ وایە دۆزینەوەی لەعل بەچاو مێژووەوە کۆن نییە، واتە بەچاو ڕۆژهەڵاتەوە، لەوانەیە مێژووی دۆزینەوەی هەر تا هەشت سەد ساڵێ ئەڕوا. کانەکەشی لەناو بەرد دایە و بەردەکەش لەناو کێودایە، تەبێعەتی کێوەکە دروستی ئەکا، مادەی کبریتی و ڕتووبەتی زەوییەکە دەستێکی باڵای هەیە لە دروستبوونیا، لەناو هۆنەرانی ڕۆژهەڵاتا گەلێ جار لێوی یار ئەکەن بە لەعل. نرخی لەعل لەنرخی بەردەکانی تر کەمترە، بۆ جوانی هەڵئەگیرێ.

## سەرچاوە

بۆ دانانی ئەم کتێبە بێجگە لە تاقی کراوە دەماودەم گێڕاوەکا نی کوردی سەیری ئەم سەرچاوانەی خوارەوەش کراوە:

حیاة‌الحیوان... کمال‌الدینی دەمیری.

عجائب المخلوقات... زکریای قەزوینی.

الحیوان... ابو عثمانی جاحظ.

فەرهەنگی نەفیسی... دکتر علی اکبری نەفیسی.

عجائب البلدان... ابو المؤیدی بەلخی.

بیرو باوەڕەکانی ئەرەستوو کە لە گۆشەی کتێبەکان وەرگیراوە.

باوەڕەکانی «ئەراتستین» کە لە زانایانی فەلەکی یونانی کۆنەو لە «٢٧٦ - ١٩٦» پێش میلاددا بووە.

تاقی کراوەکانی کوردی کە خۆم کۆم کردوونەتەوە.

◈◈◈


ئادەمیزاد


ئاسك


ئەسپ


ئێستر


بەراز


بەران


بزن


بزنەکێوی


بەوری بەیان


پشیلە


پڵنگ


چەقەڵ



حوشتر



دەڵەك



ڕێوی



سنجاب



سەگ



شێر



فیل



کەر



کەرگەدەنگ



کەروێشك



کەمتیار



گا


گەوەزن


گورگ


مەیموون


ورچ


یووز


باز


پەپووسلێمانە


پەڕەسێلکە


پۆڕ


پیرۆزە


تاوس


تووتی


چەرخ


چۆلەکە


حوشتر مورغ


سەوزە کەوا


سیسارگەکەچەڵە


شەمشەمەکوێرە


قاز


قازیقوڵەنگ


قەلەباچکە


قەلەڕەش


قەتێ


قومری


کەڕە واڵە


کەڵەشێر


کۆتر


کونەبەبوو


کەو


کۆلارە


گۆرە ویلە


حاجی لەقلەق


مریشك


مێشەسی


ماسی


هەڵۆ



هەنگ



ئەژدەها



ئەسپێ



بۆق



پیرێژنەسەرە



جاڵجاڵۆکە



جەڕار



جلە=تیمساح



دووپشك



زەروو



ژیشك



قۆڕی


کرم


کوله


کێچ


کیسەڵ


قالۆچه


قرژاڵ


مار


مشك


مووشی خورما


مێرووله


مێش


مێشووله



بادام



بەڕوو



بەهێ



داری بی



پستە = فستق



پەڵك



ترنج



توو



داری تۆفانە



سوورەچنار



داری خورما



زەیتوون


داری سەرو


سنەوبەر


داری سماق


سەندرووس


داری سێو


شڵانە


شیلان


عەرعەر


فنق


گەزك چار


داری گوێز


لیمۆ


مازوو


مۆرد


مۆز


مێو


نارنج


هەرمێ


هەشتاڵوو


هەڵووژە


هەنار


هەنجیر


یاسەمین


باینجان


بامیە


پاقلە


پەتاتە


پیاز


تەرخوون


تەماتە


تووتن


توور


تەڕەتیزە


جۆ


چەوەنەر


خەشخاش


خەیار


ڕازیانە


ڕەیحان


ڕێواس


زەعفەران


سپێناخ


سڵق


سۆسن


سیاوڵە


سیر


شمڵی


شووتی



شێلم



کاخڵی



قارچ



قانگ



کاڵەك



کاهوو



کاڵەکەمارانە



کەلەرم



کوولەکە



گاڵ



گلێنە



کنگر


گوڵاڵەسوورە


گوڵگاوەزوان


لاولاو


لووبیا


لۆکە


ماش


نۆک


نەرگس


نیسک


وەنەوشە


هێرۆ


هەلیلە



مەرزەنگۆش



هەلیلیون



هیلوفەڕ



ئاڵتوون



زیو



مس



ئاسن



قەلایی



قورقوشم



بەردی سورمە



زاح



زەڕنیخ



ئاقیق



پیرۆزە



دوڕ



کارەبا



ئەڵماس



مەرجان



ئاسن‌کێش



خوێ



ئاهەك



یاقووت



زومورەد



لەعل